مەوسووعەی

بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان

وەحیی و واقیع دا

کتێبی پێنجەم

# چەند پرسێکی

# فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر

عەلی باپیر

مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا

نووسینی: عــەلی بـــــاپیر

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی یەکەم ١٤٤٠ز - ٢٠١٩ك

**نوسینگەی تەفسیر**

بـۆ بڵاوکـردنـەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا

عەلی بــاپیر (نووسەر)

٤٠٤ لاپـــەڕە

١٧* ٢٤ سـم

بابـەت : ئـاینی

تیراژ : ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٣١١ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

ISBN: 978-9933-593-83-4

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ** : نـــەوزاد کۆیـــی

**دیزاینی ناوەوە و بەرگ** : زەردەشت کاوانی

مەوسووعەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان

وەحیی و واقیع دا

- کتێبی پێنجەم -

- تەوەری پێنجەم -

# چەند پرسێکی

# فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر

نووسینی

عەلی باپیر

## پێشکەش بێ

به هەرکەسێك، کە بە شێوەیەکی شایستە عەقڵی خۆی لە بواری بیرکردنەوەدا بەکاردێنێ و، بە زەینێکی هۆشیارو دڵێکی بێدارەوە:

لە هەردووك کتێبی خوێندراوو بینراو (مَقروء و منظور)ی خوای پەروەردگارەوە ڕادەمێنێ و، سەرەنجام زانیاریی و شارەزاییەکی بەئامانج گەیەنەریان لێ وەدەست دێنێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ ..... ٤٦﴾ سـبأ.



# پێشەكیی

## پێناسەو بەسەرهاتی پەیدابوونی ئەم مەوسووعەیە

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله، وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمّد صَلّى اللّه عَليهِ وَسلَم، وَشَرّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلّ ضَلالةٍ فِي النّار.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم مەوسووعەیەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) کۆی ئەو چل و نۆ (٤٩) دەرسەیە کەبەندە لەنێوان ڕۆژانی: (٢٠١٦/١٠/٢١) تاکو (٢٠١٧/٥/٥)دا، پێشکەشی کۆمەڵێکی بژاردە لە براو خوشکانم کردوون، لەخولێکدا کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) کردبوویەوەو، سەرجەم دەرسەکانیش لە کەناڵی تایبەتی بەندە لە یوتیوب:

www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwuuTQtJAAu-) WqXQoCnKQqX2X) دانراون[1].

شایانی باسیشە کە کۆی ئەو چل و نۆ دەرسە، لەلایەن برای دڵسۆزم کاك (قاسم سەلام)ەوە هێنراونە سەرکاغەزو تایپ کراون و، پاش چاو پێداگێڕانەوەی وردی خۆم، دووبارە هەڵەچن کراونەتەوە، تاکو بەم ئاکامە گەیشتوون کە دەیبینی، بۆیە بەپێویستی دەزانم لەناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینمی عەرز بکەم و، لەخوای بەخشەریش داواکارم بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

هەڵبەتە لەمێژیشە گەیشتوومەتە ئەوقەناعەت و بڕوایە، کە کێشەی گەورەی مسوڵمانان و هۆکاری بنەڕەتیی دواکەوتوویی و پەرێشانییان لەم ڕۆژگارەدا، بریتیە لە کەمتەرخەمیی و کرچ و کاڵیی و پاشان بەجێماوییان لەبواری هزرو بیرکردنەوەداو، سەرەنجام بەهەڵە تێگەیشتن، بگرە زۆر جار سەرەوبن تێگەیشتنیان، لەزۆر بابەت و مەسەلەی دین و ژین!

بۆیەش بەپێویستم زانی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەوبارەوە بکەم، کە سەرەنجام ئەو بابەتەی لێ هاتەدی، کە هیوام وایە کەلێنێکی باش لەوبوارەدا بگرێ و، هۆکاری بەرچاو ڕوونبوونەوەیەکی باشی مسوڵمانان بێ لەوبارەوە.

---

(١) ناوونیشانی ئەوبابەتەی داوام لێکرابوو ئامادەی بکەم، بریتی بوو لە: (هزری ئیسلامیی) بەڵام بەو شێوەیەم گۆڕی، کە کراوەتە ناوونیشانی ئەم مەوسووعەیە، دواتریش حیکمەت و هۆکارەکەی دەخەینە ڕوو...

ئنجا بەمەبەستی ئاسانتر بەهرە لێوەرگیرانی ئەم مەوسووعەیە، هەرچەندە هەرپێنج تەوەرەکەی پێکەوە پەیوەستن، بەڵام بەباشم زانی هەمووی بەپێنج کتێب چاپ و بڵاوبکەینەوە، هەرتەوەرەی لەکتێبێکی سەربەخۆدا.

لەخوای بە بەزەیی و بەخشندەش داواکارم پیت و پیزێکی شایستە بخاتە ئەم مەوسووعەیەوە، بەهەر پێنج کتێب و تەوەرەکەیەوەو، ئەوئامانجەی بۆی لەبەرچاو گیراوە، بەباشترین بیهێنێتەدی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

١٠/ی ڕەجەب/١٤٣٩ك

٢٠١٨/٣/٢٧ز

هەولێر

## ڕێخۆشکردن و نەخشەی گشتیی

پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگارو واقیعێکدا، کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و بەزیندوویێتیی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان، لە تێوەڕامانی وەحیی و چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەبینین.

ئەم بارودۆخەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، بەرهەمی ئەوەیە کە مسوڵمانان - بە شێوەیەکی گشتی- باش نەیانتوانیوە عەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنە کار، لە تێوەڕامانی وەحیی و لە سەرنجدانی واقیعدا، بۆیە من وەك هەوڵ و هەنگاوێك لەم بوارەدا، بە پێویستم زانی ئەم بابەتە لە (٤٩) ئاڵقەدا پێشکەش بکەم، لەژێر ناوونیشانی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا}و، سەرجەم ئەم بابەتەش دەکەین بە پێنج تەوەرە:

**تەوەری یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە چوار بەشی سەرەکیی پێك دێ:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی و چەند وشەیەکی دیکەی نیزیکی.

**بەشی دووەم:** سەرنج دانێکی مێژوویی لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا.

**بەشی سێیەم:** سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.

**بەشی چوارەم:** گرنگیی و پێویستیی بیرکردنەوە (تفكّر) لە ئیسلامدا.

**تەوەری دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان.**

ئەم تەوەرەش لە سێ بەشی سەرەکیی و (٥١) کورتە باس پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** تایبەتمەندییە گشتییەکان، (٢٠) تایبەتمەندیی.

**بەشی دووەم:** تایبەتمەندییە عەقیدەیی و فیکرییەکان، (١٧) تایبەتمەندیی.

**بەشی سێیەم:** تایبەتمەندییە ڕەوشتییەکان، (١٤) تایبەتمەندیی.

**تەوەری سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان.**

که سەرجەم بیست (٢٠) تەوژمی جۆراو جۆرمان لێ هەڵبژاردوون و، لەبیست بەشدا خستوومانەنە ڕوو:

١- خەواریج.

٢- مورجیئە.

٣- جەبرییە.

٤- قەدەرییە.

٥- جەهمییە.

٦- موعتەزیلە.

٧- شیعە.

٨- ڕافیزە.

٩- ناصیبە.

١٠- ئەهلی حەدیس.

١١- ئەشعەرییەکان.

١٢- ماتوریدییەکان.

١٣- باطینییەکان.

چواردە (١٤) گرووپیشمان لە باطینییەکان باسکردوون.

١٤- فەلسەفەو فەیلەسووفەکان.

١٥- تەصەووف و صۆفییەکان.

١٦- مەزهەبە فیقهییەکان.

١٧- وەهابییە.

١٨- سەنووسییە.

١٩- مەهدییە.

٢٠- جامیعەی ئیسلامییە.

**تەوەری چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە پێنج بەشی بنەڕەتیی پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** بوونناسیی (علم الوجود- ontologu).

**بەشی دووەم:** ئیمان و عەقیدە.

**بەشی سێیەم:** تێڕوانینەکان (التصورات).

**بەشی چوارەم:** بەهایەکان (القیم).

**بەشی پێنجەم:** پێوەرەکان (الموازین).

**تەوەری پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراو جۆر.**

ئەم تەوەرەش لە دە (١٠) بابەت پێکهاتوە، کە هەرکامیان لەبەشێکی سەربەخۆدا دەخەینەڕوو:

**بەشی یەکەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، تەواوکارییە.

**بەشی دووەم:** شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!

**بەشی سێیەم:** ڕەوایی: فرەیی فیکریی و سیاسیی و ئایینی (مشروعیة التعددیة الفکریة والسیاسیة والدینیة).

**بەشی چوارەم:** هاووڵاتێتیی نامسوڵمانان لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا: ماف و ئازادییەکانیان.

**بەشی پێنجەم:** مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستەوەبوونی نەتەوەکان.

**بەشی شەشەم:** ڕاوێژ (شوری)ی ئیسلام و دیموکراسی، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان.

**بەشی حەوتەم:** ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا.

**بەشی هەشتەم:** تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان.

**بەشی نۆیەم:** بنەما گرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان.

**بەشی دەیەم:** بنچینە سەرەکییەکانی دینداریيەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست.

## پێشەکیی ئەم تەوەرە

**خوێنەری بەڕێز!**

ئەم تەوەری پێنجەم و کۆتاییە لەبابەتی فراوانی:

(بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا) لە دە (١٠) بەش پێکهاتوە، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**بەشی یەکەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، تەواوکارییە.

**بەشی دووەم:** شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!

**بەشی سێیەم:** ڕەوایی فرەیی فیکریی و سیاسیی و ئایینیی.

**بەشی چوارەم:** هاووڵاتێتی نامسوڵمان لە کۆمەڵگای ئیسلامیی دا: ماف و ئازادییەکانیان.

**بەشی پێنجەم:** مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستبوونی نەتەوەکان.

**بەشی شەشەم:** ڕاوێژ (شوری)ی ئیسلام و دیموکڕاسی، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان.

**بەشی حەوتەم:** ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا.

**بەشی هەشتەم:** تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان.

**بەشی نۆیەم:** پایەگرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی، تەوژم و لایەنەئیسلامییەکان.

**بەشی دەیەم:** بنەما سەرەکییەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست.

شایانی باسکردنیشە کە هەرکام لەم دە (١٠) بابەت (موضوع)ە، کە لەم تەوەرەی پێنجەم دا دەیانتوێژینەوە، بابەتی گرنگ و هەستیارن و بەبۆچوونی بەندە: زۆرترین باس و خواس و مشت و مڕیان لەبارەوە دەکرێ، چ لەنێو بازنەی تەوژمیی ئیسلامیی دا و، چ لەبازنەی فراوانتری خەڵك و کۆمەڵگادا و، هەوڵیشمان داوە: هەڵوێستێکی شەرعییانە و ژیرانەی ڕاست و ڕەسەن و هاوسەنگیان، لەبارەوە بخەینە ڕوو، دوور لە کورتهێنان و زێدڕۆیی (تفریط وإفراط).

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە زۆرێك لەو دە (١٠) بابەتەی لەم تەوەرەی پێنجەم دا دەیانتوێژینەوە، لەتەوەرەکانی دیکەدا، کەم و زۆر قسەوباسیان لەبارەوە کراوە، بەڵام لەم تەوەرەدا، هەوڵمان داوە وردتر و ڕوونتر، لەبارەیانەوە بدوێین و تیشکی زیاتریان بخەینەسەر.

٣ جمادي الأول / ١٤٤٠ك / ٢٠١٩/١/٩ز

# بەشی
# یەکەم

## پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ
## پەیوەندییەکی تەواوکارییە

## (العِلاقة بَين الوَحي وَالعَقل، عِلاقة تَكامُلية)

## بەرایی

خوێنەری خۆشەویست!

ئەم بەشی یەكەمەی تەوەری پێنجەم، كە لەبارەی پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، یان شەرع حیكمەتەوەیە، لەشەش باس پێكهاتوە، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**باسی یەكەم:** پێناسەی وەحیی و عەقڵ.

**باسی دووەم:** عەقڵ و نەقڵ دژی یەكدی نین، بەڵكو تەواوكاری یەكدین.

**باسی سێیەم:** عەقڵ و نەقڵ( وەحیی ) پێویستییان بەیەكە.

**باسی چوارەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ چۆنە؟

**باسی پێنجەم:** عەقڵ سەرەنجام دەچێتەوە نێو بازنەی وەحیی.

**باسی شەشەم:** لەكاتی تێكگیرانی وەحیی و عەقڵ دا، دەبێ چی بكرێ؟

هەڵبەتە هەوڵیشمان داوە بەشێوەیەكی ڕیزبەندیی پلە پلەیی (ترتیب متدرج) ئەم شەش باسە ڕیزبكەین، هەرچەندە لەنێوان هەندێك لەبیرۆكەكانی (أفكار)ی نێوباسەكاندا، جۆرێك لە لێكچوون و دووبارەكردنەوەش بەدی دەكرێ، كە سروشتی باسەكان خواستوویەتی.

# باسی یەکەم

## پێناسەی وەحیی و عەقڵ

هەڵبەتە ئێمە پێشتریش پێناسەمان کردوون، بەڵام لێرەش پێناسەیەکیان دەکەینەوە:

### یەکەم: وەحیی:

**١- وەحیی لەڕووی زمانەوە (الوحي لغة):**

{الوحي لغةً الإعلام في خفاءٍ، ويُطْلَقُ لفظ (الوحي) على اسم المفعول منه، أي المُوحى مكتوباً، كان هذا الوحي، أو كلاماً}[1]، واتە: وشەی (وحي) لە ڕووی زمانەوانییەوە بە مانای: ئاگادار کردنەوەیەکی پەنهانەو، وشەی (وحي) بە مانای (اسم المفعول)

---

(١) دەتوانم بڵێم: هەموو فەرهەنگەکانی زمان و زاراوەکان، وا دەڵێن، بەڵام من ئاماژە دەکەم بە هەردووك سەرچاوەی:

أ- (الموسوعة الميسرة في فكر الفلسفي والإجتماعي) (د.كميل الحاج) ص (٦٦٧).

ب- فەرهەنگی: (إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات) (د.محمد عمارة) ص (٦٩١ ٦٩٣).

یش بەکاردێت، (أي الموحى)، واتە: ئەوەی کە سروش کراوە و نێردراوە، چ بە نووسراو بێت، چ بە زارەکیی بێت.

٢- وەحیی لەڕووی زاراوەییەوە:

{الوحي اصطلاحاً: كلام الله المنزّل على نبيّ من أنبيائه}[1]، واتە: لە ڕووی زاراوەییەوە وەحیی بریتیە لە: فەرمایشتی دابەزێندراوی خوا بۆ سەر یەکێك لە پێغەمبەران (عليهم الصلاه والسلام).

براو خوشکانی بەڕێز!

لە قورئاندا وشەی (وحي) بە حەوت مانا هاتوە، ئەوەندەی کە بۆم دەرکەوتوە:

١- غەریزە: ئەو غەریزیەی کە خوا داینـاوە لەئاژەڵاندا، لە زیندەوەراندا، لە پەلەوەراندا، وشەی (وحي) بۆ بەکارهاتوە، وەك لەسووڕەتی (النحل) ئایەتی (٦٨)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

واتە: پەروەردگارت وەحیی کرد بۆ هەنگ.. {وەحیی بۆ کرد، یانی: ئەو غەریزەیەی پێدا و، ئەو ئیلهامە فیترییەی پێدا و، لەسەر ئەوە خوڵقاندی}.

٢- خورپەو خستنە نێو دڵ (إلهام): وەك خوای کاربەجێ لەسووڕەتی (القصص) ئایەتی (٧)دا دەفەرموێ:

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾.

واتە: وەحییمان کرد بۆ دایکی مووسا کە شیری پێ بدا، واتە: ئیلهاممان بۆکرد، هەڵبەتە هەندێك لەزایانیش دەڵێن: دوو ئافرەت وەحییان بۆ چووە: دایکی مووساو دایکی عیسا (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.

کە: (وحي) بەمانای ئیلهامیان بۆ چووە، بەڵام وەحیی کە بۆ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) هاتوە، تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە، ئەوە ڕای ڕاستە.

٣- ئاماژە، هێما (الإشارة): وەك لە سووڕەتی (مریم) ئایەتی (١١)دا، دەربارەی زەکرییا سەلامی خوای لێبێ دەفەرموێ:

﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾

واتە: لە میحرابەوە چووە دەر بەرەو خەڵکەکەی {(فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ ) أي: (فأشار اليهم)} ئاماژەی بۆ کردن، (بە دەست ئاماژەی بۆ کردوون) کە بەیانیان و ئێواران خوا بە پاك بگرن، هەروەها ئاماژەشی بۆ کردوون کە من قسە ناکەم.

ماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژان زەکەرییا سەلامی خوای لێبێ، قسەی بۆ نەکراوە، خوای پەروەردگار دەمی بەستوە، وەك بەڵگەیەك لەسەر ئەوە کە خێزانەکەی دوو گیان (حامل) دەبێ بە (یحیی)، چونکە گوتوویەتی: خوایە! نیشانەیەکم پێ بڵێ، فەرموویەتی: ئەوە نیشانەکەت:

﴿ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴾.

٤- ئەو یاسا گەردوونییانەی کە خوا دایناون: وەك لە سووڕەتی (فصلت) ئایەتی (١٢)دا دەفەرموێ:

﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ﴾

واتە: (خوا) هەر حەوت ئاسمانەکانی لەدوو ڕۆژاندا هێناونەدی و، سیستماتیکی کردوون و یاسای تێدا داناون.

ئەو یاسایانەی کە داینانون لەو ئاسمانانەدا، بۆ بەڕێوەچوونیان خوای پەروەدگار وشەی (وحي) بۆ بەکارهێناوە.

٥- ئاڕاستەکردن و ڕێنمایی کردنی فریشتەکان: وەك لە سووڕەتی (الأنفال) ئایەتی (١٢)دا دەفەرموێ:

﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ﴾.

واتە: یادبکەوە کاتێك پەروەردگارت سروشی کرد بۆ فریشتەکانی کە من لەگەڵتانم.

٦- خوتخوتەی شەیتانەکان و دنەدان و هاندانیان: وەك لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٢١)دا دەفەرمویٚ:

﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ﴾

واتە: شەیتانەکان وەحیی دەکەن بۆ دۆستەکانی خۆیان، تاکو شەڕە قسەتان لەگەڵدا بکەن.

وەحییان بۆ دەکەن واتە: خوتخوتەو وەسوەسەیان بۆ دەکەن.

٧- ئەو پەیام تایبەتیی ناردنەی خوا بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام): کە ئەو مانایە زیاتر مانایەکی باوە، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ النساء.

واتە: ئێمە سروشمان بۆ تۆ کرد، وەك چۆن سروشمان بۆ (نووح)و پێغەمبەرانی دوای ئەویش کرد.

## دووەم: عەقڵ (العقل):

### ١- لە ڕووی زمانەوە:

(الجرجاني) دەڵێ: {العَقْلُ مأخوذ من عِقال البعير، يمنع ذوي العقول من العدول عن سواء السبيل}[1]، واتە: وشەی (عَقْل) لە (عِقال)ەوە هاتوە، (عِقال) ئەو پەتەیە کە حوشتریان پێ بەستۆتەوە بۆ ئەوەی نەجووڵێ، (عقل)یش ئەوانەی کە خاوەن هۆشن، دەگێڕێتەوە لەوەی کە لە ڕاستەڕێ لابدەن، بۆیە ناوی لێنراوە (عقل).

---

(١) التعريفات ص ١٥٢.

٢- لە ڕووی زاراوەییەوە:

(الجرجاني)[١] کۆمەڵێك پێناسەی هێناون:

أ- {العقل: نورٌ في القلب يَعرف الحق والباطل} واتە: عەقڵ ڕووناکییەکە لەدڵدا، کە حەق و ناحەق لێك جیا دەکاتەوەو دەناسێ.

ب- {العقل: ما يُعْقَلُ به حقائِقُ الأشياء، قيل: مَحلُّه الرأس، وقيل مَحَلُّه القلب}، واتە: عەقڵ ئەوەیە نهێنیی شتەکانی پێ دەزانرێ، هەندێکیان گوتوویانە: شوێنەکەی سەرەو، هەندێکیش گوتوویانە: شوێنەکەی دڵە.

کە بە تەئکید شوێنەکەی (سەر)ە، بەڵام ڕەنگە جۆرێك لە پەیوەندیشی لەگەڵ دڵدا هەبێت، زانستی تازەش لەو بارەوە قسەو باسی زۆرە، بەڵام ئەوە کە گوتوویەتی: {ما يُعْقَلُ به حقائق الأشياء} ئەوە زێدەڕۆییە، لەڕاستییدا عەقڵ ناتوانێ نهێنیی شتەکان و چییەتیان بزانێ، بەس دەتوانێ ڕواڵەتیان بزانێ.

ج- {العقل: الصحيحُ: إنّه جَوهَرٌ مُجَرّد يُدرِك الغائبات بالوسائط والمحسوسات بالشهادة} واتە: مانای ڕاست بۆ پێناسەی عەقڵ ئەوەیە: کە جەوهەرێکی ڕووتە (مەبەستی ئەوەیە کە شتێکی ڕووحانییە، شتێکی مەعنەوییە) کە نادیارەکان بەهۆی هۆکارەکانەوە دەزانێ و، بەرهەستەکانیش بە بینین و بەهۆی هەستەوەرەکانەوە دەزانێ.

د- یەکی دیکە لە شارەزایان دەڵێ: {العقل هو ملكة الفهم والإستدلال الصحيح، والإستنتاج وإدراك العلاقات الذهنية}[٢] واتە: عەقڵ بریتیە لە حاڵەتی تێگەیشتن و، بەڵگە هێنانەوەی ڕاست و دروست و، هەڵهێنجانی ڕاست و دروست و، دەرککردنی پەیوەندییە فیکرییەکان لەنێوان شتەکاندا.

---

(١) هەمان سەرچاوە ص ١٥٢.

(٢) الموسوعة الميسرة، ص ٣٥٤.

هـ - یەکێکی دیکەش ئاوا پێناسەی عەقڵ دەکات، دەڵێ: {العقل: هو القوّة الّتي يُدرِكُ الإنسانُ بها الأشياءَ، ويطّلِعُ بها على بعض أسرار الخلق، ويَفْهَمُ بها الوحي، ولها ارتباط خاصٌّ بالدِّماغ، والعقل هو جانب الإدراك في الروح}[١]، واتە: عەقڵ بریتیە لەو هێزەی کە مرۆڤ شتەکانی پێ دەزانێ، تارادەیەك نهێنییەکانی دروستکراوەکانی پێ دەردەخا و، پێی لە وەحیی دەگات و، پەیوەندییەکی تایبەتیی بە مێشکەوە هەیە و، عەقڵ بریتیە لەلایەنی دەرککردن و پەیپێبردن لە ڕووح دا.

**ئەو پێنج وشەیەی کە لە قورئان دا بۆ عەقڵ بەکارهێنراون:**

لە قورئاندا جگە لە عەقڵ، پێنج (٥) وشەی دیکەش بەکارهاتوون، هەڵبەتە وشەی (عەقڵ) بەشێوەی ناو (إسم) بەکار نەهاتوە، بەڵکو هەر بە کردار (فِعل) بەکارهاتوە، (يعقلون، تعقلون، عقلوا ...) کە ئەوەش بۆخۆی نهێنییەکی تێدایە (دواتر باسی دەکەین).

**ئەو پێنج وشەیەش کە بەمانای عەقڵ بەکارهاتوون، ئەمانەن:**

١- (الفؤاد): ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

٢- (لُـــب): ﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران. (الألباب) کۆی (لُبّ)ە، (لُبّ) بەمانای کاکڵ دێت.

گوتراوە: {اللبُّ: خالِص كُلِّ شيء، واللُّباب الخالص، واللُّبُّ: العَقل، وجمعهُ ألباب، وألُبّ، واللَّبيب: العاقِلُ}[٢]، واتە: (لَبّ و لباب) یانی کاکڵی شت، شتێك کە

---

(١) ئەم پێناسەیە هی خۆمە.

(٢) مختار الصِّحاح، ص٥٠٩.

جەوهەری ئەو شتەیە، (لب)یش عەقڵە و کۆیەکەی (ألباب) و (أَلُبّ)ە، (لبیب) یانی: عاقڵ.

٣- (القـلـب): ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾﴾ ق، وەك زانایان گوتوویانە: (قلب) مەبەست پێی ئەم دڵە گۆشتینە نیە، بەڵکو ئەو هێزەیە کە ئینسان شتی پێ دەزانێ و، شتی پێ قبووڵ دەکاو ڕەفز دەکا.

٤- (الحِجر): ﴿وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾﴾ الفجر.

(الحِجر)، (حَجَرَهُ) یانی: (مَنَعَهُ) ڕێی لێگرت، لەبەر ئەوەی عەقڵ ڕێ لە ئینسان دەگرێ لە شتی خراپ، بۆیە ناوی لێ نراوە:(حِجر).

٥- (النُّهیة): ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾﴾ طه، (نُهى) کۆی (نُهیة)یە، لەبەر ئەوەی عەقڵ ئینسان قەدەغە دەکات لە هەڵەو پەڵەو شتی ناشیرین.

## بۆچی وشەی (عَـقْـل) نەهاتوە لە قورئاندا؟

وشەی (عقل) لەقورئانێ دا، تەنیا بەحاڵەتی کردار(فعل) بەکارهاتوە، بۆ وێنە:

١- ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ العنكبوت.

٢- ﴿يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾ البقرة.

٣- ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾﴾ البقرة.

حیکمەتی ئەو مەسەلەیەش ئاوایە: لەبەر ئەوەی عەقڵێك نەجووڵێ، بیر نەکاتەوە، چالاکیی نەبێ، وەك نەبوو وایە، بۆیە خوا وشەی (عەقڵ)ی لە حاڵەتی فیعلدا بەکارهێناوە، چ بە فیعلی ڕابردوو، چ بە ئێستا و داهاتوو (حال وإستقبال) بەڵێ عەقڵێك خاوەنەکەی بەکاری نەهێنێت، بوون و نەبوونی وەك یەکە، وەك کەسێك کە چەکێکی پێ بێت و بەکاری نەهێنێت، پێ بوون و پێ نەبوونی، هەر وەك یەکە.

باسی
دووەم

## عەقڵ و نەقڵ دژی یەکدی نین،
## بەڵکو تەواوکاری یەکدین

**١ـ** عەقڵ: کە بە کوردیی هۆش و زەینی بۆ بەکار دێنین و، عەقڵیش بەکاردێنین، بەڵام (هزر) بۆ (بیر)ە، واتە: (فکر) کە بەرهەمی عەقڵە

**٢ـ** وەحیی: (وحي)یش کە هەرکام لە: (نقل) و (شرع) و (بیان) یشی بۆ بەکاردێن.

ئەو دووانە نەك دژو پێچەوانەی یەکدی نین، بەڵکو تەواوکاری یەکدین و، لەگەڵ یەکدا دەست لەملانن و، پێکەوە هاوکارن و، دەستبارگری یەکدین.

پێچەوانەی عەقڵ بریتیە لە: نەزانیی(جهل)، هەروەها پێچەوانەی عەقڵ بریتیە لە گێلیی و نەفامیی (سَفَه)، پێچەوانەی (نقل)یش: بریتیە لە ئەفسانەو خەیاڵ، شتێك کە بنەڕەتێکی نەبێ و پاڵ بدرێتە لای خواو لای وەحیی.

ئەوەتان هەمیشە لە زەیندا بێ، کە عەقڵ و نەقڵ تەواوکاری یەکدین و، پێکەوە دەستلەملانن و پێکەوە تەبان و گونجاون.

خوا لە چەندان ئایەتدا مەدح و تەمجیدی عاقڵان دەکات، بۆ نموونە:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: ئەم وێنانە دێنینەوە، ئەم نموونانە دێنینەوە، تەنیا زانایان تێیان دەگەن.

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بێگومان لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی جێگۆڕکە و جیاوازیی شەوگارو ڕۆژگاردا، نیشانەگەل هەن، بۆ خاوەن عەقڵان.

ئنجا مادام (عاقڵمەندان) لە قورئاندا خوای پەروەردگار زۆر مەدحی کردوون و تەمجیدی کردوون، ناگونجێ، ئەو وەحییە لەگەڵ عەقڵێکدا تێکبگیرێ، کە بۆخۆی مەدحی دەکاو پەسەندی دەکات.

هەروەها عەقڵ کە دروستکراوی خوایە و، یەکێکە لە دروستکراوە ناوازەکانی خوا، ناگونجێ لەگەڵ زانیاریی خوادا تێك بگیرێ، چونکە وەحیی یانی: زانیاریی خوا، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾

الفرقان.

واتە: بڵێ کەسێك قورئانی دابەزاندوە، کە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بێگومان ئەو لێبوردەی بەبەزەیی یە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾ النساء

واتە: خوا قورئانی بەزانیاریی خۆی دابەزاندوە و، فریشتەکانیش شایەدیی دەدەن، خواش بەسە بۆ شایەدیی.

بەڵێ، وەحیی یانی: زانیاریی خوا، ئنجا زانیاریی خوا لەگەڵ دروستکراوی خوادا، بە تەئکید ناگونجێ دژ بن، بەڵکو پێکەوە تەباو گونجاون.

باسی
سێیەم

## عەقڵ و نەقڵ (وەحیی) پێویستییان بە یەکە

عەقڵ و وەحیی هەر کامێکیان پێویستیی بەوی دیکە هەیە، ئنجا با تەماشا بکەین:

بەدرێژایی مێژووی ئیسلام (وەك پێشتریش باسمان کرد) تێپەڕاندن و کورتهێنان هەبووە لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ وەحیی و عەقڵدا، کەسانێك پێیان وابووە: دەبێ دەستگرتوو بین بە نەقڵەوە لەسەر حیسابی عەقڵ و، پێیان وابووە ئەگەر باسی عەقڵ و عەقڵانییەت بکرێ، ئەوە پێچەوانەی ڕێز گرتنە لە دەقەکانی شەرع!

بەولاشدا: هەندێکیان پێیان وابووە، کە ئەگەر بێت و باسی دەقەکانی شەریعەت(وەحیی و نەقڵ ) بکرێ، ئەوە نادیدە گرتنی عەقڵە، ئەوانی پێشوو، وەك هەندێك لە (أهل الحديث و الأثر)، ئەوانی دیکەش وەك موعتەزیلە.

بەڵام زۆرینە جەماوەری مسوڵمانان هەمیشە عەقڵ و نەقڵ، یاخود عەقڵ و وەحییان، وەك دوو تای تەرازوویەك ڕاگرتوون و، هەر کامێکیانیان لە بواری خۆیدا بەکار هێناوە.

ئێستاش با لە دوو بڕگەدا باسی پێویستی هەرکام لە وەحیی و عەقڵ بکەین بەوی دیکەیان:

## بڕگەی یەکەم: وەحیی چ پێویستییەکی بە عەقڵ هەیە؟

وەحیی دوو پێویستیی سەرەکیی بەعەقڵ هەن:

١- {العَقْلُ مناطُ التكليف والخطاب الشرعي، فهو لِلْوحي بِمثابَةِ الأساس للجدار}[١]، واتە: ئەرکی شەرعیی و، دواندنی شەرعیی، هەڵدەواسرێ بە عەقڵەوە ( یانی: ئەگەر عەقڵ نەبێ، ئەرکی شەرعیی ڕوو لە مرۆڤ ناکات) بۆیە عەقڵ بۆ وەحیی، وەك بناغە وایە بۆ دیوار.

هەر کەسێك عەقڵی هەبێ، وەحیی دەیدوێنێ، شەرع دەیدوێنێ و ئەرکی پێ دەسپێرێ، بەڵام ئەگەر عەقڵی نەبێ، بە شایستەی ئەوەی نازانێ بیدوێنێ و گلەییشی لێ ناکات، وەك: شێت و منداڵ و، ئەو هەموو دروستکراوانەی دیکە کە خوا دروستیکردوون، بەڵام خاوەنی عەقڵ و شعوور نین، خواش سبحانە و تعالی ئەرکی پێ نەسپاردوون، بەڵکو پابەندی کردوون بە هەندێ یاساوە، کە بۆی داناون و ناشتوانن لێیان لابدەن، ئەو هەموو دروستکراوانە، لەگەردیلەوە تاکو کەهکەشان، هیچیان لەو قانوونانەی خوا بۆی داناون، لانادەن.

خوا سبحانە و تعالی لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ الَّذِينَ آمَنُوا قَدْ أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا .......... ﴿١١﴾ ﴾ الطلاق.

واتە: پارێز لە خوا بکەن، ئەی ئەو خاوەن عەقڵانەی کە ئیمانتان هێناوە! بێگومان خوا یادخەرەوەیەکی بۆ ئێوە ناردوە، کە بریتیە لە پێغەمبەرێك (صلی الله علیه وسلم).

کەواتە: کێ دەگونجێ پارێز لە خوا بکات؟ خاوەن عەقڵان، ئەوەی عەقڵی نەبێ خیتابی شەرع ڕووی تێ ناکات و، بە شایستەی ئەوەی نازانێ بیدوێنێ.

---

(١) أناط يُنيطُ به: عَلَّقَ: پێی هەڵواسی، (مناط) پێ هەڵواسراوە.

٢- پێویستیی دووەمی وەحیی بە عەقڵ: {الوحي بحاجة إلى العقل لتنزيله على الواقع المعيّن، لأن الوَحي مُطْلق}. واتە: وەحیی جارێکی دیکە پێویستیی بە عەقڵ هەیە، تاکو ئەو وەحییە دابەزێنێ بۆ سەر ژینگەو هەل و مەرجێکی دیارییکراو.

چونکە وەحیی بە ڕەهایی هاتوە و خوا بەگشتی فەرمانی کردوە، ئنجائەو فەرمانە ڕەهاو گشتییەی خوا، ئێمە چۆن چۆنی دەبێ لە واقیعێکی دیارییکراودا، جێبەجێی بکەین؟! ئەوە کاری عەقڵە.

بۆ وێنە: خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ: ﴿...أَنْ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِ ...﴾ ﴿١٣﴾ الشورى.

واتە: ئایین بەرپا بکەن و، تێیدا پەرتەوازە مەبن! ئایا ئێمە ئەو فەرمانەی خوا، چۆن جێ بەجێ بکەین؟ یان فەرمانی: (أقيموا الصلاة) چۆن جێ بەجێ بکەین؟ بە عەقڵ، دەبێ عەقڵ بزانێ کە کاتی نوێژێ بێ، شوێنت خاوێن بێ، بەرگت خاوێن بێ، دەستنوێژت هەبێ، ڕوو بە قیبلە بی...هتد، دەبێ عەقڵ ئەو شتانە بزانێ، هەڵبەتە وەحیی فەرمووني، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە پراکتیزە کردنیان، پەکی لەسەر عەقڵ کەوتوە.

## بڕگەی دووەم: پێویستیی عەقڵ بەوەحیی:

با بزانین عەقڵ چ جۆرە پێویستییەکی بە وەحیی هەیە؟ ئەویش دوو جۆرە پێویستیی پێ هەن:

١- {العقل بحاجة إلى الوحي لإطْلاعِهِ على الحقائق التي يجهلها، ولا يمكنه التوصُّل إليها بوحده}واتە: عەقڵ پێویستیی بەوەحیی هەیە، بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە لەو ڕاستییانەی کە نایانزانێ و، ناشتوانێ بە تەنیا پەییان پێ بەرێ.

ئێمە چووزانین خوا چەند ناوی هەن؟!

چۆن دەزانین: خوا دەبێ چۆن بپەرسترێ؟!

چۆن دەزانین ئەو شتە حەرام و قەدەغەیە و نابێ، توخنی بکەوین؟!

هەروەها چۆن دەزانین کە ئەوە واجبەو دەبێ جێ بەجێی بکەین؟!

بۆ ئەوە دەبێ وەحیی هاوکاری عەقڵ بێ و دەستی بگرێ و بڵێ: وەرە هەم لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، هەم لە ڕووی شەریعەتەوە، ئاوا بکەو ئاوا مەکە، ئەوە هەیەو ئەوە نیە! ئەوە پێویستیی یەکەمی عەقڵ، بە وەحیی.

٢- {العقل بحاجة إلى الوحي ليهديه ويُرْشِدَهُ في مجال التطبيق العملي، التفاصيل والجزئيات في جوانب: العقيدة، والعبادة، والأخلاق، والمعالم الرئيسة في مجال المعاملات}[١]، واتە: عەقڵ پێویستیی بەوەحیی هەیە (جارێکی دیکە) کە ڕێنمایی بکا، ڕێی پیشان بدات و دەستی بگرێت، لە بواری جێ بەجێ کردنی کردەییدا، بەنسبەت عەقیدەو، عیبادەت و، ئەخلاق، وردەکارییەکانیان (وەحیی نوختەی خستۆتە سەر پیت، لەبواری ئیمان و عەقیدەدا و، عیبادەت و، ڕەوشت و ئاکاردا)، بەڵام لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، وەحیی هێڵە گشتییەکانی داناون.

بۆ وێنە: حوکم و ئیدارە دەبێ بە شوورا بێ، شەریعەت دەبێ جێ بەجێ بکرێت، ئەوە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە، ئەوە چاکە و ئەوە خراپە، شتە بنەڕەتییەکانی دیاریی کردووون.

کەواتە: دەتوانین کورتی بکەینەوە و بڵێین: {العَقل بحاجة إلى الهداية والهادي} عەقڵ هەم پێویستیی بە ڕێنمایی هەیە، هەم بە ڕێنماییکار، هەڵبەتە هیدایەتەکە قورئانەو، ڕێنماییکارەکەش پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم).

أ- خوا دەربارەی قورئان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ .. ﴿٩﴾ ﴾ الإسراء:٩، واتە: بەدڵنیایی ئەم قورئانە بەرەو حاڵەتێکی باشتر و ڕاستتر ڕێنمایی (خەڵك) دەکات.

---

(١) تەعبیرەکان دارِشتنی خۆمن.

بەڵێ قورئان باشترین هیدایەتە.

ب- خوا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى.

واتە: تۆ بەدڵنیایی تۆ بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنمایی خەڵك دەکەی.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِي ٱلْعُمْيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ﴿٨١﴾ ﴾ النمل.

واتە: بێگومان تۆ ڕێنماییکاری کوێران نی، کە لەگومڕایی دەربازیان بکەی.

کەواتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (هادي)یە و بەو هیدایەتە دەستی خەڵك دەگرێ و ڕێیان نیشان دەدا.

لەکۆتایی ئەم بڕگەی سێیەمەش دا دەڵێین:

بەسەرنجدانی سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا (محمد) (صلى الله عليه وسلم)ڕۆڵ و مامەڵەی لەگەڵ وەحیی دا، بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەرکەکەی دووکاری سەرەکیی بوون:

١- وەرگرتنی وەحیی و بەرنامەی خوا.

٢- جێبەجێکردنی ئەوپەیام و شەریعەتە لەسەر ئەرزی واقع.

بەکورتیی:

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم): هەم وەرگر(مُتلَقِّي)ی وەحیی و هەم جێبەجێکار (مُنفِّذ)ی بووە.

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: ڕووحی ئەمیندار دایبەزاندۆتە سەردڵی تۆ، تاکو لە وریاکەرەوان بی.

ئەو وەحییە دەبوو کەسێك پێشوازیی بکات و وەری بگرێ، ئنجا تەنیا ئەو دڵە گەورەی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) توانای ئەوەی هەبوو ئەو وەحییە، ئەو قورئانە، ئەو ئایەتانە وەربگرێ.

هەروەها بەس ئەویش توانیویەتی کە ئەو وەحییە، بەو شێوەیەی کە خوا دەیەوێ، جێ بەجێ بکات، ﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ﴿٢﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: شوێن ئەوە بکەوە کە لەپەروەردگارتەوە بۆت سروش دەکرێ.

## باسی چوارەم

## وەحیی و عەقڵ، پەیوەندییان پێکەوە چۆنە؟

ئەم باسەش تیشکێکی زیاتر دەخاتە سەر باسی پێشوو، لەهەندێك ڕووی دیکەوە:

١- (أبوحامد الغزالي) گوتوویەتی: {العقل قائدٌ، والدين مُسَدِّدٌ، ولو لم يكن العقلُ، لم يكن الدينُ باقياً، ولو لم يكن الدينُ، لأصبح العقلُ حائِراً، واجتماعهما نورٌ على نور، العقل كالبَصَرِ، والشرعُ كالشُّعاع...}[١].

واتە: عەقڵ فەرماندەیە و، دین ئاڕاستەکەرو ڕێنماییکارە، ئەگەر عەقڵ نەبووایە، دین نەدەما، [چونکە دین دەبێ عاقڵان هەڵی بگرن و تێی بگەن و کاری پێ بکەن]، ئەگەر دینیش نەبووایە، عەقڵ. سەرسام دەبوو. {وەك عەقڵی فەیلەسووفەکانی یۆنان و هیندو چین و میصرو میزۆپۆتامیاو...هتد، کە سەرسام بوون و تووشی ئەفسانە پەرستیی بوون}، بەڵام کۆبوونەوەی عەقڵ و دین، عەقڵ و وەحیی (نورٌ على نور) ڕۆشنایی لەسەر ڕۆشناییە، عەقڵ وەك چاوە و شەرعیش وەك ڕووناکییە، {چاو با هەر ساغ بێ، ئەگەر ڕووناکیی

---

(١) معارج القدس في مدارج النفس، ص ٥٧.

نەبێ، هیچ نابینێ، ڕووناکییش با هەر هەبێ، ئەگەر چاوێك نەبێ، ببینێ، سوودی نابێ}.

٢- دیسان (أبوحامد الغزالي)، کە هەندێك لە زانایان لە ڕیزی فەیلەسووفەکانی دادەنێن (وەك پێشتریش باسمان کرد)، دەڵێ: {العقل كاشف عن مقصود الشارع في العبادات والعاديات...، فالعقل تابع والشرع متبوع في إثبات الحكم الشرعي}[١]، واتە: عەقڵ دەرخەری مەبەستی شەرعدانەرە، هەم لە عیبادەتەکاندا و، هەم لە هەڵسوکەوتەکاندا، بۆیە عەقڵ شوێنکەوتوویەو، شەرع پەیڕەویی لێ کراوە، {یانی: دەبێ عەقڵ بەدوای شەرع بکەوێ}.

٣- یەکێك لە زانایانی هاوچەرخ بەناوی: (أحمد ذيب) دەڵێ: {الوحي أكبر من العقل وأشمل، وهو الأصل الذي يرجع إليه العقل، والميزان الذي يختبر الآخر عند مقرَّراته، ومفهوماته، وتصوّراته...، والعقل المبرَّء من النقص والهوى، لا يوجد له في دنيا الواقع، وإنما هو مثال}[٢].

بەڕاستیی عیبارەتەکەیم زۆر پێ جوانە، دەڵێ: وەحیی لە عەقڵ گەورەترە و، گشتگیرتریشە، وەحیی ئەو بنچینەو سەرچاوەیە کە دەبێ عەقڵ بۆی بگەڕێتەوە و، ئەو تەرازوویە کە دەبێ عەقڵ بیرو ڕایەکانی خۆی پێ هەڵسەنگێنێ، هەروەها بۆچوونەکانی خۆی و وێنا کردنەکانی خۆی، پێ هەڵسەنگێنێ، ئنجا عەقڵێك کە دوور بێ لە ناتەواویی و، دوور بێ لە کەوتنە ژێر کاریگەریی ئارەزوو، لە دنیای واقیعدا بوونی نیە، بەڵکو هەرشتێکی ئایدیایی یە.

بۆ زانیارییتان! عەقڵی ڕووت (العقل المجرد) بوونی نیە، ئایا عەقڵ هەیە بۆخۆی بە تەنیا؟ نا، بەڵکو عاقڵ هەیە، ئنجا ئەو (عاقل)ە، کە بەشەرێکە، غەریزەی هەیە، شەیتان وەسوەسەی بۆ دەکا، عاتیفەی هەیە، داخوازییە جەستەییەکانی هەن، کارتێکراو دەبێ بە دەوروبەری، بە باری چاك و بەباری

---

(١) المُسْتَصْفى ج١ ص١٢٧.

(٢) إستثمار النص الشرعي بين الظاهرية والمتقصدة، ص ١٤٣-١٥٠، أحمد ذيب.

خراپدا، کەواتە: هیچ کەس نیە بتوانێ بڵێ: عەقڵێکی خولاسەو ڕووت هەیە، بۆیەش جەختی لەسەر دەکەمەوە، چونکە عەلمانییەکان و ئەوانەی کە حیساب بۆ وەحیی و بۆ شەرع ناکەن، دەڵێن: مسوڵمانان، ئیسلامییەکان عەقڵ بە هەند ناگرن و ڕێزی لێ ناگرن و دەڵێن: عەقڵ بەش ناکات!! ئنجا دەڵێن مادام عەقڵ هەیە، عەقڵ زۆر گەورەیە پێویستییمان بە شتی دیکە ناکات!

ئێمەش دەڵێین: ئایا ئەو عەقڵەی تۆ دەیڵێی، کوا لە کوێیە؟ عەقڵێکم بۆ بێنە لە جەستەیەکدا نەبێ، کە ئەو جەستەیەش عاتیفەی نەبێ، غەریزەی نەبێ، ئەو جەستەیە وەهم و خەیاڵی نەبێ، ئەو جەستەیە شەیتانەکان وەسوەسەی بۆ نەکەن، ئەو جەستەیە نەکەوێتە ژێر کاریگەریی دەوروبەرو ژینگە، کوا عەقڵی وا لە کوێ یە؟ ئنجا ئەگەر گریمان هەشبێ، بێگومان هەر تاکو سنووری خۆی دەڕوا، بۆیە گەورەترین عەقڵ، عەقڵی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بووە و، پێغەمبەرانیش کارتێکراو بوون بە وەسوەسەی شەیتان، کارتێکراو بوون بە عاتیفە و، سۆز، بە هەڵچوون، بەو ژینگەو دەوروبەرە کە تێیدا ژیاون و، ئەگەر خوا (عزو جل) بەهێزێکی ڕووحیی تایبەتیی لەلایەن خۆیەوەو، بەهۆی وەحییەوە نەیپاراستبان، تووشی گوناە و هەڵە دەبوون.

باسی
پێنجەم

## عەقڵ سەرەنجام دەچێتەوە نێو بازنەی وەحیی

خوا سبحانە و تعالى فەرمانی کردوە بە بەکارهێنانی عەقڵ، بۆ تێگەیشتن و سەرنجدان و پەند وەرگرتن، بۆ وێنە: با سەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین:

١- لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (٢)دا، خوا فەرموویەتی: ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾ الحشر. واتە: ئەی خاوەن عەقڵان! پەند وەربگرن.

ئەم ڕستەیە لە سیاقێکدا هاتوە کە خوا باسی (بنو النَّضير) دەکا، کە دوای ئەوەی پەیمانیان شکاند و بێ بەڵێن دەرچوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەری کردن لە مەدینە، خوا دەفەرموێ:

﴿يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ٢﴾ الحشر.

واتە: (بۆ ئەوەی ماڵەکانیان نەمێننەوە بۆ مسوڵمانان و سوودییان لێ نەبینن) بەدەستی خۆیان خانووەکانی خۆیان تێکدەدا{شتەکان و کەل و پەلەکانی خۆیان دەفەوتاند، ئەوەی نەیاندەتوانی لەگەڵ خۆیانی بەرن} هەروەها بەدەستی بڕواداران، ئنجا ئەی خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن!

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: [فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ][1] یانی: ئێوەش وەك ئەوان مەکەن، بۆ ئەوەی وەك ئەوانتان بەسەر نەیەت و، پەندیان لێ وەربگرن، کەواتە: خوا فەرمانی کردوە بە بەکارهێنانی عەقڵ و هەرکەسێك عەقڵی خۆی بەکارهێنا، مانای وایە فەرمانی خوای جێ بەجێ کردوە، کەواتە: بەکارهێنانی عەقڵ، دەچێتەوە نێو بازنەی وەحیی.

٢- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٤٢)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٢٤٢ ﴾ البقرة.

واتە: ئاوا خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو بفامن. یانی: ئەگەر ئێمە بفامین و لە ئایەتەکان تێ بگەین، کەواتە: ئێمە بەقسەی وەحییمان کردوە و، فەرمانی وەحییمان جێ بەجێ کردوە.

٣- لەسوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٦٦)دا، خوا فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ٢٦٦ ﴾ البقرة.

واتە: ئاوا خوای ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو بیر بکەنەوە.

یانی: ئەگەر ئێمە بیربکەینەوەو، ڕابمێنین و سەرنج بدەینە ئایەتەکان، مانای وایە: فەرمانی وەحییمان جێ بەجێ کردوە، کەواتە: ئەوە زۆر گرنگە بیزانین، کە عەقڵ دەچێتەوە نێو بازنەی وەحیی.

چونکە وەحیی فەرمان بە عەقڵ دەکات: ڕابمێنەو، بیربکەوەو، سەرنج بدە، لە خۆت و لە دەوروبەرو لە بوونەوەرو لە ئایەتەکانی خوا!

(الشاطبي) دەڵێ: {كل دليل شرعي ثبت في الكتاب مطلقاً غير مقيَّدٍ ولم يُجعَل له قانونٌ ولا ضابط مخصوصٌ، فهو راجع إلى معنىً معقولٍ، وكِلَ إلى نظر المكلَّف، وهذا القِسم أكثَرَ ما تجِده في الأمور العادية التي هي معقولة المعنى كالعدل، والإحسان،

---

(١) (الأبصار) کۆی (بصر)ە، (بصر) یانی: دیتن، بەڵام لێردا مەبەست پێی دیتنی مەعنەوییە، ئەوانەی کە لە ڕووی مەعنەوییەوە شتەکان دەبینن، واتە بە عەقڵ.

والعفو، والصبر، والشكر، من المأمورات، والظلم، والفحشاء، والمنكر، والبغي، ونقض العقد من المنهيات}[1].

واتە: هەر بەڵگەیەکی شەرعیی کە لە قورئاندا بەڕەهایی چەسپابێ و، بەنددار نەکرابێ و نەبەسترابێتەوە و، یاسایەکی دیاری کراویی بۆ دانەنرابێ و، کۆنترۆڵکەرێکی بۆ دانەنرابێ، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ مانایەك کە عەقڵ فامی بکا و، ئەو مانایەش حەواڵەی مرۆڤی ئەرکدار(مُكَلَّف) کراوە، ئەوەش بە زۆریی لەو کاروبارانە دایە، کە لە بواری هەڵسوکەوتەکاندان و، مانایەکەیان عەقڵ دەیفامێ و لێی تێدەگا، وەك دادگەریی و چاکەکاریی و لێبوردن و خۆڕاگریی و سوپاسگوزاریی، لە فەرمانپێکراوەکان، هەروەها وەك ستەم و خراپەکاریی و، شتی بێجێ و دەستدرێژیی و پەیمان شکێنیی، لە قەدەغە کراوەکان.

کەواتە: دەقەکانی وەحیی، دواجار هەر دەبێ عەقڵ لێیان تێ بگاو، شییان بکاتەوە و لێیان حاڵی بێ، بۆ نموونە خوا سبحانە و تعالی کە دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران،

واتە: با کۆمەڵێکتان بانگەواز بۆ چاکە بکەن و، فەرمان بە پەسندو، ڕێگریی لە ناپەسند بکەن، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

(المعروف و المنكر) وەك پێشتر باسمان کرد و چەند نموونەیەکمان لەسەر هێنانەوە، کەشەریعەت دیاریی کردوون، بەڵام دواجار دەرککردنی وردەکاریی پەسەندو ناپەسەندەکان (المعروفات والمنكرات) و چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵدا کردنیان لەسەر ئەرزی واقیع و، چەسپاندنی پەسندەکان و، بژارکردنی ناپەسندەکان، هەر حەواڵەی عەقڵ کراوە.

---

(١) الموافقات في أصول الشريعة، ج٣ ص٤٦.

باسی
شەشەم

## لەکاتی تێکگیرانی وەحیی و عەقڵدا، دەبێ چی بکرێ؟

بەڕێــــزان !

هەوڵدەدەین لە چوار بڕگاندا وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرێ بدەینەوە:

**یەکەم:** وشەی (وحي) کە وەك پێشتر گوتمان بە: (نقل)یش و، (شرع)یش و (بیان)یش، و بە (سمع)یش ناوبراوە، وەحیی ئەگەر بەڕاستیی وەحیی بێ، واتە: زانیاریی خوا، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە ئێستا کتێبەکانی خاوەن کتێبەکان {جوولەکەو نەصرانیی} زۆربەی خەڵك وا دەزانێ بەس (تەوڕات و ئینجیل)ن، بەڵام وانیەو (پەیمانی کۆن) (٣٩)[1] کتێبە و یەکێ لە کتێبەکان (تەوڕات)ە، کەلەپێنج (سِفْر) پێکهاتوە و، (پەیمانی نوێش) چوار ئینجیلەکانن و، نامەکانی (بۆڵس) و کۆمەڵێك شتی دیکەشە، کەکۆی هەموویان (٢٨) کتێبە! یانی: وا مەزانن کە هەر تەوڕات و ئینجیل، کتێبی خاوەن کتێبەکانن، بەڵکو ئەوان مەوسووعەیەکیان هەیە: (Holly book) یانی: (الکتاب المقدس)، کتێبی پیرۆز، کەبەشەرحەوە نزیکەی سێ هەزار(٣٠٠٠) لاپەڕە دەبێ {پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ} ئنجا کەسەرنجی دەدەی سەرت سوڕ دەمێنێ! کەچی هەمووشی بە وەحیی دادەنرێ!

---

(١) بەڵکو بەلای بەشێکی زۆری نەصرانییەکانەوە (٤٩) کتێبن، واتە: دە (١٠) کتێبی دیکەشیان لەگەڵن.

بۆیە دەڵێم: ئەگەر وەحیی بەڕاستیی وەحیی بێ، یانی: زانیاریی خوا، کاتی دیکەش بۆم باس کردوون کە لە پەیمانی کۆندا، هەروەها پەیمانی نوێشدا، بەڵام بەتایبەتیی لە پەیمانی کۆندا، ئەفسانەی وا هەیە لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نیە و، قەت ناگونجێ بڵێی: ئەوە وەحییە.

بەڵێ، وەحیی ئەگەر بەڕاستیی وەحیی بێ، یانی زانیاریی خوا.

ئنجا ئایا عەقڵ لە چی پێك دێت؟

**یەك:** لە بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان (البديهيات العقلية).

**دوو:** لەو زانیارییە پێك دێ، کە عەقڵ بە ئەزموون پەیدای دەکات.

**یـــەك: بەشی یەکەمی عەقڵ، بەڵگەنەویستە عەقڵییەکان:**

بۆ وێنە:

١- (٢+٢=٤).

٢- دوو شتی دژ بەیەك، لە یەك کاتداو پێکەوە، لە یەك شوێندا کۆ نابنەوە (إستحالة اجتماع النَّقيضَيْن).

٣- هەموو (كُلّ) لەبەش (جزْ )ەکەی گەورەترە (الكل أكبر من جزئه).

٤- هەموو پەیدا بوویەك پەیداکەرێکی هەیە، (لكل حادِثٍ مُحْدِث).

٥- هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە (لكل نظام منظِّم).

ئەوانە هەندێ لە بەڵگە نەویستە عەقڵییەکانن، کەئەگەر مرۆڤ بیەوێ هەر شتێك ئیسپات بکات، سەرەنجام دەچێتەوە بۆ ئەو بەڵگە نەویستە عەقڵییانە، ئەوە بەشی یەکەمی عەقڵ.

**دوو: بەشی دووەمـی عەقـــڵ، زانیاریی وەدەستهێنراو:**

پێکهێنەری دووەمی عەقڵ، بریتیە لەو زانیارییەی عەقڵ پەیدای دەکات لە ڕێی هەستەوەرەکان و، لە ڕێی بیرکردنەوەی خۆی و ڕامانەوە، ئنجا چ بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان، چ زانیارییەك کە بەرهەمی ئەزموونە، ئەگەر ئەویش تەواو

بێ، ناگونجێ لەگەڵ زانیاریی خوادا تێك بگیرێن، چونکە وەحیی زانیاریی خوایە و، زانیارییش کەبەرهەمی بەڵگە نەویستەکان و ئەزموونە، ئەویش وەسفی کردەوەی خوایە سبحانە و تعالی، بۆیە تێکگیرانی وەحیی و عەقڵ مەحاڵە.

**دووەم:** ئنجا ئایا کاتێك کە بە ڕواڵەت وەحیی لەگەڵ عەقڵدا تێکگیرا، چی دەکەین؟!

دەڵێین: یان وەحییەکە ڕاست نیە و وەحیی نیە، یان بەرهەمی عەقڵەکە، ڕاست نیە، یاخود هەردووکیان ڕاست نین.

نووسەرێك هەیە:(مۆریس بوکای ) کتێبێکی هەیە باسی قورئان و تەوڕات و ئینجیل و، زانستی سەردەم دەکات، {چونکە ئێستا خەڵکێك هەیە کە بە حیساب ڕەخنە لە قورئان دەگرێ، هەندێك نەصرانیی: ڕەخنەی فیکریی لێ دەگرن، یان ڕەخنەی زانیاریی لێ دەگرن، لە ڕووی زەویی ناسیی، لەڕووی کۆرپەلەناسیی، لە ڕووی فیزیك و گەردووnناسیی یەوە، یاخود ڕەخنەی ڕێزمانیی (قواعد) ی لێ دەگرن! یان دەڵێن: قورئان هەندێکی لەگەڵ هەندێکی دا ناکۆکە! بەڵام هەموو ئەوانە، یان هەیانە هەر عەرەبیی نازانێ، من کتێبی هەندێك لە نەصرانییەکانم خوێندۆتەوە، کە بە حیساب ڕەخنە لە قورئان دەگرن، ئەصڵەن هەر عەرەبیی نازانن، یان هەر لە قورئان لە بەهانە بووە و هەرویستوویەتی قسەی لەدژ بکات}.

ئنجا بەکورتیی (مۆریس بۆکای ) لەکتێبەکەی (التوراة والإنجيل والقرآن والعلم الحديث)دا دەڵێ: هیچ حەقیقەتێکی زانستیی نیە لەگەڵ قورئاندا تێکبگیرێ، بەڵام زۆرجار زانست لەگەڵ تەوڕات و ئینجیلدا تێك دەگیرێ، بەڵام نەك ئەو تەوڕات و ئینجیلەی کە خوا ناردوونی، بەڵکو ئەوانەی دەستکاریی کراون و گۆڕدراون، لێتان تێك نەچێ! چونکە ئێمەی مسوڵمان نابێ لەبەر ئەوەی دیفاع لە قورئان دەکەین، بەکەم تەماشای تەوڕات و ئینجیل بکەین! ئەوانیش هەر فەرمایشتی خوان، خوا لە سەردەمی مووسادا تەوڕاتی فەرمووە و، لە سەردەمی عیساشدا ئینجیلی فەرمووە و، لە سەردەمی داوددا، زەبووری فەرمووە، هەمووی هەر فەرمایشتی خوایە و لە یەك ئاستدان، پاشان لە

سەردەمی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)دا تاکو دنیا کۆتا دێت، قورئانی فەرمووە، هەمووی هەر فەرمایشتی خوایە، ئنجا کتێبەکانی خوا لەو ڕووەوە کە فەرمایشتی خوان، یەکسانن، وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾ (البقرة: ٢٨٥).

واتە: جیاوازیی ناکەین لە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەران، یانی: ئیمانیش بە هەموو کتێبەکانی خوا دێنین وەك ئەصڵەکەیان، بەڵام وەك حاڵەتی ئێستایان، هیچ گومانی تێدا نیە، کەگۆڕاون و دەستکاریی کراون، وەك لەمەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا، لەباسی: ئیمان بەکتێبەکانی خوا (الإيمان بكتب الله)دا[1]، چەندان نموونەمان لەپەیمانی کۆن و پەیمانی نویٚ و (أناشيد سُليمان) و (زبور)ی (داود)دا هێناونەوە، کە شتی وایان تێدایە لەگەڵ هیچ عەقڵ و عیلم و مەنتیقێکدا ناگونجیٚ! لەبەر ئەوەی هەرچەندە لەئەسڵ دا وەحیی بوون، بەڵام دەستکاریی کراون! ئنجا جاری وایە وەك چۆن ئەوەی بەوەحیی دانراوە، وەحیی نیە، ئەوەش کە بە عیلم زانراوە، عیلم نیە، وەك بیردۆزەی داروێنیی، کە کاتی خۆی خەڵکیان زۆر پێوە سەرقاڵ کرد، داروێن کاتی خۆی کتێبێکی داناوە بەناوونیشانی: {بنەڕەتی جۆرەکان} (أصل الأنواع)، ماوەیەکی زۆر خەڵکێکی زۆریان پێوە سەر گەرم کرد، دوایی کە زانستی زیندەوەرزانیی زیاتر گەشەی کرد، دەری خست، کە ئەوەی داروێن گوتوویەتی، لەگەڵ زانست دا ناگونجیٚ و، ئەسڵەن ناگونجیٚ ئاژەڵ ببیٚ بە مرۆڤ.

مامۆستایەك جارێك وتاری دەدا، دەیگوت: نازانم ئەوانە بۆچی هێندە بیٚ عەقڵن، باشە بۆ چی هێندێك لە مەیموونەکان بوونە بەشەر، بەڵام ئەوانی دیکە هەربە مەیموون مانەوە و، نەبوونە بەشەر؟! قسەکەشی جوانە، ئەگەر ڕاستە مەیموون بۆتە بەشەر، بۆچی هەندێکیان بوونیٚ و، هەندێکیان نەبوونیٚ؟.

بۆیەش پێویستە پەلەپەل نەکەین لەوەدا کە ئایەتێك ئاماژەیەکی تێدایە، بۆپشتگیریی بیردۆزەیەکی زانستیی و، یەکسەر بێنین بڵێین: ئەو ئایەتە لەگەڵ

---

(١) کە لە چاپی دووەمی مەوسووعەکەدا کتێبی چوارەمە.

ئەو بیردۆزەیەتی! با هەموو جارێ بە وریاییەوە بڵێین: ئەگەر ئەو بیردۆزەیە ڕاست بێت، قورئان ئاماژەی بۆ ئەو شتە کردوە، بەڵام نەڵێین: بەس ئەو مانایەی هەیە، بۆیە ئەو ئایەتەی کە باس لەوە دەکات: کاتی خۆی ئاسمانەکان و زەوی، یەك بوون:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴾ (الأنبياء:٣٣).

ئێمە ناڵێین: حەتمەن بیردۆزەی بیگبانگ (big bang) (تەقینەوەی گەورە) چی گوتوە، ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ، بەڵام دەڵێین: لەگەڵی دەگونجێ.

**سێیەم:** ئنجا ئایا کاتێك وەحیی، یان شتێك کە بەوەحیی دانراوە، لەگەڵ شتێك دا کە زانیارییە، یان بەزانیاریی دەزانرێت، تێك گیران، دەبێ چی بکەین؟ لە وەڵام دا دەڵێین: کامیان دڵنیاکەرە[1]، دەبێ پێش بخرێ، ئنجا نەقڵ بێ، یان عەقڵ بێ، بەڵێ ئەگەر شتێك کە بەنەقڵ دەزانرێ، بە دەقێکی شەرعیی، لەگەڵ شتێکدا تێکگیرا، کە بە بەرهەمی عەقڵ دەزانرێ، ئەو کاتە تەماشا دەکەین: کامیان یەکلاییکەرەوە (قطعي) و جێی دڵنیاییە، ئەویان پێش دەخەین، بۆ وێنە: ئەگەر ئایەتێك لەگەڵ بیردۆزێکدا تێکبگیرێ، دەڵێین: مادام ئایەتەکە واتایەکەی ڕوون بێ، ئایەتەکە ڕاستە و ئەو بیردۆزەیە هەڵەیە، چونکە ئایەتەکە یەکلاییکەرەوە (قطعي)یەو، ئێمە دڵنیاین کە خوا فەرموویەتی، بەڵام ئەو بیردۆزەیە، دڵنیا نین کە ڕاست دەردەچێت.

جاری واش هەیە زانیارییەکە، یان حوکمە عەقڵییەکە،، جێی دڵنیاییە، بەڵام دەقە شەرعییەکە لەڕووی سەنەدەوە، یان لەڕووی نێوەڕۆك (متن)ەوە، جێی دڵنیایی نیە، هەڵبەتە لەو حاڵەتەش دا، زانیاریی و حوکمە عەقڵیەکە، پێش ئەو دەقە شەرعییە دەخرێ، کە جێی دڵنیایی نیە.

**چوارەم:** ئنجا ئەگەر بەڵگە عەقڵییەکە جێی دڵنیایی و یەکلاییکەرەوە (قطعي) بوو، ئەو کاتە دەبێ یەکێك لەسێ بژاردان هەڵبژێرین:

---

(١) دڵنیاکەر: يقيني.

**یەکەم:** دەقە نەقڵییەکە تەئویل بکرێ، واتە: مانایەکی لێ بدرێتەوە کە لەگەڵی بگونجێ.

**دووەم:** یاخود (تفویض) بکرێ، یانی: بڵێین: مانایەکەی، خوا یان خواو پێغەمبەرەکەی دەیزانن.

**سێیەم:** حاڵەتی سێیەمیش ئەوەیە کە ڕەت بکرێتەوە.

بەڵام ئەگەر دەقەکە (قطعي) بوو، ئەوە بە تەئکید بەڵگە عەقڵییەکە، بە هەڵە دادەنرێ و، حیسابی بۆ ناکرێ، چونکە زانایان بنچینەیەکیان داناوە، زۆر گرنگە دەڵێ: (قد يأتي الوحي بمحارات العقول، ولا يأتي بمحالات العقول) واتە: وەحیی جاری وایە شتی وا دێنێ، عەقڵ تێیدا سەرسام دەبێ، بەڵام هەرگیز وەحیی شتی وای تێدا نیە، عەقڵ بەمەحاڵی بزانێ.

بەڵێ جاری وا هەیە وەحیی شتێکی وا دێنێ، عەقڵ سەری لێ دەرناچێ، بەڵام هەرگیز شتی واناهێنێ، کەعەقڵ دژی بێ و لەگەڵی تێك بگیرێ.

باوێنەیەکتان بۆ بێنمەوە کە لە (صحيح البخاري) و (صحيح المسلم)دا هاتوە، ڕۆژێك عومەر (رضي الله عنه) بەدەوری کەعبەدا تەوافی دەکرد، بەردە ڕەشەی ماچ کرد، گوتی: دەزانم بەردێکی نە قازانجت هەیەو نە زەرەرت هەیە: (...لولا أَنِّي رأيت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قَبَّلك، ما قَبَّلْتُك) ئەگەر پێغەمبەری خواشم (صلى الله عليه وسلم) نەبینیبایە ماچی کردووی، ماچم نەدەکردی![1] واتە: تێی ناگەم چۆنە! بەڵام هەردەیکەم، چونکە کارێکیی پەرستشیی (تعبّدي)یە!.

خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، چۆن؟! نازانین.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێك شتی فەرمووە، سەرمان لێی دەرناچێ: بۆ وێنە دەفەرموێ: {ما بين مَنكِبَي الكافر مسيرة ثلاثة أيامٍ للراكب المُسْرِع} أخرجه البخاري برقم: (٦٥٥١)، واتە: (لە دۆزەخ دا) نێوان هەردووك شانی بابای کافر، سێ ڕۆژە ڕێیە بۆ سوار چاکی تیژڕەو.

---

(١) الصحيح البخاري: ١٥٩٧، صحيح مسلم: ١٢٧٠، هەروەها لە هەر چوارده کتێبی (سنن)یشدا هاتووە.

ئنجا ئایا دەبێ هەموو جەستەی چەندبێ؟ ئێمە سەرمان لێ ی دەرناچێ، بەڵام ئەو ئایەتەی لە سوورەتی (الواقعة)دا هاتوە، کە تاکە ئایەتێکە لەو بارەوە، بەگشتیی لەوبارەوە بنەمایەکمان دەخاتە دەست، خوا فەرموویەتی

﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ ؟ (الواقعة:٦١).

واتە: بەجۆرێك دروستتان دەکەینەوە، کە ئێستا نازانن چۆنە! بەڵام چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، دەبێ بڵێین: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خۆی دەزانێ، چۆن فەرموویەتی؟ دیارە بەهۆی وەحییەوە فەرموویەتی و عەقڵی ئێمە بۆی ئیستیعاب ناکرێ، ئنجا ئەگەر بۆیشی ئیستیعاب نەکرێ، گرنگ ئەوەیە لەگەڵ عەقڵ دا تێك ناگیرێ، ئایا مەحاڵە کە لەشی بابای کافر هێندە گەورە بێت؟ نەخێر، کەواتە: مەحاڵ نیە، بەڵێ عەقڵ ئێستا تێی ناگات بە پێوەرەکانی ئێستای، بەڵام وەحیی شتی وای هەیە، کە عەقڵ تێیدا سەرسامە و سەری لێ دەرناچێ، بەڵام مانای وانیە کە هەڵەیە و حاڵ و وەزعی جیهانی بەرزەخ و، جیهانی قیامەتیش لە هی ئێستای ژیانی دنیا، زۆر جیاوازە.

# بـــەرایی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشی دووەمەی تەوەری پێنجەم، کە بۆ توێژینەوەی بابەتی (شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!) تەرخان کراوە، لەسێ باسی سەرەکیی پێکهاتوە:

**باسی یەکەم:** ڕاستە ژیان و گوزەران و بوونەوەر و دەوروبەر بەردەوام لەگۆڕان دان، بەڵام ڕاست نیە هیچ شتێکی چەسپاو بوونی نەبێ.

**باسی دووەم:** ڕاستە ئایین وەك ژمارەی دەقەکان چەسپاو و نەگۆڕە، بەڵام ڕاست نیە کەبواری گۆڕانکاریی و داهێنانی تێدانەبێ.

**باسی سێیەم:** هۆکارەکانی نەرمیی گونجاویی شەریعەتی ئیسلام.

هەڵبەتە ئەم بابەتەش زۆر فراوان و بەلق و پۆپە، بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە بەچڕیی و گوشراویی، ئەوەی پێویست و مەبەستە، بیخەینەڕوو.



## دەستپێك

**شەریعەتی چەسپاو، چۆن لەگەڵ ژیان و گوزەرانێکی گۆڕاودا دەگونجێ و، چۆن دینی چەسپاو، بەفریای ژیانی گۆڕاو دەکەوێ؟!**

ئەم بابەتە پرسێکی زۆر گرنگە: لەکاتێکدا ئایین -کە مەبەستمان پێی ئیسلامە- ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت و دیاریی کراون، بەتایبەت ئایەتەکانی قورئان، هەموو زانایان یەکدەنگن لەسەرئەوە کە قورئان سەدوچواردە (١١٤) سوورەتە و، شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش (٦٢٣٦) ئایەتەو، بە سوورەتی (الفاتحة) دەست پێ دەکات و، بە سوورەتی (الناس) کۆتایی پێ دێت و، دیاریی کراوە.

هەروەها دەقەکانی سوننەتیش، ئەوانیش تا ڕادەیەك دیاریی کراون، بەو واتایە کە زانایان بەگشتی لەسەریان ڕێککەوتوون، بەڵێ لە ڕووی پلەی متمانە پێکرانەوە، کە ئەو دەقە ئایا هی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) یان نا؟ لەو ڕووەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە.

ئنجا پرسیارەکە ئەوەیە کە: لە کاتێك دا ئایین (مەبەستمان پێی ئیسلامە) دەقەکانی دیاریی کراون و چەسپاویشن و، ژیانیش بەردەوام لە گۆڕاندایە: ژیانی تاك، ژیانی کۆمەڵگا، لە هەموو ڕووەکانی سیاسیی و، ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، ئاشتیی و جەنگ و...هتدەوە، بەردەوام لە گۆڕاندایە، ئەدی چۆن شتێکی سنووردار، دەتوانێ شتێکی بێ سنوور و، چۆن شتێکی چەسپاو، دەتوانێ شتێکی گۆڕاو، ئیستیعاب بکات؟ ئەوە پرسیارێکی جیددییەو ئێمە

وەڵامی ئەو پرسیارەمان لە شوێنێکی دیکەدا داوەتەوە[١]، بەڵام بە هەر حاڵ لە قەدەر ئەم دەرفەتەی ئێستا و، بە شێوازێك کە ئێستا دەیخوازێ، سەرجەم لە سێ باسی سەرەکییدا، وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوەو ڕوونی دەکەینەوە: ئەو ئیشکالە چۆن چارەسەر دەکرێ؟



---

(١) لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان)دا، چاپی سێیەم/ ٢٠١٥، لاپەڕە (١٤٩) تاکو (١٧١)مان داناوە، بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە.

## باسی یەكەم

### ڕاستە ژیان و گوزەران و بوونەوەر و دەورووبەر بەردەوام لەگۆڕان دان، بەڵام ڕاست نیە هیچ شتێكی چەسپاو بوونی نەبێ

ڕاستە كە گۆڕان و پەرەسەندن لە ژیانی مرۆڤ و، لە دەوروبەرو بوونەوەریشدا هەیە، ئەوە شتێكە نكوولّیی لێ ناكرێ و، ڕاستە ژیان گۆڕاوە و، ژیان بەردەوام دەگۆڕێ، ئنجا ئەو گۆڕانكاریی و تازە بوونەوە و، بەرەو پێش چوون و پەرەسەندنە، هەم لە دەوروبەریشدا هەیە، هەم لە بوونەوەریشدا هەیە، بەڵام ئەوە ڕاست نیە كە هیچ شتێك لە ژیاندا چەسپاو نەبێ.

بۆ وێنە: جەستەی مرۆڤ ئەگەر تەماشای بكەین: خانەكانی جەستەی مرۆڤ[1] لە هەر چركەیەكدا هەزارانیان بەڵكو ملیۆنانیان لێ دەمرن و، ملیۆنانی دیكە زیندوو دەبن و دێن جێی وان دەگرنەوە[2]، بەڵام تەماشا دەكەین ئەو مرۆڤە، وەك خۆی دەمێنێتەوە، كەسایەتیی هەر كەسێك، چەسپاوە، بەڵێ بە قۆناغەكانی منداڵیی و

---

(١) كە بە سەد ترلیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) $١٠^{١٤}$، مەزەننە دەكرێت.

(٢) لەهەر چركەیەكدا دەوری سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥،٠٠٠،٠٠٠) خانە لەجەستەی مرۆڤ دەمرن و، هی دیكە جێیان دەگرنەوە.

هەرزەکاریی و گەنجێتیی و کامڵ بوون و پیرییدا، تێ دەپەڕێ، بەڵام کەسایەتییەکەی چەسپاوە، یانی: دەزانرێ کە ئەوە فڵان کەسە، سیمای، قەدو قیافەی، بەڵکو زۆرجار حاڵەتی ئاکار و ڕەفتاریشی چەسپاوە، کەواتە: مرۆڤ هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە گۆڕانکاریی تێدا دەبێت، بەڵام لایەنی چەسپاویشی تێدا هەیە.

نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو گۆڕان و پەرەسەندن، تەنیا لە ڕووی جەستەییەوە، لەمرۆڤدا هەیە، ئەگەرنا ڕووحی مرۆڤ، وەك خۆیەتی، نەمانزانیوە، رووحی مرۆڤ، بەو واتایە کە وەك چۆن جەستە گەشە دەکات، ڕووحی مرۆڤیش گەشە بکا، جارێ ئەسڵەن ئێمە ڕووح هەر نابینین و، بەرهەست نیە، تاکو بڵێین: ئەها! ئەوە گەشەی کرد، جەستە دیارە: جەستەی منداڵ بچووکەو، گەشە دەکاو گەورە دەبێ، بەڵام ڕووح وا پێ دەچێت یەك حەقیقەتی نەگۆڕ بێت، بۆیەش دەڵێم: وا پێ دەچێ، چونکە ڕووح بەرهەست نیە و ناتوانین حوکمێکی وردی بەسەردا بدەین، ئەوە بەنسبەت خودی جەستەی مرۆڤەوە.

ئنجا لە دەوروبەر و ژیانی مرۆڤدا، ڕاستە ژیانی مرۆڤ زۆر گۆڕانکاریی تێدا پەیدا بووە، لە ڕووی دابین کردنی پێداویستیەکانیی ژیانەوە، کاتی خۆی وا پێ دەچێ، مرۆڤ هەر ڕاستەوخۆ لە سروشت بەهرەمەند بووبێ، بەبێ بەکارهێنانی ئامرازەکان، یان ئاگر بۆ کوڵاندن و برژاندن، وەك زۆر لە مێژوونووسان دەڵێن، واپێدەچێ مرۆڤ ڕاستەوخۆ لەو سروشتەی کە خوا خوڵقاندوویەتی، بەهرەمەند بووبێ، بۆ وێنە: گۆشتی کاڵی خواردبێ، دانەوێڵەو، میوەو، سەوزەو...هتد، بەڵام دوای ئەوەی کە مرۆڤ ئاگری دۆزیوەتەوە، دەستی کردوە بە کوڵاندن و برژاندنی خۆراکەکانی.

ئنجا پێشتریش مرۆڤەکان ئامرازەکانی خۆیان لە بەرد دروست کردوون، دوایی لە ئاسن دروستیان کردوون، ئێستاش ئەوە خۆتان دەبینن!

بەڵام دیسان ئەوەش هەمووی هەر گۆڕاو نیە، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ هەوڵی داوە شتێك بخوا و، شتێك بخواتەوە و، پێویستیی بە ئاوو خۆراك هەبووە، ئنجا خۆراکەکە چ جۆرێك بووە؟ خواردنەوەکە چۆن بووە؟ بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوەی کە لە مرۆڤدا چەسپاوە، ئەوەیە کە پێویستیی بە خواردن و خواردنەوە هەیە، هەروەها مرۆڤ کاتی خۆی خەوتوە، ئێستاش هەر دەخەوێ، بەڵام کاتی خۆی

لەسەر بەردێك خەوتوە، لە شوێنێکی سادە، لە ئەشکەوتێکدا، کەچی ئێستا لە شوێنێکی خۆشگوزەرانانە دەخەوێ، هەروەها سەرجەم شتەکانی دیکە: مرۆڤ هاموشۆی هەر کردوەو، ئێستاش هەردەیکات، کاتی خۆی بەپێ و وڵاخی بەکارهێناوە، ئێستاش هۆیەکانی هاتوچۆ بەکاردێنێ.

هەروەها مرۆڤەکان هەر پێکەوە ژیاون، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بووە، بەڵام کاتی خۆی پەیوەندییەکی سادە بووە، ڕەنگە بەو شێوەیەی ئێستا نەبووبێ، ئێستا زۆر ئاڵۆز بووە، مرۆڤ ئێستا شاری دروست کردوە، دەوڵەتی دروست کردوە، سیستمی داناوە، بەڵام ئەوەی کە نەگۆڕە ئەوەیە کە: مرۆڤ هەر پێکەوە دەژین و، هەر پێویستییان بە یەکدی بووەو پێکەوە ژیاون، ئەوەیان جێگیرە، بەڵام چۆنیەتی پێکەوە ژیانەکەیان و، پێکەوە کۆبوونەوەکەیان، گۆڕانی بەسەردا هاتوە.

ئنجا ئەگەر لە چوارچێوەی ژیانی مرۆڤ بچینە سەرتر، وەك کەهکەشانەکان، بەڵێ دەزانین کەهکەشانەکانیش گۆڕاون و فیزیای ئێستا دەری خستوە، کە ئەستێرەکان، پیر دەبن، دەمرن، دەتەقنەوە، کۆتاییان دێت و، ئەستێرەی دیکە دروست دەبن، بۆ نموونە: ئەستێرەیەك هەیە پێی دەگوترێ: ئەستێرەی (قُطب) بە هەژدە (١٨) ملیۆن ساڵی تیشکیی، ئنجا تیشکەکەی دەگاتە ئێمە، یانی: ئەو تیشکەی ئێستا ئێمە دەیبینین، بە تەلسکۆبەکان، هی هەژدە (١٨) ملیۆن ساڵ لەمەوپێشە، بەڵام ئێستا بۆ ئێمە کە تەماشا دەکەین، ئاسمان هەر وەك خۆیەتی، پێکهاتەی ئاسمان بۆ ئێمەی بەشەر، هەر وەك خۆیەتی، ئەگەر ملیۆنێك ساڵیش بێ، بەشەر لەسەر زەوی ژیابێ، ئەگەر چەند ملیۆن ساڵیش بێت، گرنگ ئەوەیە ئەو کەهکەشانانەی کە هەن، ئەو ئەستێرانە، هەر وەك خۆیانن، چیایەکان هەر چەسپاون، دەریایەکان، باران بارین، ...هتد، کەواتە: بەڵێ ژیان گۆڕانی بەسەردا دێت و دەگۆڕێ، بەڵام واش نیە هیچی چەسپاوی تێدا نەبێ، هەموو شتەکان ڕێژەیین، بۆیە جگە لە خوا سبحانە و تعالی هیچ شتێکی ڕەها نیە، هەموو شتێك ڕێژەییەو، هەموو شتێك سنووردارە، تەنیا خوای بەرزءمەزن بێ سنووردو ڕەهایە.

بێینە سەر باسی ئیسلام، دین، وەحیی، کە ئایا ئەویش وایە هەمووی چەسپاو بێت و، هیچ گۆڕانی بەسەردا نەیەت؟!

# باسی دووەم

## ڕاستە ئایین وەك ژمارەی دەقەكانی چەسپاو و نەگۆڕە، بەڵام ڕاست نیە كە بواری گۆڕانكاریی و داهێنانی تێدا نەبێ

لەوبارەوەش دەڵێین: بە تەئكید ڕاستە، ئایەتەكانی قورئان لێیان كەم و زیاد ناكرێ و، دەقەكانی سوننەتیش لەلای زانایانی پسپۆڕ لە بواری فەرموودەناسییدا، ئەوانیش لێكیان جیاكردوونەتەوە و دیارییكراو و چەسپاون، لێیان كەم و زیاد ناكرێ، بەڵێ دەگونجێ فەرموودەیەك مشتومڕێكی لەسەر بێت و، دوایی دەربكەوێ كە ئەو فەرموودەیە لەگەڵ واقیع دا تێك دەگیرێ، یان لەگەڵ قورئان دا تێك دەگیرێ، یان لەگەڵ عیلم دا تێك دەگیرێ، یان لەگەڵ عەقڵ دا و، پاشان هەندێك لە زانایان یان هەموویان ڕەتی بكەنەوە، ئەوە دەگونجێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە كۆی دەقەكانی سوننەت، ئێستا ناگونجێ هیچ زانایەك پەیدا ببێ بڵێ: من هەندێ حەدیسی دیكەم دۆزیونەوە! بەڵێ دەگونجێ بڵێ: لە هەندێك فەرموودان، لە هەندێك دەقی سوننەت دا كەوتوومە گومان و، ڕەنگە هی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبن، لەبەر هەر هۆیەك بێ (كەپێشتر باسمان كردن)، بەڵام ناگونجێ هیچ زانایەك پەیدا بێ بڵێ: من هەندێ دەقی دیكەم دۆزیونەوە، هەروەها دەگونجێ بڵێ: هەندێك دەق هەبوون،

زانایان بەبێ هێزیان داناون، بەڵام بۆم دەرکەوتوە کە ڕاستن، وەك ئەلبانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، وای کردوە، یان بڵێ: هەندێك دەق کە زانایان بە ڕاستیان داناون، بۆم دەرکەوتوە کە بێ هێزن، ئەوە دەگونجێ، بەڵام ناگونجێ هیچ کەس بڵێ: هەندێك دەق هەبوون، ئەو هەموو زانایانە کەس پێی نەزانیون، من تازەم دۆزیونەوە، لەکوێی دۆزیونەوە؟ لەکوێی هێناون؟ هەرگیز شتی وا نابێ، کەواتە: ئەوە ڕاستە، کە دەقەکانی شەریعەت دیاریی کراون و ژمێردراون، بەڵام ئایا ڕاستە کە ئایین هەمووی چەسپاوە و نەگۆڕە؟ بە تەئکید نەخێر.

## دوو پێکهاتە سەرەکییەکەی ئیسلام:

ئیسلام بەگشتیی دوو پێکهاتەی بنەڕەتیی هەن:

١- پێکهاتەی نەگۆڕ.

٢- پێکهاتەی گۆڕاو.

## ١- پێکهاتەی نەگۆڕی ئیسلام:

دەتوانین ئەم پێکهاتەیەی یەکەمی ئیسلام، دابەش بکەین بۆ حەوت جۆر:[١]

### أ- بوونناسیی (ontology):

(کە پێشتر باسمان کرد) ئەوە کە ئەم بوونە، بەبەدیهێنەرو بەدیهێنراوەوە، چییەو چۆنە؟ ئەوە شتێکی نەگۆڕە و گۆڕانی بەسەردا نایەت و، ژمارەیەکی زۆریش لە دەقەکانی قورئان و سوننەت، پەیوەندییان بە بوونناسییەوە هەیە.

---

(١) ئەوە هەمووی بۆچوونی خۆمە، نەك لە سەرچاوەیەکی دیاریی کراو وەرم گرتبێ، بەڵام بێگومان لە تێگەیشتن و بەرهەمی زانایان لەوبارەوە، بەهرەمەند بووم.

### ٢- ئیمان و عەقیدە:

ئەو دەقانەی کە پەیوەندییان بە ئیمان و عەقیدەوە هەیە، زۆر زۆرن، ئیمان و عەقیدەش گۆڕانی بەسەردا نایەت: ئیمان بەخوا سبحانه و تعالى، خوا حەقیقەتێکی نەگۆڕە، ئیمان بە فریشتەکان، ئیمان بە کتێبەکانی خوا، ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا، پێغەمبەران تازە ژمارەیان کەم و زیاد نابێ، فریشتەکان چۆنن هەر وان، ئیمان بە ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ، ئیمان بە ئەندازەگیریی خوا (القدر) .. ئەوانە هیچیان گۆڕانیان بەسەردا نایەت و نەگۆڕن.

### ٣- خواپەرستیی:

خواپەرستیی مامەڵەیە لەگەڵ خوادا، واتە: مامەڵەی کردەیی، ئیمان و عەقیدە مامەڵەی فیکریی و تیۆرییە لەگەڵ خوادا، بەڵام جێ بەجێ کردنی دروشمەکان، شایەتمان، پێنج نوێژە فەرزەکان، زەکات و، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج و عومرەو، دوعاو، نەزرو، قوربانیی و ...هتد. مامەڵەیی کردەیین و، دیسان گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

### ٤- ڕەوشت و ئاکار:

بۆنموونە: ڕاستگۆیی باشە، درۆ کردن خراپە، ڕەحم و بەزەیی باشە، دڵڕەقیی خراپەو...هتد. ئەو بەهاو ئاکارە پەسەند و، سیفەت و ڕەفتارە خراپانە حوکمەکەیان گۆڕانی بەسەردا نایەت و، چاکیان هەر چاك و، خراپیشیان هەر خراپە.

### ٥- باری کەسێتیی:

ئەوە کە خێزان چۆن دروست بکرێ؟ هەموو ئەوانەی کە بێ دینیشن، بە ناچاریی، هەر دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای ئەوە کە خوای کاربەجێ دایناوە لە شەریعەتدا و، فیترەتیش هەر وا دەڵێ، ئەگەر بیانەوێ ژیانی بەشەر بەردەوام

بێ، بەڵێ ئێستا لە ڕۆژئاوا، لە ئەنجامی لادانیان لە فیترەتی خوا (وەك دوایی باسی دەکەم) خێزانی یەك ڕەگەزیی، هەیە: دووپیاو، یان دوو ئافرەت!! بەڵام ئەگەر بەشەر وا بکات، وەك دیناسۆڕ دەبڕێتەوە!

## ٦- هێڵە گشتییەکانی بـــواری حوکم و سیاسەت و، ئابووریی و، پەیوەندییەکان:

ئەوانەش دیارە نەگۆڕن، بۆ وێنە: ڕاوێژ بناغەی حوکمڕانییە و، چەسپاندنی دادگەریی ئامانجی سەرەکییەتی و، ستەمکاریی و خۆسەپاندن حەڕامن و... هتد.

## ٧- حوکمە ڕوونەکانی حەڵاڵ و حەڕام:

یانی: ئەوە حەڵاڵە و، ئەوە حەڕامە و، ئەوە واجبە.. ئەو شتانەش گۆڕانیان بەسەردا نایەت، دزیی هەر حەڕامە، سوود خۆریی هەر حەڕامە، داگیرکردن و، زوڵم هەر حەڕامن و، بە پێچەوانەوە: بەخشین و، هاوکاریی خەڵك و، چاکە لەگەڵ کردنیان و، صیلەی ڕەحم و، ئەوانە هەموویان واجبن و چاکن و ناگۆڕێن.

٢- پێکهاتەی گۆڕاوی ئیسلام:

شەریعەت وێڕای ئەو دیوەی کە ناگۆڕێ و، جێگیرو چەسپاوە، پێکهاتەیەکی گۆڕاویشی هەیە، کە دابەش دەبێ بۆ چوار بواری سەرەکیی:

١- حوکم و سیاسەت.

٢- ئابووریی.

٣- جەنگ و ئاشتیی.

٤- هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان.

هەڵبەتە دەگونجێ بواری دیکەش باس بکەین، بەڵام ئەم چوار بوارە، گۆڕانی زۆریان تێدا دەبێت، بۆیە زانایان، بنچینەیەکی شەرعییان داناوە، دەڵێن: {الأصل في العبادات الحظر، والأصل في المعاملات: الإباحة}کە بەشێوازی دیکەش تەعبیریان لێ کردوەو ئەو بنچینەیان ڕاگەیاندوە، واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا بریتیە لە: قەدەغە بوون و، بناغە لەهەڵس و کەوتەکاندا بریتیە لە: ڕێ پێدان. یانی: قەدەغەیە لەخۆتەوە خواپەرستییەك دابێنی، ڕێت لێ گیراوە، چونکە خواپەرستیی واتە: مامەڵە لەگەڵ خوادا، چ مامەڵەی فیکریی، وەك ئیمان و عەقیدە، یان مامەڵەی کردەیی، وەك دروشمەکان، ڕێت لێ گیراوە لەخۆتەوە جۆرێك لە خواپەرستیی دابێنی، ئەوە بەداهێنان لە ئایین دا (الإبتداع في الدين) لە قەڵەم دەدرێ و حەرامە.

بەڵام بەپێچەوانەوە: هەڵسوکەوتەکان، ئەسڵ و بناغە تێیاندا بریتیە لە: دەستکراوەیی و ڕێ پێدران، هەموو مامەڵەکان ڕەوان، جگە لەوەی کە دەقێکی شەرعیی قەدەغەی کردبێ، هەڵبەتە بۆخۆم پێم وایە ئەم بنچینەیە ئاوای لێ بکرێ باشترە: {الأصل في العقيدة والعبادة والأخلاق: المنع، والأصل في المعاملات بأنواعها: الإباحة}، پێم وایە ئەگەر ئاوای لێ بکەین، ئەو بنچینەیە فراوانتر دەبێ

و گشتگیرتر دەبێ، واتە: ( بناغە لە عەقیدەو، خواپەرستیی و، ڕەوشتەکاندا، بریتیە لە: ڕێ لێ گیران و، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا بە هەموو جۆرەکانیەوە، بریتیە لە: ڕێ پێدران) مەبەست لە ڕێ لێ گیران، ئەوەیە کە کەسێك بۆی نیە لەخۆیەوە جۆرێك لە عەقیدە دابێنێ، جۆرێك لە عیبادەت دابێنێ، یان جۆرێك لە ڕەوشت دابێنێ، کە بنچینەکانی نەبن، چ بەباری چاکەدا، چ بەباری خراپەدا، چونکە هەرچەندە لێی بکۆڵیەوە، حەتمەن هەرچی ڕەوشتی جوان و بەرزو پەسەندە، شەریعەت فەرمانی پێ کردوە و، هەرچی ئاکارو خوو و خدەی ناپەسندو خراپە، شەریعەت قەدەغەی کردوە، ئەگەر بەناویش نەبێ، وەك نێوەڕۆك هەمووی دیاریی کراوە.

ئنجا با سێ وێنان بێنینەوە بۆ ئەوەی بەرچاوتان ڕۆشنتر بێ، چۆن ئیسلام وێڕای ئەوە کە پێکهاتەی نەگۆڕی هەیە، پێکهاتەی گۆڕاویشی هەیە:

**وێنەی یەکەم: لەو بوارەدا کە گۆڕانکاریی تێدا دەبێ:**

لە بواری حوکم و سیاسەتدا: پێنج بنەما هەن، کە پێنج بنەمای بنەڕەتیین و، ناگونجێ بگۆڕێن، بەڵام جگە لەو پێنج بنەمایە، بەبۆچوونی من، {هەرچەندە ڕەنگە شتی دیکەش هەبێ، دەقی لەسەر بێ} بەڵام بەگشتی خەڵك دەستی کراوەیە لە بواری حوکم و سیاسەتدا:

**١- بەرپرسیارێتیی سەرپەرشتییکردنی کۆمەڵگا، سپاردەیە و، پێویستە کۆمەڵگا بە کەسانی شایستەی بسپێرێ:**

کۆمەڵگا چۆن ئیدارە دەکرێ،؟ ئائەوە ئەمانەتە و، لەسەر کۆمەڵگا پێویستە ئەو سپاردە (أمانة)یە بەکەسانی شایستەو خاوەن تواناو کەفائەت بسپێرێ.

خوا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٥٨)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

واتە: خوا فەرمانتان پێ دەکات کە: سپاردەکان بەخەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن.

پێشتر باسی ئەوەمان کردوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی لە بەرپرسیارێتیی ناوە ئەمانەت، کەیەکێ پرسیاری لێ کردوە: ئاخیر زەمان کەنگێ یە (متى الساعة؟)، فەرموویەتی: {إِذَا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ} أخرجه البخاري برقم (٥٩)، واتە: ئاخیر زەمان کەی دێ؟ فەرمووی: هەرکات سپاردە زایە کرا، چاوەڕێی ئاخیر زەمان بە، کابرا گوتی: زایە کردنی ئەمانەت چۆنە؟ فەرمووی: ئەگەر کاروبار بە خەڵکی نا شایستە سپێردرا، ئەوە چاوەڕێی کۆتایی هاتنی (ئاخیر زەمانی) ئەو کارە بکە.

ئەوەش واقیعە و هەر کارێك بە کەسانێکی ناشایستە بسپێردرێ، کارەکە کۆتایی پێ دێ و سەری بە فەتارەت دەچێ.

**٢- لەسەر کاربەدەستان پێویستە، بەدادگەریی حوکمڕانیی بەسەر کۆمەڵگادا بکەن:**

خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ﴾ (النساء: ٥٨)

واتە: ئەی حوکمڕانان! بەرپرسان! هەرکات دادوەرییتان کرد لەنێوان خەڵکی دا، دادگەرانە بیکەن.

**٣- لەسەر کۆمەڵگا و کاربەدەستانیش فەرزە، کاروباریان بەڕاوێژ بەڕێوە بەرن:**

خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾ الشورى، کاروبار بەڕێوەبردنیان لە نێو خۆیاندا بە ڕاوێژە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران.

لە هەردووکیاندا، باسی ڕاوێژ هاتوە، یەکیان بۆ خەڵکە: (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) ئەوی دیکەیان بۆ حوکمڕانان و بەرپرسانە: (وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ) کە دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە (صلى الله عليه وسلم): لە کاروباردا پرس و ڕاوێژیان پێ بکە.

**٤- پێویستە مسوڵمانان فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەن، واتە: بەقورئان و سوننەتەوە پابەندبن و لە سنووری شەریعەتیشدا گوێڕایەڵیی بەرپرسانیان بکەن:**

خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەن و، هی کار بەدەستانێك کە لە خۆتانن.

بۆ کاربەدەستان وشەی (أَطِيعُواْ)ی بەکارنەهێناوە، چونکە خوای پەروەردگار فەرمانبەریی ڕەهای بۆ دەکرێ، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەبەر ئەوەی کە خوا فەرزی کردوە لەسەرمان بە قسەی بکەین و، فەرمانبەریی بکەین، ئەویش فەرمانبەریی سەربەخۆی بۆ دەکرێ، واتە: دەگونجێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شتێکمان پێ بفەرموێ، خوا نەیفەرمووبێ، لە قورئاندا، بەڵام کاربەدەستان بۆیان نیە داوای فەرمانبەریی لەخەڵك بکەن، مەگەر پابەند بن بەوەوە کە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، بۆیە فەرمانبەریی بۆ ئەوان (کاربەدەستان) سەربەخۆ نیە و، لەبەر ئەوەش وشەی (إطاعة)ی بەجیا بۆ بەکارنەهێناون.

**٥- لەسەر مسوڵمانان بەگشتی، بە کاربەدەستان و خەڵك و جەماوەرەوە، پێویستە کە هەر کات لەسەر شتێك کەوتنە مشتومڕ کێشەوە، بیگێڕنەوە بۆ لای تەرازووی قورئان و سوننەت:**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: {ئەی حوکمڕانان، بەرپرسان! کە ئەمانەتی حوکمڕانییتان لەلایەن خەڵك و جەماوەرە پێ سپێردراوە، کە بەپێی قورئان و سوننەت و شەریعەت وڵاتیان بۆ

ئیدارە بکەن و گرفت و کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەن}. هەرکات کەوتنە کێشەو مشتومڕەوە. {حوکمڕانان لەگەڵ خەڵك و جەماوەر، خەڵك لەنێو خۆیاندا، حوکمڕانان لە بەینی خۆیاندا، هەمووی دەگرێتەوە} بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا. {واتە: بۆ لای قورئان و سوننەت}. ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە هەم بۆ (دنیا) باشترە و، (هەم بۆ دوارۆژ) سەرەنجامی چاکترە.

شایانی گوتنە: لەبەرگی دووەمی مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) دا دە (١٠) دانەم هێناون لە: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا، لێرەش دا مەبەستم ئەوەیە کە جگە لەو بنەمایانەی دیاریی کراون، دەستی خەڵکی ئاوەڵایە، هەروەها لە چۆنیەتی پراکتیزە کردنی ئەو بنەمایانەشدا، دیسان دەستی خەڵك کراوەیە، مەگەر شتێك لەگەڵ دەقێکی شەرعیی دا تێك بگیرێ، ئەگەرنا خەڵك دەستی کراوەیە: چۆن دەوڵەت تەشکیل دەکەن؟ ئەو کاری ڕاوێژە چۆن ئەنجام دەدەن؟ چۆن بەرپرسەکان هەڵدەبژێرن؟ بە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ واتە: خەڵکەکە هەموویان کۆببنەوە، یان بە هەڵبژاردنی نوێنەرایەتیی، یان بە هەڵبژاردنی تێکەڵ لەڕاستەوخۆ و نوێنەرایەتیی؟! ئنجا ئیدارەدانی وڵات چۆن بێ؟ ...هتد، ئەوە هەمووی زۆر وردەکاریی تێدایە و، شەریعەت هەمووی بەبۆشایی بەجێهێشتوە و، هەر بڕیارو کارێکیش، مادام لەگەڵ دەقێکی شەرعیی دا تێك نەگیرێ، خەڵك و حوکمڕانان دەستیان ئاوەڵایە.

**وێنەی دووەم: لەو بوارەدا کە گۆڕانکاریی تێدا نیە:**

پێنج نوێژە فەرزەکان، ئیجماعیان لەسەرە‌و لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا (صلى الله عليه وسلم) هاتوون و، قورئانیش ئاماژەی پێداون، کە ئێمە لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج (٥) نوێژمان لەسەر فەرزن: (بەیانیی و نیوەڕۆو عەسرو شێوان و خەوتنان).

ڕکاتەکانی ئەو نوێژانەش هەموویان دیاریی کراون: بەیانیی دوو ڕکات، نیوەڕۆو عەسرو خەوتنان، یەکی چوار ڕکات، شێوانیش سێ ڕکات.

هەروەها کاتەکانی هەموانیش دیاریی کراون.

**وێنەی سێیەم: لەو بوارەدا کە گۆڕانکاری تێدا نیە:**

خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٦)ی سووڕەتی (المائدة)دا، زۆر بە وردیی باسی دەستنوێژ (وضوء)ی کردوە، خاڵی تێدا ختسۆتە سەر پیت، دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ....﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێ کە هەستان بۆ نوێژ، دەم و چاوتان بشۆن و، دەستتان بشۆن لەگەڵ ئانیشکتان و، مەسحی سەرتان بکەن (دەستی تەڕ بەسەرتاندا بێنن) پێیەکانیشتان بشۆن لەگەڵ هەردووك گوێزینگتان.

وەك دەبینن: خوای زاناوشارەزا شتێکی بچووکی وەك (دەستنوێژ)، ئەوەی کە لە کتێبەکانی (فِقه)دا هاتوە کە دەڵێ: (وفروض الوضوء ستة: النيّة، وَغسل الوَجهِ، وغسل اليَدَين مَع المِرفقين، وَمسح الرأس، وغَسل القَدمين معَ الكَعبَن، والتّرتيب)، هەر شەش (٦) واجبەکانی دەست نوێژ لەو ئایەتە موبارەکەدا باس کراون، چونکە دەستنوێژ بناغەی نوێژە، نوێژیش گرنگترین بەشی خواپەرستییە، خواپەرستیی کردەیی، هەڵبەتە چۆنیەتیی هەڵسوکەوت لەگەڵ خواشدا، دەبێ خوا خۆی دیاریی بکات، تەنانەت خوا سبحانە و تعالی بۆ پێغەمبەریشی (صلى الله عليه وسلم) بەجێ نەهێشتوە.

براو خوشکانی بەڕێز! جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە خوا سبحانە و تعالی دەستنوێژی زۆر بە ڕوونیی بەیەك ئایەت باس کردوە، بەڵام من کتێبی (فقه)م پێ شك دێ، یەك بەرگی لەسەر دەستنوێژ نووسیوە! ئنجا پێم وایە ئەو زۆر ورد کردنەوەو پێدا قوڵ بوونەوەیە، زیانی زۆری داوە و لەسەر حسابی شتەکانی دیکە بووە، ئێمە زۆر شتمان هەیە، پێویست بوو زانایان زۆری لێ بکۆڵنەوە، بەڵام لێکۆڵینەوەی باشی لەبارەوە نەکراوە، بەڵام هەندێك شتمان هەیە، پێویستیی نەدەکرد هێندەی بەدوادا بچن، کەچی زۆری لێکۆڵینەوە لەبارەوە کراوە، کە هەندێك جار ئەو زۆر لێ کۆڵینەوەو زۆر لێ ورد بوونەوەیە، کارەکەی لە خەڵك وە زەحمەت ختسوە.

باسی
سێیەم

## هۆکارەکانی نەرمیی و گونجاویی شەریعەتی ئیسلام

شەریعەتی ئیسلام لەبواری ئەو پێکهاتەیەدا کە گۆڕانی بەسەردا دێت، نەرمە، گونجاوە و خەڵك عاسێ ناکات، خەڵك ناخاتە سەغڵەتییەوە، با بزانین چۆن؟

ئێمە پێنج (٥) هۆکارمان باسکردوون لەبارەی نەرمیی و گونجاویی شەریعەتەوە، لەگەڵ ژیاندا، لەبواری هەڵسوکەوتەکان و، لەو بوارەدا، کە گۆڕانی بەسەردا دێت:

### ١- هەبوونی ناوچەیەکی ئازادو خاڵی لە دەق:

ناوچەیەکی فراوان هەیە، کە دەستی خەڵك تێیدا کراوەیە و، هیچ دەقی تێدا نەهاتوون، فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیە لەو بارەوە کە (حاكم) هێناویەتی و بە (صحيح)ی داناوە، زانایانیش زۆریان هێناویانە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {ما أحلَّه الله في كتابه فهو حلال، وما حرَّمه، فهو حرام، وما سكت عنه، فهو عَفوٌ، فاقبلوا مِن الله عافيتَهُ، فإنّ اللهَ لم يكن

لِيَنسى شيئاً، ثمَّ تَلا: (وَما كانَ رَبُّكَ نَسيّاً)}. قال الألباني: صحيح، في الجامع الصحيح رقم: (٢٢٥٦).

واتە: ئەوەی کە خوا حەڵاڵی کردوە، حەڵاڵە و، ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردوە، قەدەغەیە و، ئەوەی کە خوا لێی بێ دەنگ بووە {نە فەرموویەتی: حەڵاڵە و، نە فەرمووشیەتی: حەرامە} ئەوە ڕێپێدراوە و، ئەوەی کە خوا ڕێی پێداون، لێی وەربگرن، چونکە خوا ناگونجێ هیچ شتێکی لە بیر بچێت، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾ مريم، هەرگیز ناگونجێ پەروەردگارت شتی لە بیر بچێ.

یانی: ئەوەی کە خوا دیاریی کردوە: قەدەغەیە، هەر ئەوە قەدەغەیە و، ئەوەی کە فەرمووشیەتی: واجبە، هەر ئەوە واجبە و، ئەوەی دیکە هەمووی ڕەوایە، ئنجا ئایا ئەو ناوچەی بۆشاییە کە دەقی تێدا نین و، بەخاڵیی هێڵدراوەتەوە، بەچی پڕ دەکرێتەوە؟ بێگومان بە ئیجتیهاد، ئەو ئیجتیهادەش بەپلەی یەکەم (قیاس)ە، هەتا شافیعیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە کتێبی (الرسالة)ی خۆیدا، ناوی لە (ئیجتیهاد) ناوە (قیاس) و وشەی ئیجتیهادی بەکارنەهێناوە و، تەنیا وشەی (قیاس) بەکاردێنێ، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئیجتیهاد بەقیاس دەکرێ، بەڵام بە تەئکید ڕێیەکانی(إجتهاد) تەنیا قیاسیش نیە، بەڵکو (إستحسان) هەیە، (استصحاب) هەیە، (عُرف) هەیە، (سدّ الذرائع) هەیە، (شرع من قبلنا) هەیە، کەپێناسەی ئەوانە هەڵبەتە پێویستیی بە بواری باشتر دەکا، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە کتێبەکانی (أصول الفقه)دا ئەوانە باسکراون، ئنجا بۆیەش باسی (إجماع)م نەکرد، هەرچەندە بنچینەکانی شەریعەت، ئەوانەی هەموو زانایان لەسەریان یەك دەنگن، سەرچاوەکانی وەرگرتنی حوکمە شەرعییەکان، چوارن: قورئان و، سوننەت و، ئیجماع و، قیاس.

بەڵام باسی ئیجماعم نەکرد، لەبەر ئەوەی ئیجماع شتێکی ئیجتیهادیی نیە، کەبریتیە لەوەی: هاوەڵان لەسەر شتێك کۆبوونەتەوە، چونکە زۆر لە زانایان

دەڵێن: (یەکدەنگیی زانایان) تەنیا لەسەردەمی هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێ) یان ئەو پەڕی لەسەردەمی سەلەفی صالًح سێ سەدەکان (القرون الثلاثة)دا، بووە، بەڵام دوایی ئۆممەت زۆر بڵاو بووە و زانایانی جۆراو جۆر، لە شوێنانی جۆراو جۆرو دوور، پەیدا بوون، هەڵبەتە ڕای ڕاست ئەوەیە کە: یەکدەنگیی (إجماع) هەر هەیە و، ئێستاش بەشێوەیەکی تیۆریی (نظري) هەربەردەوامە و، هەرچۆن بێ، ئەگەر بەکردەوە ئیجماعیش بخەینەوە گەڕ، ئەویش یەکێك دەبێ لەهۆکارەکانی پڕکردنەوەی ئەو ناوچەیەی، کە بە بۆشایی بەجێ هێڵدراوە و دەقی تێدا نین.

## ٢- باسکردنی زۆر بابەت بەشێوەیەکی بنچینەیی و گشتیی:

شەریعەت فراوانەو ئیستیعابی هەموو گۆڕانکارییەکان دەکاو، نەرمەو لەگەڵ ژیان دا دەگونجێ، بە هۆی ئەم بنەمای دووەمیشەوە، کە بریتیە لە باسکردنی زۆر لە بابەتەکان، بەشێوەیەکی بنچینەیی و گشتیی، بۆ وێنە: خوا سبحانه و تعالی وەك بنەماو بەهایەکی زۆر گەورەو گرنگ باسی دادگەریی دەکات:

١)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ (٩٠) النحل، واتە: خوا فەرمانی کردوە بە دادگەریی.

٢)- ﴿وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ﴾ الشورى (١٥)، واتە: فەرمانم پێکراوە لە نێوانتاندا دادگەر بم.

٣)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ (١٣٥) النساء، واتە: ئەی بڕوادارینە! چاك بە دادگەریی هەڵسن..

٤)- ﴿وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ (٥٨) النساء، هەر کات دادوەرییتان لە نێوان خەڵکی دا کرد، دادگەرانە بیکەن.

٥)- ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ﴾ (٢٦)ص، واتە: لە نێوان خەڵك دا بە هەق حوکم بکەو، شوێن ئارەزوو مەکەوە..

٦ـ فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم): {الْقُضَاةُ ثَلَاثَةٌ، اثْنَانِ فِي النَّارِ وَوَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ، رَجُلٌ عَلِمَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ، فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ، وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ، فَهُوَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ جَارَ فِي الْحُكْمِ، فَهُوَ فِي النَّارِ...} أخرجه أبو داود برقم (٣٥٧٣)، والترمذي برقم (١٣٢٢)، والنسائي في الكبرى برقم (٥٩٢٢)، وابن ماجه برقم (٢٣١٥)، والطبراني برقم (١١٥٤)، والحاكم برقم (٧٠١٢) وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي برقم (٢٠١٤١)، قال الألباني: صحيح.

واتە: دادوەرەکان سێن: یەکێکیان لە بەهەشتە، دووانیشیان لە ئاگری دۆزەخدان، پیاوێك کە حەقی ناسیوەو بەحەقیش دادوەریی کردوە، ئەوە بەهەشتییە و، پیاوێك کە حەقی ناسیوە، بەڵام بە ناحەق دادوەریی کردوە، ئەوە دۆزەخییە و، پیاوێکیش بەنەزانیی دادوەریی کردوە، بەبێ ئەوەی حەق بناسێ، ئەوەش هەر دۆزەخییە.

مەبەستم ئەوەیە، خوا باسی دادگەریی کردوە، بەڵام کوا وردەکارییەکانی؟! بە گشتیی باسی کردوە، بۆ وێنە: ئێستا دادوەریی (قضاء) کە بەرەو پێش چووە، بەلای کەمەوە سێ پلەی هەیە: (إبتدائي، إستئناف، تمييز) و زۆر وردەکاریی دیکەش هەیە، بەڵام، شەریعەت نەچۆتە نێو ئەوانەوە و لێی گەڕاوە بۆ گەشەسەندنی ژیان، گرنگ ئەوەیە چوار چێوەیەکی فراوانی بۆ داناوە، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ دادگەریی بچەسپێندرێ، بەڵام چۆن بچەسپێندرێ؟ ئایا دادوەریی کردن، دابەش بێ بۆ سێ پلە، یان هەر یەك پلە بێ، چۆن بێ و چۆن نەبێ؟ شەریعەت دەست و پێی خەڵکی نەبەستوە و چۆن باشتر دادگەریی دەچەسپێ، با بەوشێوەیەی لێ بکەن، چونکە: دادگەریی لەکوێ بێ، شەریعەت لەوێیە (أينما وُجِدَ العدلُ فثم الشرعُ).

## ٣- گشتگیریی دەقەکان لەڕووی مانا هەڵگرتن و، تێگەیشتنی جۆراو جۆرەوە:

دەقەکانی قورئان، هەروەها دەقەکانی سوننەتیش، بەڵام بەتایبەتی دەقەکانی قورئان، زۆر جار دەقی وا هەیە، چەندان واتا هەڵدەگرێ، کە ئێستا دەرفەت نیە نموونەی زۆر بێنمەوە و، تەنیا دوو نموونان دێنمەوە:

**یەك:** خوای پەروەردگار باسی ئافرەتانی تەڵاق دراو دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ ﴾ (البقرة:٢٢٨).

واتە: ئافرەتانی تەڵاقدراو چاوەڕێی خۆیان دەکەن، هەتا ماوەی سێ (قُرْء).

ئنجا (قُرْء) هەم بە مانای حەیز هاتوە و، هەم بەمانای پاکبوونەوەی دوای بێ نوێژییش هاتوە، ئیدی هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئاوایە و، هەندێکیش دەڵێن: ئاوایە، چونکە لە زمانی عەرەبییدا وشەی (قُرْء)، دوو واتای هەن، خوا دەیتوانی بفەرموێ: {(ثَلاثَةَ أَطهارٍ)، یان (ثَلاثُ حَيْضاتٍ)}، بەڵام فەرموویەتی: (ثَلاثَةَ قُروْء) بۆ ئەوەی هەردووك واتایەکە هەڵبگرێ.

**دوو:** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە جەنگی (خەندەق)دا فەرمووی: {لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ} أخرجه البخاري برقم (٣٨٩٣)، واتە: [هەر کەسێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکات]، با نوێژی عەسر نەکات، مەگەر لەلای (بني قريظة).

هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) بوونە دووبەش: هەندێکیان گوتیان: مەبەستی ئەوەبووە: خێرایی بکەین و بڕۆین، بۆیە نوێژەکانمان دەکەین و بەخێرایی دەڕۆین، ئەوانە نێوەڕۆکی دەقەکەیان گرت: (عَمِلوا بِفَحوَى النّص)، وەك زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن، نێوەڕۆکەکەیان گرت، جەوهەرەکەیان گرت.

ئەوانی دیکەش گوتیان: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێ فەرمانبەریی خواو، پێغەمبەری خوا دەکات، با نوێژی عەسر نەکات مەگەر لە (بني قريظة)، ئێمە نوێژەکان دەبەینە ئەوێ، ئنجا هەتا گەیشتنە ئەوێ، نوێژی شێوانیش بووو، نەك هەر نوێژی عەسرەکەیان چوو بوو!

گێڕەرەوە (راوي) دەڵێ: {فَلَمْ يُعَنِّفْ رسولُ الله وَاحِدًا مِنْهُمْ}، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت، چونکە هەردوو لایان ئەو فەرمانەی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) جێ بەجێ کردوە، یەکیان ڕواڵەتی فەرمانەکەی وەرگرتوە و، ئەوەی دیکەیان، نێوەڕۆکەکەی و ئامانجەکەی، بەڵام ئایا کامیان پێکابووی؟ بە بۆچوونی من: ئەوانەیان کە ئیشیان بە نێوەڕۆکەکەی کردوە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی ئەوەنەبووە کە نوێژی عەسریان بەرنە ئەوێ، چونکە ئەو سەفەرە شتێکی پەرستشیی (تعبّدي) نەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەوەبووە کە خێرایی بکەن لە چوونیاندا بۆ لای هۆزی (بني قريظة)، بۆیە ئەوانە زیاتر پێکاویانە، کە نوێژەکەیان کردوە و، بەپەلەش چوون، بەڵام ئەوانەش کە وا تێگەیشتوون: نوێژەکەیان بەرنە ئەوێ، لەبەر ئەوەی دەقەکە ئەو واتایەش هەڵدەگرێ، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕەخنەی لەوانیش نەگرت.

## ٤- ڕەچاو کردنی حاڵەتی تێگیران و ناچاریی و حاڵەتە نائاساییەکان:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی ئەوەیە کە شەریعەت فراوان بێت و، ئیستیعابی گۆڕانکارییەکان بکات، لەبەردەم پەرەسانندنەکانی ژیان و کۆمەڵگادا دانەمێنێ، بۆیە هەر کاتێك سەغڵەتیی و ناچاریی و حاڵەتی نائاسایی بوو، حوکمی نائاسایی دێتە پێش.

با تەماشای ئەم چەند دەقە بکەین:

١- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾ (١٨٥) البقرة.

واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و، قورسیی و زەحمەتی بۆتان ناوێ.

جاری وایە دەچم بۆ لای هەندێك نەخۆش، تەماشا دەکەم: حاڵەتەکەی وایە: ئەوە هیچ کە بەپێوە نوێژی بۆ ناکرێ، بگرە بە دانیشتنەوەش بۆی ناکرێ، هەروەها دەستنوێژی بۆ ناگیرێ، نەخۆشییەکەی وایە و دەبێ تەیەممومم بکات، خوای زاناو شارەزاش بۆ ئەوانە هەموویان دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ﴾، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ، یانی: بۆ ئەو چۆن ئاسانەو بۆی دەکرێ، دەبێ ئەوەی بۆ دابنێی.

فەرموودەکەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم): {صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ} أخرجه أحمد برقم (١٩٨٣٢)، والبخاري برقم (١٠٦٦ )، وأبو داود برقم (٩٥٢)، والترمذي برقم (٣٧٢ )، وابن ماجه برقم (١٢٢٣)، واتە: بە پێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتتوانی، بە دانیشتنەوە، ئەگەر نەتتوانی لەسەر کەلەکە.

فەرموودەکە لەو بارەوە زۆر ڕوونە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ئەم دەقە سوننەتیش نەبووایە، ئایاتەکە بەتەنیا بەس بوو لەوبارەوە.

٢- خوای زاناو شارەزا لەسوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)دا فەرموویەتی: ﴿هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾.

واتە: خوا ئێوەی هەڵبژاردوە و، لەدیندا سەغڵەتیی نەخستۆتە سەرتان، بۆیە زانایان دەڵێن: هەر شتێك بوو بە مایەی سەغڵەتیی، لەشەریعەت نیە و شەریعەت پێویستی نەكردوە.

بەڵام: سەغڵەتیی جیایەو، ماندووبوون جیایە، بۆ وێنە: هەمووومان كە بەرۆژوو دەبین، رۆژووی سوننەت و فەرز، تینوومان دەبێ و برسییمان دەبێ، ماندوو بوون جیایە، بەڵام سەغڵەتیی ئەوەیە كە تۆ عاسێ ببی، تێ بگیرێی، هیچت بۆ نەكرێ.

بەسەرهاتێك لەوبارەوە:

كۆمەڵێك لەهاوەڵان لە جەنگێك دەبن و یەكیان سەری دەشكێ، دیارە سەری زۆر خراپ شكاوە، شەویش ئیحتیلامی دەبێ، پرس دەكا بە ڕەفیقەكانی دەڵێ: ئەرێ بوار هەیە خۆم نەشۆم؟ {لە برینەكەم دەترسێم برینەكەم قووڵە}[1] دەڵێن: نەخێر هیچ مەجالی تێدا نیە {دیارە شارەزا نەبوون} دەبێ هەر خۆت بشۆی {بۆئەوەی غوسڵەكەت لە خۆت دەربكەی، ئنجا نوێژ بكەی} ئەویش خۆی دەشواو دوایی دەمرێ، كە دەگەڕێنەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {قَتَلُوهُ قَتَلَهُمْ اللَّهُ، أَلَا سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا، فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ} أخرجه أبو داود برقم (٣٣٦)، والدارقطني (١٨٩/١).

واتە: كوشتیان، خوا بیانكوژێ، كە نەیاندەزانی دەبووایە پرسیبایان، بێگومان چارەسەری نەزانیی پرسیاركردنە.

{خوا بیانكوژێ واتە: وەك چۆن دەڵێی: بێ قەزابی! یان مردووت مرێ! وشەیەكی ئاوایە، نەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموبیەتی: خوا لەبەینیان بەرێ! بەڵكو عەرەب عادەتیان وا بووە كە ئەو وشەیە بەكاربێنن،

---

(١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێ: ماڵ خراپ، كە بێگومان مانا حەقیقییەكەی مەبەست نیە و، مانایەكی عورفیی هەیە}.

واتە: بۆی هەبوو تەیەممووم بكا، بۆ غوسڵەكەی، مادام حاڵەتەكەی وابووە.

بەسەرهاتێكی دیكە لەوبارەوە:

عەمری كوڕی عاص پیاوێكی زۆر بلیمەت بوو، بەڵام بەداخەوە خۆی و موعاویەی كوڕی ئەبوسوفیان لەدژی (عەلی كوڕی ئەبو طالیب) خوا لێی ڕازی بێ، تووشی غەڵەت بوون خوا لێیان خۆش بێ، (عەمر) بەرپرسی هێزێكی عەسكەریی دەبێ و دەچن بۆ چالاكییەك، دوایی لەوێ شەوێ ئیحتیلامی دەبێ، ئنجا بەهاوەڵان دەڵێ: كە حاڵەتێكی وام هەیە و تەیەممووم دەكەم، ئیدی بۆ غوسڵەكەی تەیەممووم دەكات، ئەگەرنا بۆ دەست نوێژەكەی كێشەی نەبووە، ئنجا پێش نوێژییشیان بۆ دەكات لە نوێژی بەیانیی دا و، دەگەڕێنەوە، كە دەگەڕێنەوە دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) (عەمری كوڕی عاص) پێش نوێژیی بۆ كردین و خۆ شۆردنیشی لەسەر بوو، بەڵام تەیەممومی كرد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئایا پێش نوێژییت بۆ كردن لە حاڵێكدا كە لەش پیسیش بووی؟ {واتە: خۆت نەشۆردبوو} ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! تەماشام كرد خوا دەفەرموێ :

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ النساء.

واتە: خۆتان مەكوژن خوا لەگەڵتاندا بەبەزەییە، منیش ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بمرم، هێندە ساردبوو، {دیارە ئاویشیان بۆ گەرم نەكراوە و شار نەبووە} {فضحك رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ولم يُقلْ شيئاً} واتە: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) پێ كەنی و هیچی نەفەرموو[1]. {پێكەنی یانی: لە وەڵامەكەی عەمر ڕازی بوو}.

---

(١) بەسەرهاتەكە لە كتێبەكانی (سنن)دا بەم شێوەیە هاتوە: {عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السُّلَاسِلِ، فَأَشْفَقْتُ إِنْ اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ، فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (يَا عَمْرُو صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ؟) فَأَخْبَرْتُهُ

کەواتە: بۆ حاڵەتی ناچاریی و نائاسایی لە شەریعەتدا، حوکمی ڕیزپەڕ و تایبەت و نائاسایی هەیە.

٣- لەسووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٧٣) دا، هاتوە، کەهەمان مەبەست لە سێ شوێنی دیکەش لە قورئاندا هاتوە، خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ﴾ البقرة.

واتە: بێگومان خوا: مرداربوو و، خوێن و، گۆشتی بەراز و، بۆ جگەلە خوا سەربڕاوی، لێتان قەدەغە کردوە، بەڵام هەر کەسێ تێگیرا، بەمەرجێك بە مەبەستەوە نەخوات و، لە ئەندازەی پێویست تێ نەپەڕێنێ، گوناهی ناگاتێ.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ} أخرجه أحمد برقم (٥٨٦٦)، والبزار كما في كشف الأستار برقم (٩٨٨)، والطبراني في الأوسط برقم (٥٣٠٢)، قال الهيثمي (١٦٢/٣): رواه أحمد، ورجاله رجال الصحيح، والبزار والطبراني فى الأوسط وإسناده حسن، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح.

واتە: خوا حەز دەکاو پێی خۆشە مۆڵەتەکانی لێ وەربگیرێن، هەروەك چۆن پێی خۆشە فەرزەکانی جێ بەجێ بکرێن.

سبحان الله! هی وا هەیە دەیەوێ: لە شەریعەت بەولاوەتر بچێ و، لە ئیسلام ئیسلامتر بێ، شەریعەت پێی دەڵێ: دەرفەتت هەیەو مۆڵەتە! کەچی دەڵێ: ئیش بە مۆڵەت ناکەم! بەڵام تەنانەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش خۆی جاری وا بووە، ئیشی بەمۆڵەت کردوە، بۆ وێنە: فەتحی مەککە لەمانگی ڕەمەزان دابوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئاوم بۆ

---

بِالَّذِي مَنَعَنِي مِنْ الإِغْتِسَالِ وَقُلْتُ: (إِنِّي سَمِعْتُ اللَّهَ يَقُولُ: وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا}، أخرجه أبو داود برقم: (٣٣٤)، وأحمد برقم: (١٧٣٥٦). وقال الألباني: صحيح.

بێنن، ئاویان بۆ هێناو خواردیەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) هەندێکیان هەر ڕۆژوویان نەشکاندوە، ئەویش دوو جاران فەرمووی: {أولئك العصاة} واتە: ئەوانە سەرپێچییکارن[1]، بۆچی وای فەرمووە؟ چونکە: ئەوان بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی گەورەو گرنگتر دەچن کە ئازادکردنی مەککەیە و، پێویستە تین و تاقەتیان هەبێ، بۆیە فەرمووی: ئەوانە سەرپێچییکارن، بەڵێ نابێ هەوڵبدەی تۆ لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە تەقواتر بی! چونکە تێپەڕاندن لە پێغەمبەری خوا، دژ و پێچەوانەی تەقوایە.

سبحان الله! زۆر جار بەشەر سروشت (طبع)ی خۆی لەجێی شەریعەت دادەنێ، عەقڵی خۆی لەجێی نەقڵ دادەنێ، مەرج نیە تەنیا بەباری شلگیرییدا، جاری وایە بەباری توندگیریی دا، چونکە بێگومان لادان لەدین، هەر لادانە، چ لێی بەجێبمێنی، چ لێی تێپەڕێنی، چ کورتی بێنی، چ زێدەڕۆیی بکەی، لادان هەر لادانە.




---

(١) درێژەی بەسەرهاتەکە بەم شێوەیە: {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَامَ الْفَتْحِ إِلَى مَكَّةَ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ، فَصَامَ النَّاسُ، ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ، فَرَفَعَهُ حَتَّى نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ، فَقِيلَ لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ: إِنَّ بَعْضَ النَّاسِ قَدْ صَامَ، فَقَالَ: أُولَئِكَ الْعُصَاةُ أُولَئِكَ الْعُصَاةُ}, أخرجه أحمد برقم (٢٣٥٠)، ومسلم برقم (١١٤). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري.

## ٥- گۆڕانی فەتوا بەهۆی گۆڕانی کات و شوێن و عورفەوە:

هەر کاتێك: کات، شوێن، عورف، ژینگە، کەس...هتد، گۆڕان، فەتوایەکەش دەگۆڕێ، زانایان زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە، ئێمە سێ قسەی زانایان بەنموونە دێنینەوە:

١- ئەو قسەیەی (القرافي)م زۆر پێ جوانە کە دەڵێ: {إن إجراء الأحكام التي مدركها العوائد، مع تغيير تلك العوائد: خلاف الإجماع، وجَهَالةٌ في الدين، بل كُل ما في الشريعة يَتبع العَوائدَ، يتَغيَّرُ الحُكم فيه عند تغيُّرِ العادةِ إلى ما تقتضيه العادةُ المُتجَدِّدة... وكذلك الإطلاق في الوصايا والأيمان وجميع أبواب الفقه المحمولة على العوائِد، إذا تَغَيّرتِ العادَة، تغيّرتِ الأحكام في تلك الأبواب}[١].

واتە: جێ بەجێ کردنی حوکمە شەرعییەکان، کە پەیوەستن بەعورف و عادەت و نەریتەکانەوە، لەگەڵ ئەوەش دا کە ئەو عورف و عادەتانە گۆڕاون، کەچی هەر حوکمە شەرعییەکە جێ بەجێ بکرێ، ئەوە پێچەوانەی یەکدەنگیی زانایانە و، مایەی نەزانیی و نەشارەزاییە لەدین {هەندێ کەس هەیە دەڵێ: ئەگەر خوێن سەران بەرێ و، دنیا تێك بچێ، من ئەو کارە هەر جێبەجێ دەکەم، ئەگەر زەرەریشی لەقازانجی زیاتر بێت، یان ئەگەر وەزعەکەش گۆڕا بێ}[٢]، هەرچی لە شەریعەتدا هەیەو پەیوەستە بە عادەت و نەریتەکانەوە، حوکم تێیدا دەگۆڕێ، لەکاتێکدا ئەو عادەتە گۆڕا، بەرەو عادەتێکی تازە کە پەیدا بووە، هەروەها وەسیەتەکان و سوێند خواردنەکان و هەموو بابەتەکانی فیقە، کە پەیوەستن بە عورف و عادەتەوە، ئەگەر عادەتەکە گۆڕا، ژینگەکە گۆڕا، هەل و مەرجەکە گۆڕا، ئەو حوکمانەش دەگۆڕێن.

---

(١) الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرفات القاضي والإمام، ص (٣١٨ – ٣١٩).

(٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

٢- (ابن قيم الجوزية)ش لەو بارەوە دەڵێ: {الأحكام نوعان: نوع لا يتغير عن حالة واحدة هو عليها، لا بحسب الأزمنة، ولا الأمكنة ولا اجتهاد الأئمة، كوجوب الواجبات، وتحريم المحرمات، والحدود المقدرة بالشرع على الجرائم ونحو ذلك، فهذا لا يتطرق إليه تغيير ولا اجتهاد يخالف ما وضع عليه.

والنوع الثـانـي:

ما يتغير بحسب اقتضاء المصلحة له زماناً، ومكاناً، وحالاً، كمقادير التعزيرات، وأجناسها، وصفاتها، فإن الشارع ينَوِّع فيها بحسب المصلحة}.[1]

واتە: حوكمە شەرعییەکان دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:**

لەسەر یەك حاڵەتن و ناگۆڕێن، نە بەهۆی گۆڕانی کاتەوە، نە بەهۆی شوێنەکانەوە، نە بەهۆی تێکۆشان و هەڵهێنجانی پێشەوایانەوە، وەك ئەو شتانەی کە خوا فەرزی کردوون {نوێژ فەرزە، زەکات فەرزە}، هەروەها قەدەغەکردنی قەدەغەکان {بۆ نموونە: زینا قەدەغەیە، دزیی قەدەغەیە، ڕیبا قەدەغەیە}، هەروەها ئەو سزایانەی کە دیاریی کراون لەسەر تاوانەکان {وەك: سزای دەست بڕین، سزای ڕێگریی، سزای داوێن پیسیی، سزای قەتڵ} و وێنەی ئەوانە، ئەوە جۆری یەکەم، ئەوانە گۆڕان و ئیجتیهاد ڕوویان تێناکات.

**جۆری دووەم:**

بەپێی گۆڕانی بەرژەوەندیی دەگۆڕێن، بەگوێرەی کات شوێن و حاڵ.

{جاری وا هەیە بەرژەوەندیی لەڕۆژگارێکدا بەجۆرێك هاتۆتە دی، کە ڕۆژگارەکە گۆڕا، بەجۆرێکی دیکە دێتە دی، لەشوێنێکدا بەجۆرێك و، کە شوێنەکە گۆڕا، بە جۆرێکی دیکە، لەحاڵێك دا بە جۆرێك و، کەحاڵەکە گۆڕا بە

---

(١) إغاثة اللهفان من مصائد الشيطان، ج١، ص٣٤٦.

جۆرێکی دیکە}[1]، وەك ئەندازەی سزای تەمبێ کردنەکان و جۆر و شێوەکانیان، چونکە شەریعەت بەگوێرەی بەرژەوەندیی جۆراوجۆری کردووە.

بۆ وێنە: دەربارەی سزای مەی خۆریی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دیاریی نەکردوە و، کەسێك کە شەرابی دەخواردەوە، بە نەعل و بەبەرگی خۆیان لێیان دەدا و سزایان دەدا، لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دیاریی کراو نەبوو، دوایی لە سەردەمی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) و، ماوەیەکیش لە سەردەمی عومەردا (رضي الله عنه) چل (٤٠) قامچییان لێ دەدا، پاشان تەماشایان کرد: خەڵك زیاتر ڕووی کردبووە مەی خۆریی، عومەر (رضي الله عنه) ڕاوێژی کرد، گوتی: با سزایەکیان بۆ دابنێین ئەو خەڵکە بپرینگێتەوە، ئیدی کردیان بە هەشتا(٨٠) قامچی، عەلی (رضي الله عنه) پێشنیاری کرد گوتی: کابرا کە سەرخۆش بوو، قسەی بێجێ دەکات، لە قسەی بێجێ لەوانەیە بوختان بەئافرەتێك، یان بەپیاوێك بکا، کە بوختانیشی کرد، ئەگەر چوار شاهێدی پێ پەیدا نەبوون، دەبێ (٨٠) قامچی لێ بدرێ، بۆیە پێم وایە: (٨٠) قامچی باشە، کەواتە: ئەو سزایە ئیجتیهادیی بووە، ئەو کاتە بەرژەوەندیی وای خواستوە.

٣- (ابن قدامة الحنبلي) دەڵێ: {قَسَّم رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) أرض خيبر، لكن امتنع عمر بن الخطاب عن تقسيم سواد العراق، لأن النبـي فعل ما هو الأصلح في زمنه، وعمر فعل ما هو الأصلح في زمنِهِ}[2] واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك {سەرزەمینی خەیبەری لەوجوولەکانە گرت کە پەیمانیان شکاند و غەدریان کرد} سەرزەمینی خەیبەری دابەش کرد بەسەر جەنگاوەرەکاندا، وەك دەستکەوتی جەنگیی، بەڵام عومەر (رضي الله عنه) ڕەشایی عێراق {ئەو دەشتە ڕەشەی عێراق کە لەبەر سەوزییان ڕەش دەچوو، زۆر بە پیت و زۆر پڕ بەرەکەت بوو، نێوان دیجلەو فوڕات}ی دابەش نەکرد بەسەر جەنگاوەرەکاندا،

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) المغني، ج٤، ص ١٨٩، (فقه الجهاد) د. يوسف القرضاوي، ج٢ ص٩٨٦.

چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژگاری خۆیدا، ئەوەی کردوە کە بەچاکی زانیوە و، عومەریش ئەوەی کردوە کە پێی وابووە بەرژەوەندیی پێ دێتە دی.

واتە: عومەر نەیگوتوە: مادام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای کردوە، دەبێ منیش وا بکەم! ئنجا کاتێکیش هەندێك لەهاوەڵان گوتیان: ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەرزەمینی خەیبەری دابەش نەکرد! تۆش بۆچی هی عێراقمان نادەیە؟ گوتی: عەقڵم نایبڕێ و، ئەوەی خەیبەر شتێکی جیا بوو، شوێنێکی دیاریی کراو بوو، بەڵام سەرزەمینی عێراق شوێنێکی فراوان و گشتییە و، بەڵگەی عەقڵیی دەهێنایەوە، دەیگوت: ئەگەر من ئەو شوێنە بدەم بەئێوە، ئەو شوێنانەی دیکە کە دەگیرێن، پێویستییان بە واریداتی ئەو شوێنە دەبێ، واتە: ئەگەر ئەوشوێنە بدەم بە چەند کەسێکی دیاریی کراو، هەموویان دەبنە دەوڵەمەند! بەڵام دوایی سوپا چۆن تەجهیز بکرێ؟ ئنجا ڕەنگە زۆر وڵاتی دیکە بگرین و ئازاد بکەین، بەڕێوەبردن و ئیدارەدانیان، پەکی بکەوێ لەسەر ئەو واریداتەی لەم وڵاتە پەیدا دەبێ!

دواییش بەڵگەی خۆی هێنایەوە، لە ئایەتەکانی: (٧،٨،٩،١٠)ی سووڕەتی (الحشر) کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ۝٧ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ۝٨ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ۝٩ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ .... ۝١٠ ﴾.

ئیدی ئەو ئایەتانەی بە بەڵگە هێنایەوە، لەسەر ئەوە کە (فيء) پشك و بەشی هەرکام لە کۆچکەران (مهاجرين) و پشتیوانان (أنصار) و ئەوانەی لە دوایانەوە دێن (الذين جاءوا من بعدهم)ە، کە سەرجەم مسوڵمانانی دوای کۆچکەران و پشتیوانان دەگرێتەوە، تاکو دنیا بە کۆتا دێ.

ئنجا گوتی: بۆیە پویستە کارێکی وا بکەین، ئەو واریداتە بەشی هەمووان بکات، نەك دابەش بکرێ بەسەر چەند کەسێکی دیاریی کراودا.

دوو نموونەی هاوچەرخ لەبارەی گۆڕانی حوکمەوە بەهۆی گۆڕانی هەل و مەرج و واقیعەوە:

**نموونەی یەکەم:**

حوکمی سەفەر کردنی ئافرەت بەبێ مەحرەم:

١- لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیە:{لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، إلاّ مَعَ ذي مَحْرَمٍ عَلَيْها} أخرجه مالك برقم (١٧٦٦)، وأحمد برقم (١٠٤٠٦)، والبخاري برقم (١٠٣٨)، ومسلم برقم (١٣٣٩)، وأبو داود برقم (١٧٢٣)، والترمذي برقم (١١٧٠) وقال: حسن صحيح.

واتە: حەڵاڵ نیە بۆ ئافرەتێك کە بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، ماوەی شەوو ڕۆژێك سەفەر بکات، مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت. {کەسێك کە پێی نەشێ وەك باب و کوڕو براو ئەوانە، یاخود کەسێك کە هاوسەری بێت}.

٢- هەروەها فەرموودەیەکی دیکەش هەیە، دەفەرموێ: {عَن العَدي بن حاتم أن النبـي (صلى الله عليه وسلم) قال له: (فَإِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرْتَحِلُ مِنْ الْحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالْكَعْبَةِ، لَا تَخَافُ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ)} أخرجه البخاري برقم (٣٤٠).

واتە: ئەی عەدی کوڕی حاتەم! (رضي الله عنه) ئەگەر ژیانت بەردەوام بێ {دوایی ئەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووە، بینیویەتی و زانیویەتی، خوای زاناو شارەزا ئاگاداری کردۆتەوە کە ژیانەکەی تا ئەو

کاتەی دەیبینێ، بەردەوام دەبێ}، ئافرەتی کەژاوەدار {ئافرەتێك کە لە کەژاوەدایەو سواری حوشترێکە} بەتاقی تەنیا لە حیرەوە دەچێ تەوافی کەعبە دەکا و، بێجگە لە خوا ترسی لە کەس نیە.

لەریوایەتی دیکەدا هاتوە: (بەس ترسی لەخوا هەیەو، ترسیشی لە گورگ هەیە، ئەگەر رانە مەرێکی پێ بێ، گورگ زەفەری پێ بەرێ).

ئەم فەرموودەیەش ئاماژە بەوە دەکات کە دەگونجێ ئافرەت بەتەنیا سەفەری دووریش بکات، لەکاتێك دا کە وڵات هێمن و ئەمانەو هیچ مەترسیی لەسەر نیە، کەواتە: ئەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: نابێ ئافرەت بەبێ مەحرەم سەفەر بکات، لەبەر مەترسییە، بەڵام ئەگەر مەترسیی نەبوو، ئەوەتا بۆخۆی فەرموویەتی: ئافرەتێکی کەژاوەداری حوشتر سوار، لە حیرەوە دەچێ بۆ مەککە، حەج و عومرە دەکات و، بێجگە لەخوا ترسی کەسی لەسەر نیە.

٣- لە دەقێکی دیکەدا هاتوە: {أَذِن أميرُ المؤمنين عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) لأمهات المؤمنين أن يسافِرْن إلى الحج مع الرفقة المُؤَمِّنة، وأرسل مَعَهنّ عثمان بن عفان (رضي الله عنه) وعبدالرحمن بن عوف (رضي الله عنه)} أخرجه البخاري برقم (١٧٦١) والبيهقي (٤/ ٣٢٦-٣٢٧).

واتە: فەرماندەی بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) مۆڵەتی دا بە دایکانی بڕواداران، کە سەفەر بکەن بۆ حەج لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێکی دڵنیاکەردا {واتە: ئەهلی ئەمانەت} و، عوثمانی کوڕی عەففان و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفیشی لەگەڵ ناردن {کە مەحرەمیان نەبوون}.

کەواتە: کۆمەڵە ئافرەتێك کە لێك دڵنیابن و پێکەوە بن و، هیچ مەترسییان لەسەر نەبێ، دروستە پێکەوە سەفەری دووریش بکەن بەبێ مەحرەم.

لێرەدا قسەیەکی (المجلس الأوربي للإفتاء والبحوث)تان بۆ دێنم، لە کتێبی (القرارات والفتاوى)، لاپەڕە (٣٥٥و٣٥٦)دا، چونکە ئەوان کۆمەڵێك زانای

گەورەی موعتەبەرن و کەسانی وەك: (د. یوسف القرضاوي و، عبدالله بن یوسف الجدیع و، عبدالله بن بيّه و د. علي قەرەداغي) یان لەنێودان، دوای هێنانەوەی چەند فەرموودەیەك و چەند قسەیەك، گوتراوە:{...وهذا يؤكد أنّ العِلّة هي الخوف، فإن تحقّق الأَمْنُ، وانعدم الخوفُ، جاز للمرأة أن تسافر، خاصةً إذا نظرنا إلى سهولة السفر في الوقت الحاضر، وأصبح السفر في الطائرات والقطارات والحافلات، وفي جميع هذه الوسائل، تتحقق الرفقة ويتحقق الأمن للمرأة المسلمة..

أما إذا كان السفر يتطلّب إقامة مُدّة معيّنة، فالأصل في هذه الحالة أن تسافر المرأة مع مَحرمٍ لها، أو تقيم المدّة المطلوبة مع أُسرة مسلمة في ذلك البلد، سدّاً لذريعة الفتنة، أو الأذى قد يحصل للمرأة}.

واتە: ئەمە (ئەم چەند فەرموودەیە) ئەوە دەگەیەنن: هۆکاری ئەوە کە نابێ ئافرەت بە تەنێ سەفەر بکات، بریتیە لە: مەترسیی، ئنجا ئەگەر هێمنیی و ئاساییش هەبوو و، جێگای مەترسیی نەبوو، دروستە ئافرەت سەفەر بکات، بە تایبەتی ئەگەر تەماشای ئاسانیی سەفەرو هاتووچۆ بکەین، لەکاتی ئێستاماندا، کە سەفەر بە فڕۆکە و شەمەندەفەر و پاسانەو، لە هەموو ئەو هۆکارانەی هاتووچۆشدا، هەم کۆمەڵە خەڵکێك کە لەیەکدی ئەمینن و، هەم هێمنیی و ئاسایش، بۆ ئافرەتی مسڵمان دەستەبەر دەبن.

بەڵام ئەگەر سەفەرەکە پێویستیی بەوە بوو، ئەو ئافرەتە ماوەیەك بمێنێتەوە لەو شوێنە، وا باشترە ئەو ئافرەتە لەگەڵ مەحرەمێکی خۆیدا سەفەر بکا، یاخود لەو شوێنەی کە بۆی دەچێ، لەگەڵ خێزانێکی مسوڵمان بێ لەو ماوەیەدا، بۆ ئەوەی ڕێگا بگیرێ لە فیتنە و، لە مەترسییەك کە ئەو ئافرەتە دێتە ڕێی.

نموونەی دووەم:

مەسەلەی نرخ لەسەر شت دانان (التسعیر):

{عن أَنَسٍ قَالَ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! غَلَا السِّعْرُ فَسَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ، وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يُطَالِبُنِي بِمَظْلَمَةٍ فِي دَمٍ وَلَا مَالٍ)} أخرجه أبو داود برقم (٣٤٥١)، وقال الألباني صحيح.

واتە: ئەنەس (رضي الله عنه) دەڵێ: خەڵك بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) نرخمان بۆ لەسەر شت دابنێ، چونکە نرخەکان زۆر گران بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بێگومان خوای بەرز هەر بۆخۆی نرخ دادەنێ و، هەر بۆخۆی ڕزق کەم دەکات و فراوان دەکات، منیش دەمەوێ بگەمە خزمەت خوا و یەکێ لە ئێوە نە حەقێکی خوێنی لەسەر من هەبێ، نە هەقێکی ماڵ. {واتە: دەترسم نرخ لەسەر شت دابنێم و، کابرای فرۆشیار بتوانێ بە زیاتری بدات و، زەرەرو زیانێکی لێ بدەم}.

ئنجا لە (موطأ)ی (مالك)دا هاتوە: {وفي الآثار جواز العمل بالتسعير من الحاكِم، وبه قال: ابن عمر وسالم بن عبدالله، والقاسم بن محمد، وَمَنْ أجازه كمالك، عَمَّه في حالات الغَلاء والرَّخص}[1].

واتە: هەروەها لە شوێنەوارەکاندا هاتوە: کە دروستە نرخ دابنرێ لەلایەن حوکمڕانەوە، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕای وابووە و سالمی کوڕی عەبدوڵڵاش ڕای وابووە و قاسمی کوڕی موحەممەدی (کوڕی ئەبو بەکر)یش هەر ڕای وابووە، مالیکیش هەر ڕای وابووە و گوتوویەتی: چ هەرزانیی بێ، چ گرانیی بێ، هەر دروستە.

---

(١) ج٣ ص ١٩٩، هەروەها: (فقه التنزيل: دراسة أصولية تطبيقية)ص ٥٣٨،٥٣٩، أحمدمرعي حسن أحمد المعماري.

ئنجا ئەمە یانی چی؟ لەو لا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای فەرمووە و، دواتریش زانایان شتێکی دیکەیان گوتوە؟! وەڵامەکەی هەر ئەوەیە،کە ڕۆژگارەکە گۆڕاوە: لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) زانیویەتی کە بازرگانەکان و ئەوانەی شت دەفرۆشن، نرخی زیاد دانانێن و فەرموویەتی: من داینانێم، دوایی کە ڕۆژگارەکە گۆڕاوەو، بازرگانی بێ ئینصاف پەیدا بوون، کە قۆڵی خەڵك دەبڕن و نرخی زۆر دادەنێن، ئنجا زانایان گوتوویانە: نرخ دانان (تسعير) دروستە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك شتێکی پەرستشیی (تعبّدي) نەیفەرمووە: نابێ نرخ دابنێن، بەڵکو ئەوکاتە بە پێویستیی نەزانیوە، بەڵام لە ڕۆژگاری ئێمەدا پێویستە.

## بەرایی

خوێنەری خۆشەویستم!

لەم بەشی سێیەمەی ئەم تەوەرەی پێنجەمەدا، بابەتی فرەیی (التعّددية - pluralism) دەتوێژینەوە.

دیارە مەبەست لەکۆمەڵگایەکی فرەپێکهاتە (متعدِّد- plural) ئەوەیە کە ئایین، یان نەتەوە، یان مەزهەب، یان طائیفە، یان حیزب، یان بیرۆکەی زۆر و جۆراوجۆری تێدابن، یاخود: لەیەك کات دا: زیاتر لەئایین و نەتەوە و حیزب و مەزهەب و طائیفە و فیکرەیەکی تێدابێ.

ئنجا ئایا هەڵوێستی ئیسلام لەوبارەوە چیە و چۆنە؟

هەڵبەتە ئێمە لەناوونیشانەکەیەوە، بیروڕا و هەڵوێستی خۆمانمان ڕاگەیاندوە کە ئەرێنییە.

ئنجا شایانی گوتنە: کەئێمە حەوت (٧) بەڵگان دەخەینەڕوو، بۆ ئیسپاتی ڕەوایی فرەیی (شرعية التعّدد) لەسەر سەرجەم ئاستەکانی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا: ئایین، نەتەوە، مەزهەب، طائیفە، حیزب، بیرۆکە...

ئنجا لەهەرکام لە: کتێبی دوازدەیەمی مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله} بەناوونیشانی: (الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس، وتعامل صحيح معهم) دا و، بەرگی چوارەمی مەوسووعەی: (ئیسلام دەوڵەتداریی)دا، بە ناوونیشانی: (نامسوڵمانان لەکۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا)، بەدرێژیی لەو بابەتە دوواین و، ئەوەی ئێرە خولاسە و گوشراوێکی ئەوەیە، کە لەودوو سەرچاوەیەدا باسکراوە.

بەڵگەی یەکەم

## هەبوونی جۆراوجۆریی لەگەردوون دا

ئەگەر سەرنجی گەردوون و سەرجەم دروستکراوەکانی خوا (مخلوقات الله) بدەین، بەورد و درشت و، سەروخوار، بەرهەست و نابەرهەست و.. هتد ەوە.

لەسەرتاپای گەردووندا، جۆراوجۆریی (تنوع)دا دەبینین، هەرلەئاسمان و زەوییەوە بگرە، تاکو شەوگار و ڕۆژگار و، زستان هاوین و، تاریکیی و ڕووناکیی و...هتد.

ئنجا مادام مرۆڤیش بەتاك و کۆمەڵەوە، هەریەکێك لە دروستکراوانی خوای زانا و توانایە لەگەردوون دا - هەرچەندە سەرتۆپی کائینات و شاگوڵی باغی بوونەوەر و خەلیفەی خوا و، هەڵگری سپاردەیەکەیەتی - کەواتە: ئەویش نابێ لەسیستم (نظام)ی گشتیی گەردوون ڕیزپەڕ (شاذ) بێ.

بەڵێ کۆمەڵگایەکی بەشەریی، چ کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و، ئیسلامیی بێ، یان نا مسوڵمان و ئیسلامیی، هەرچی بێ، ئەویش دیارە بەشێکە لەو دروستکراوانەی خوا و، ناگونجێ کۆمەڵگای مرۆڤ پێچەوانەی ئەو سروشتەبێ کە خوا دروستکراوەکانی لەسەر سروشتاندوە و، لەکاتێکدا کە جۆراو جۆر بوون

(التنوُّع) لە دروستکراوەکانی خوادا بنچینەیەکی زۆر مەحکەمە، ئەو بێت پێچەوانەی ئەو بنچینەیە بجووڵێتەوە!

ئنجابا تەماشای چەند ئایەتێك بکەین، لەوبارەوە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الروم.

واتە: لەنیشانەکانی خوا (نیشانەکانی پەروەردگاریتیی و، بەدیهێنەرایەتیی خوا) دروستکردنی ئاسمانەکان و، زەوی و، جیاوازیی زمانەکانتان و، ڕەنگەکانتانە، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ زانایان.

بۆچی فەرموویەتی: بۆکەسانی زانا؟! چونکە کێ لەوە دەکۆڵێتەوە؟ بێگومان زانایان لێی دەکۆڵنەوە، بە تایبەتی جیاوازیی زمانەکان، کە ئێستا ئەو زانایانەی کە لە بواری نەتەوەکان و زمانەکاندا دەکۆڵنەوە، دەڵێن: نزیکەی چوار هەزار (٤٠٠٠) زمان هەیە لەنێو بەشەردا، ئنجا زمانی کوردیی: بەسۆرانیی و بادینیی و، کرمانجیی و، کەلهوریی و، هەورامیی و، زازایی و ... هتدەوە، بە هەمووی ئەوجار یەك زمانی پێ دەگوترێ! چوار هەزار زمان هەیە لەسەر زەوی کە خەڵك قسەیان پێ دەکەن، خوای شارەزا دەفەرموێ: لەوەدا نیشانە هەن، هەروەها لە جیاوازیی ڕەنگەکانیشتاندا، نیشانە هەن بۆ زانایان، چونکە کەسێك زانا نەبێ، لەو شتانە ناکۆڵێتەوە و پەی بەو نهێنییانە نابات.

٢- لە سوورەتی (هود) ئایەتەکانی (١١٨و١١٩)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴿١١٩﴾ ﴾ هود.

واتە: ئەگەر پەروەردگار ویستبای: خەڵکی دەکردە یەك کۆمەڵ، بەڵام هەر جیاواز و جۆراو جۆر دەبن، مەگەر ئەوەی پەروەردگارت بەزەیی پێیدا بێ (لە دووبەرەکیی و ناکۆکیی دەربازی بکاو، بیخاتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی) خواش هەر بۆ ئەوە دروستیکردوون.

(القرطبي) دەڵێ: هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: (ولذلك خلقهم) (أي: وللرحمة خلقهم) بۆ بەزەیی لەگەڵدا نوێنران دروستکردوون، هەندێکیش دەڵێن: (أي: وللإختلاف خلقهم)،بۆ ڕاجیایی و جۆراءجۆریی دروستیکردوون،[1] من لە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) کە لە ماوەی پێشوودا چاپی شەشەمی دەرچوو و بۆ زمانەکانی: (عەرەبیی و فارسیی و تورکیی)ش تەرجەمە کراوە، باسم کردوە: کەئەو ڕایەم پێ ڕاستە: (وللإختلاف خلقهم)، چونکە: ئەگەر خوا ئێمەی بۆیە خوڵقاندبایە ڕەحممان پێ بکات، دەبووایە هەموومان بەوشێوەبین کەخوا ڕەحممان پێ بکات، بەڵام واقیع وانیە! ئنجا ئەگەر ئەوە عیللەت و هۆکاری دروستکردنی ئێمە بووایە، دەبوو هاتبایە دی، بەڵام ئێستا ئەوەی هاتۆتە دی ڕاجیاوازیی و جۆراو جۆرییە، نەك بەشەر هەمووی بێتە سەر ڕاستە شەقامی خواو، شایستەی ئەوەی بێ کە خوا بەزەیی پێیدا بێت!

٣- لە سوورەتی (یونس) ئایەتی (٩٩)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ٩٩﴾ یونس.

واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای هەموو خەڵکی سەرزەوی تێکڕاو وێکڕا {تێکڕا واتە: هەموویان، وێکڕا واتە: هەموو پێکەوە، چونکە ئایەتەکە وا دەفەرموێ: (كُلُّهُمْ جَمِيعًا)، هەموویان تێکڕاو وێکڕا} ئیمانیان دەهێنا، ئنجا ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی تاکو بیانکەیە بڕوادار؟!

دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە (صلى الله عليه وسلم) و پرسیارکردنەکەش پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: نابێ زۆریان لێ بکەی، چونکە خوا کە پەروەردگارو بەدیهێنەریانە، زۆری لێ نەکردوون و، ئەگەر ویستبای، دەیتوانی وایان لێ بکات، بەڵام وای لێ نەکردوون، بەڵکو ئازادی کردوون، ئنجا کە ئازادی کردوون، هەیە ڕاست دەڕواو، هەیە چەوت دەڕوات!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج٩ ص٩٤.

بەڵگەی دووەم

## بەبێ ڕەوایی دان بەفرەیی، ئازادیی و دەستکراوەیی مرۆڤەکان، کە تاقی کردنەوەیان دەیخوازێ، نایەتەدی

کێ دەگونجێ تاقی بکرێتەوە؟ کەسێك کە دەستکراوە بێ و بتوانێ وەڵامی پرسیارەکان هەر نەداتەوە، یاخود بە هەڵە وەڵام بداتەوە، ئەوکەسە دەگونجێ تاقی بکرێتەوە.

ئنجائەو ئازادیی و دەستکراوەییە، بوونی نابێ، بەبێ ڕەوایی دان بەفرەیی، ئنجا ئەوەش خوازیاری ئەو حیکمەت و ئامانجەیە، کە خوا مرۆڤی بۆ هێناوەتە دی، خوا دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾ الملك.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە مردن و ژیانی وەدی هێناون، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی باشترە و، خوا زاڵی لێبوردەیە.

بەڵێ، بەبێ ڕێگادان بەفرەیی لە ڕووی فیکریی و ئایینی و نەتەوەیی و ...هتدەوە، ئەو دەستکراوەیی و ئازادییەی مرۆڤ لە بەین دەچێ و، بەبێ دەستکراوەیی و ئازادییش، مرۆڤ ناگونجێ تاقی بکرێتەوە.

## بەڵگەی سێیەم

**لەحاڵێکدا کە مرۆڤ ئازادیی و، سەر پشکبوونی خۆی لە ژیاندا، لەبەرامبەر ئەوەدا کە عەقیدەو بەرنامەی خۆی هەڵبژێرێ، لەدەست دەدا و، ئەو مافەی لێ زەوت دەکرێ، حاڵەتی ناچارکران (الإکراە) و، زۆریی لێکران (الإجبار) ڕوو دەدەن، کە خوای دادگەر هەردووکیانی لە ئایین و بەرنامەی خۆی و، لە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلی الله علیە وسلم) لا بردوون:**

با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین، لەو بارەوە:

١- خوای کاربەجێ لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٥٦)دا دەفەرموێ: [لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ]، واتە: تۆبزیی کردن، زۆریی لێکردن و ناچار کردن لەئاییندا نیە، یانی: نابێ ئیسلام بەزۆر بسەپێنرێ. دەشگونجێ مەبەست لە(دین) لێرەدا دینداریی (تدیُّن) بێ واتە: نەدەبێ نامسوڵمانێك ئیجبار بکرێ لەسەر مسوڵمانەتیی و، نەدەبێ مسوڵمانێك ئیجبار بکرێ لەسەر نامسوڵمانەتیی، بەڵام سیاقەکە زیاتر مانای یەکەم دەگەیەنێ، چونکە هۆی هاتنە خوارەوەکەشی ئەوە بوو، کەپێش ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بچێ بۆ ئەوێ و ئیسلام پەیدا بێ، هەندێك لە ئافرەتانی بتپەرست لەسەر خۆیان نەزر دەکرد، کەئەگەر خوا کوڕیان بداتێ، بیکەن بەجوولەکە، لەبەر ئەوەی دەیانزانی ئەوانە

خاوەن کتێبن و جیاوازییان هەیەو، ڕەنگە لە خوای نزیکتر بن، نەزرەکەیان وا دەکرد، ئنجا هەندێك لەوانە کە خوا منداڵی دابوونێ و کردبوویانن بە جوولەکە، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ مەدینە، باب و دایکەکانیان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) ئەوانە کوڕی خۆمان بوون، نەزرمان کردوە و کردوومانن بە جوولەکە، با لێیان بستێنینەوەو زۆریان لێ بکەین و بیانکەین بە مسوڵمان! خوای دادگەریش ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە: [لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ][1].

٢- خوا لەسوورەتی (یونس) ئایەتی (٩٩)دا، کە پێشتریش هێنامان، دەفەرموێ: ﴿أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩﴾ یونس، واتە: ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی تاکو بیانکەیە بڕوادار؟!

٣- خوا عزوجل لە سوورەتی (ق) ئایەتی (٤٥)دا، دەفەرموێ: [وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٍ]، واتە: تۆ ناتوانی تۆبزییان لێ بکەی و زۆریان لێ بکەی.

٤- هەروەها لە سوورەتی (الغاشية) ئایەتی (٢٢)دا، خوا عزوجل فەرموویەتی: [لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ]، واتە: تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، کە ناچاریان بکەی.

کەواتە: هەم کتێبی خوا، هەم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ڕێگایان نەداوە، خەڵك ناچار بکرێ، کەواتە: دەبێ فرەیی فیکریی و دینیی و سیاسیی ڕەواو ڕێپێدراوبێ.

---

(١) بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ص١٩٠. أخرجه أبوداود: ٢٦٤، والنسائي في تفسيره: ٦٨،٦٩، وابن حبان في صحيحه: ١٤٠وغيرهم.

## بەڵگەی چوارەم

### خوا ڕێی لەخەڵك نەگرتوە کافربن و،
### هەرچەندە ڕقی لەکوفرە و ئیمانی خۆشدەوێ،
### بەڵام لەڕووی شەرعیی و قەدەرییەوە: ئازادی کردوون

یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: خوا چۆن ڕێگا دەدا خەڵك کافر بێ؟! لەوەڵام دا دەڵێین: خوای پەروەردگار بۆیە ڕێگای داوە، چونکە وا نەبێ، خەڵك تاقی ناکرێتەوە، ئنجا باسەرنج بدەین! خوا بەئیرادەی تەکوینیی و قەدەریی خۆی، ئەوە دیارە کە ڕێگای داوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾ (التغابن:٢).

واتە: خوا ئێوەی دروستکردوە، ئنجا هەتانە کافرە و هەتانە بڕواردارە.

کەواتە: خوا ڕێگای داوە، ئەگەرنا وەك لەئایەتەکانی دیکەدا فەرموویەتی: ئەگەر ویستبای، کەس کافر نەدەبوو، بەڵام دیارە خوا خۆی نەیویستوە، بە زۆر بیانکاتە بڕوادار.

ئێستاش با لەوبارەوە دووجۆرە بەڵگەی نەقلیی و عەقلیی بهێنینەوە:

### أ- بەڵگەی نەقڵیی:

خوا لە سوورەتی (الكهف) ئایەتی (٢٩)دا، دەفەرموێ: [فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ]، واتە: بڵێ حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا کێ حەز دەکات، با ئیمان بێنێ و، کێ حەز دەکا با بێ بڕوا بێ.

هەڵبەتە زۆر ئایەتی دیکەش هەن، کە خوا لە شەریعەتی خۆیدا ڕێگای داوە، خەڵك ئیمان نەهێنێ، بەڵام ئایا خوا پێی خۆشە خەڵك کافر بێت؟ بەتەئکید نەخێر، وەك دەفەرموێ:

﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ (الزمر:٧).

واتە: خوا ڕازی نیە بەندەکانی کافر بن، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاربن (کە ئیمان بەشێکە لە سوپاسگوزاریی بۆ خوا) ئەوە پێی خۆشەو بۆتان پەسەند دەکا.

کەواتە: خوا حەز لە کوفر ناکا، ڕقی لە کوفرە و، ڕقی لە زوڵمە، بەڵام دەستی خەڵکی نەگرتوە، کە نەهێڵێ کوفر بکەن، یان زوڵم بکەن، هەڵبەتە لە شەریعەتی خوادا ڕێگا دراوە، خەڵك کافر بێ، بەڵام ڕێگا نەدراوە، خەڵك زاڵم بێت، بەڵام کە ڕێگا نەدراوە، بەو واتایە نا، بە ڕێگانەدانی تەکوینیی، کە خوا نەهێڵێ و مەلائیکەتان بنێرێ، کە خەڵك زوڵم نەکات، چونکە ئەگەر وابێ، خەڵك تاقی ناکرێتەوە.

### ب- بەڵگەی عەقڵیی:

لەڕووی عەقڵییەوە: خوا ئێمەی بۆ تاقیکردنەوە دروستکردوەو حیکمەتی وای خواستوە، دەستیشمان بکاتەوە بۆ چۆنیەتی وەڵام دانەوەی پرسیارەکان، یان هەر وەڵام نەدانەوەیان، ئەگەرنا تاقیکردنەوەیەك وەڵامەکانت بەزۆر پێ بدرێنەوە، بە تاقیکردنەوە داناندرێ.

بەڵگەی

پێنجەم

## یەکەمین کۆمەڵگای ئیسلامیی، کۆمەڵگایەکی فرە پێکهاتەو، فرە مەشرەب و، فرە ئایین بوو، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی بنیاتی ناو سەرپەرشتییکرد

ئەگەر تەماشای کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەم بکەین، دەبینین: مسوڵمانانی تێدا بوون و، نامسوڵمانانیش هەبوون، ئنجا مسوڵمانەکان: کۆچکەران بوون و پشتیوانان بوون، کۆچکەران هۆزو تیرەی جۆراو جۆر بوون: (بنوتیم) عەشیرەتی ئەبو بەکر (رضي الله عنه)، (بنوعدي) عەشیرەتی عومەر (رضي الله عنه)، (بنو أُمية) عەشیرەتی عوسمان (رضي الله عنه)، (بنو هاشم) عەشیرەتی عەلی (رضي الله عنه)، ئنجا بۆ زانیاریتان! هەر چوار خەلیفەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هەر جارەی خەلیفەیەك حوکمی کردوە، لە تیرەیەکی جیا لەوەی دیکە، کەواتە: ئەوەی پێی دەگوترێ: (دەستاو دەستکردنی دەسەڵات) لەنێو چوار خەلیفە ڕاشیدەکاندا بووە، ئنجا ئەو کاتە ئەو عەشیرەتانە وەك حیزبی ئێستا بوون، پێکهاتەی کۆمەڵگا عەشیرەتیی بووە، بەڵام ئێستا حیزبییە، هەر چەندە عەشیرەتیش هەرماون.

هەروەها پشتیوانان: ئەوس و خەزرەج.

ئنجا نامسوڵمانان: جولەکەکان بوون، هاوبەش دانەرەکان بوون، مونافیقەکان بوون، جوولەکەکانیش بنو قینقاع و بنو النضیرو بنو قریظة، بوون.

کەواتە: کۆمەڵگای یەکەمی ئیسلامیی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بنیاتی ناوە، هەم لە ڕووی عەشیرەتیی و لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، هەم لە ڕووی دینیی و سیاسییەوە، هەم لەڕووی فیکرییەوە، کۆمەڵگایەکی پلۆڕال (plural) و فرە پێکهاتە بووە.

بەڵگەی
شەشەم

## نامسوڵمانان بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی، بۆیان هەبووە حیزب و ئیدارەو قەوارەی خۆیانیان هەبێ

ئەوە پرسیارێکە: ئایا نامسوڵمانان لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا، بۆیان هەیە حیزبیان هەبێ و، ئیدارەو قەوارەی خۆیانیان هەبێ، بەڵام لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامییدا؟! زۆر لەنووسەرە ئیسلامییەکان مشتومڕی زۆریان لەوبارەوە بووە. بەڵام من لە مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا، زۆر بەڕوونیی: بە (بەڵێ) نوختەم تێدا خستۆتە سەر پیت، چونکە پێم وایە کە خوا دەفەرموێ:

﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾﴾ الكهف.

واتە: هەر کەسێ پێی خۆشە با ئیمان بێنێ و، هەر کەسێ پێی خۆشە با کافر بێ.

ئنجا کافرەکان: یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج.. هەزار کافر، ئنجا دەڵێن: ئایا ڕێمان نەدراوە کافر بین؟ با، دەڵێن: ئنجا ئێمە دەمانەوێ کۆببینەوە سەریەك و، دەمانەوێ ناوێك لەخۆمان بنێین و، دەمانەوێ لە پێکهاتەی سیاسییدا خۆمان ببینینەوە! بێگومان خوا کە ڕێگای داون کافر بن، ڕێشیان دەدا ئەو کافرانە کۆببنەوە و، لە چوار چێوەیەکی حیزبیی و سیاسییدا خۆیان ڕێکبخەن، هەروەها

ڕێگاشیان دەدات ئیدارەی خۆیان بەدەست خۆیان بێ، واتە: مادام ڕێیان دراوە کافر بن، ڕێشیان دەدرێ بە کافرێتیی بژین و، حاڵ و باڵی خۆیان بەو جۆرەی کە دەیانەوێ ڕێك بخەن.

بەڵگەشمان لەو بارەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستوورێکی دانا کە (وثيقة)ی پێ دەگوترا و، (كتاب)یشی پێ دەگوترا و (صحيفة)شی پێ دەگوترا، بۆ چۆنیەتی مامەڵە پێکەوەکردنی پێکهاتەکانی دەوڵەتەکەی، ئنجا ئەو صەحیفەیەش وەك دەستووری ئێستا وابووە، وەك (محمد حميد الله) لە کتێبی: (مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشده)دا، و (د.أكرم ضياء العمري) لە کتێبی (السيرة النبوية الصحيحة)دا و، (السيرة النبوية)ی (ابن هشام) و هەموو سەرچاوەکان، هێناویانە و لە ڕووی سەنەدەوە چەسپاوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی نووسیوە، بۆ چۆنیەتی مامەڵە پێکەوەکردنی ئەو پێکهاتانەی کە لە مەدینەدا بوون، بەکافرو مسوڵمانەوە و، مسوڵمانان، بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە و، کافرەکانیش بە هەموو پێکهاتەکانیان و جۆرەکانیانەوە.

بەڵگەی
حەوتەم

## بەدیل و جێگرەوەی فرەیی (تَعَدُّدِية) بریتیە لە:
## ستەم و خۆسەپاندن

بەڵێ کۆمەڵگایەك ڕێی فرەیی (تَعَدُّدِية) ی تێدا نەبێ، لەئاکام دا دۆخێکی ناسروشتیی بەمجۆرەی تێدا دێتەدی:

أ- خۆسەپاندنی سیاسیی (الإستبداد السياسي).

ب- چەوساندنەوەی فیکریی (الإضطهاد الفكري).

ج- سەرەنجام:

پەیدابوونی حاڵەتێك کە پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ، بۆ نەهێشتنی ئەو حاڵەتە هاتوون، کە بریتیە لە خۆفەرزکردنی کۆمەڵێك بەسەر کۆمەڵگادا، ئنجا چ حیزبێکی سیاسیی بێ، چ بنەماڵەیەك بێ، چ عەشیرەتێك بێ، چ تائیفەیەك بێ، چ توێژێك بێ، بۆ نموونە: توێژی عەسکەر، لەحاڵێك دا کە هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هاتوون، خەڵك دەرباز بکەن لە چەوساندنەوەی فیکریی و لە خۆفەرزکردنی سیاسیی و، ئیستیغلال و چەوساندنەوەی ئابووریی، وەك خوای دادگەر لە سوورەتی (القصص) ئایەتی

(٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ (٤) ﴾.

واتە: فیرعەون لەسەر زەویدا خۆی بەرز كردەوە (خۆی بەسەر خەڵكدا فەرز كرد) و خەڵكەكەی كردە بەش بەش، هەندێكی دەچەوساندنەوە: نێرینەكانی سەردەبڕین و مێیینەكانیشی دەهێشتنەوە، بێگومان ئەو لە تێكدەران وخراپەكاران بوو.

خۆسەپاندنیش، چ لەبەرگی دین دا و بە ناوی خواوە بێ، چ لەبەرگی سیاسیی دا و بە ناوی دنیاوە بێ، بە هەر ناوێكەوە بێ، خۆ فەرز كردن بەسەر خەڵكدا، پێچەوانەی ئەو ئامانجەیە كە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاە والسلام) بۆ هاتوون، ئەویش ئەوەیە كە خەڵك بە دادگەریی بەرێوە بچن: [لیقوم الناس بالقسط] (الحدید:٢٥)، هەروەها خەڵك ئازاد بن، چۆن دەژین، چی دەكەن: كافر دەبن، مسوڵمان دەبن، رێی راست دەگرن، رێی چەوت دەگرن، خوای كاربزان دەستی مرۆڤەكانی ئاوەڵاكردوە، تاكو تاقییان بكاتەوە، ئەگەرنا خوا دەیتوانی هەر لە رێوە رێیان لێ بگرێ، وەك چۆن هەر لەرێوە فریشتەكانی بەجۆرێك خوڵقاندوون، كە كەسیان سەرپێچیی لەفەرمانەكانی پەروەردگاری ناكات.

لە كۆتاییشدا دەڵێین: لە رووی سیاسیی و فیكریی و ئابوورییەوە، ئەوە دروست دەبێت، كەباسمان كرد،ئەگەر رێگا لەفرەیی بگیرێ، لە رووی ئایینییشەوە بەهۆی رێگرتن لەفرەیی: نامسوڵمانان ناچار دەكرێن ببنە مونافیق، چونكە كافرێك كە رێی لێ دەگیرێ كوفری خۆی رابگەیەنێ، وەك خوای تاك و پاك رێگای داوە:

﴿ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾. الكهف: ٢٩.

كافرێك كە رێی ئازادیی لێ دەگیرێ، ناچار دەكرێ كوفرەكەی پەنهان بكات و بشارێتەوە! یانی: ببێتە مونافیق، چونكە مونافیق بریتیە لەو كەسەی كە كوفر دەشارێتەوەو ئیسلام دەردەخا، هەڵبەتە ئەگەر ئیسلامیش ناچار بكرێ: یەكێك لەكافرو مونافیق، هەڵبژێرێ، وەك (أهون الشرّین) دەڵێ: كافرەكە

ئەهوەنترە، چونكە موونافیقەكە، هەم بۆ خۆی سەرەنجامی قیامەتی خراپترە و، هەم لەڕووی دنیاییشەوە، زەرەری زیاترە بۆ مسوڵمانان، سەرەنجامی قیامەتیی خراپترە، چونكە خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ (النساء:١٤٥).

واتە: موونافیقەكان لەپلەی خوارەوەی دۆزەخ دان.

وەك چۆن (درجات) بۆ سەرەوەیە (دركات)یش بۆ خوارەوەیە، ئنجا موونافیقەكان لە پلەی خواری خوارەوەی دۆزەخدان، ئەوە حاڵی قیامەتیان.

بۆ دنیاش ئەوەندەی خوا سبحانه و تعالی زەمی موونافیقانی كردوە، زەمی هیچ جۆرە كافرێكی دیكەی نەكردوە، وەك لە كتێبی دوازدەیەمی: (موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) دا، كەمەرجیش نیە هەموو سیفەتەكانیانم هێنابن، سەدوحەوت (١٠٧) سیفەتی موونافیقەكانم هێناوە، كە خوا زەمی موونافیقەكانی پێ كردوون! ئنجا ئەوەندەی موونافیقەكان دەتوانن زیان بگەیەنن بە كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی، بە قەوارەی ئیسلامیی و كرمۆڵی بكەن و گەندەڵی بكەن و خراپی بكەن، كافرانی دیكە، ئەوەندە ناتوانن.

كەواتە: بەدڵنیاییی ئیسلام خەڵك ناچار ناكات، بیانكاتە كافری پەنهان و موونافیق، بۆیە: ڕێگا دەدات كە كۆمەڵگا فرە پێكهاتە بێ.

# بەشی چوارەم

## هاووڵاتێتیی نامسوڵمانان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا: ماف و ئازادییەکان

## بــەرایی

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشی چوارەمە، تەرخانكراوە بۆ لێكۆڵینەوە لەبارەی حاڵ و باڵی نامسوڵمانان، لەكاتێك دا لەژێر سایەی كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا دەژین.

كۆی ئەم بەشەش دابەش دەكەین بۆ شەش (٦) باس(مبحث) بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**باسی یەكەم:** چۆنیەتی مامەڵەی كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانی دا.

**باسی دووەم:** هاووڵاتییانی نامسوڵمان، دروستە ئەركەگشتییەكان( الوظائف العامة) یان پێ بسپێررین، بەپێی لێهاتووییان.

**باسی سێیەم:** بۆچی لەدەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەردا، نامسوڵمانان پۆست و پێگەی سیاسیی و ئیدارییان پێ نەسپێردراون؟!

**باسی چوارەم:** سەرجەم نامسوڵمانان، بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەكۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

**باسی پێنجەم:** سەرانە(جزیة) لێوەرگیران، مەرجی هاووڵاتیی بوونی نامسوڵمانان نەبووە لەدەوڵەتی ئیسلامیی دا، بەڵكو ڕمز و نیشانەی: تەبایی و لاشەڕییان بووە.

**باسی شەشەم:** مافەكانی نامسوڵمانان لە كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

شایانی باسیشه هەرچی لێرە هێناومانە، گوشراوو پوختەی ئەوەیە کە لە: کتێبی دوازدەیەمی (موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)[1] و، بەرگی چوارەمی مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) دا هاتوە، کە پێشتریش ئاماژەم پێکردوون.



---

(١) {الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعاملٌ صحيح معهم}، {ئیسلام: تێڕوانینێکی ڕاستە بۆ خەڵك و، مامەڵەیەکی ڕێك و پێکە لەگەڵیان دا}.

باسی
یەکەم

## چۆنیەتی مامەڵەی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانیدا

ئایا نا مسوڵمانانێك ئەوە هەڵدەبژێرن کە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا و لە چوارچێوەی کۆمەڵگای ئیسلامییدا بژین، دەبێ کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی چۆن چۆنیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟ ئەو پرسیارە پرسیارێکی گرنگە بەتایبەتی بۆ ئێستای ئێمە، کە مسوڵمانان زۆر تۆمەتبار دەکرێن بەوەی لەگەڵ غەیری خۆیان دا هەڵناکەن، لەگەڵ غەیری خۆیان دا ناگوجێن و، کەوڵیان هێندە تەسکە، جێی کەسی دیکەی تێدا نابێتەوە! سێبەریان هێندە کەم بەرە، جێی کەسی لە بن نابێتەوە و، کەسیان لەلا ناحەوێتەوە!

دەڵێین: جارێ واقیعی مێژوویی سێزدە (١٣) سەدەی دەوڵەتی ئیسلامیی، بە درۆخەرەوەی ئەو پڕو پاگەندانەیە، بەڵام با تاماشاش بکەین: ئایا دەگونجێ ئیسلام ڕێگا بگرێ لە کەسانێك کە دەیانەوێ ببنە هاووڵاتیی لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، لە کۆمەڵگایەکی مسوڵماندا؟ ئایا وایە ئیسلام ڕێگایان نەدا؟ یاخود: ئایا چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات؟!

باسەرنج بدەین:

١- ئیسلامێك كە ئایینی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) و، پێغەمبەرانیش هەموویان بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوون، ناگونجێ ڕێگا نەدات: نامسوڵمانان لەگەڵیان و لەژێر سایەیاندا بحەوێنەوە؟!

٢- ئیسلامێك مرۆڤ بە گشتی بەجێنشینی خوا دادەنێ و دەڵێ: ئاسمان و زەوی بۆ دەستەمۆ كراون، ئەو مرۆڤە كە لەلای خوا بەڕێزەو خەلیفەی خوایە، دەوڵەتی ئیسلامیی چۆن ڕێگا دەگرێ لە خەلیفەكانی خوا كە لە سایەیدا بژین؟!

٣- ئیسلامێك كە ژیانی دنیا بە جێگای تێدا تاقی كرانەوەی ئازادانەی مرۆڤەكان دەزانێ و، قیامەت بە شوێنی وەرگرتنەوەی ئەنجامی ئەو تاقی كردنەوەیە دەزانێ، چۆن ڕێیان نادا بێن لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین و، تاقی كردنەوەی خۆیان بكەن؟!

٤- ئیسلامێك كە سەرجەم مرۆڤایەتیی بەڕۆڵەی باب و دایكێك دەزانێ و، بە یەكسانیی تەماشای هەموو گەل و هۆزەكان دەكا، ئەوانە تێكڕایان و هەركامیان: ئەگەر جوولەكەیە، ئەگەر نەصرانییە، ئەگەر یەزیدییە، ئەگەر مەجووسییە، ئەگەر بووزاییە، ئەگەر مونافیقە، ئەگەر مولحیدە، ئایا لە ئادەم و حەووادا هەموومان پێك ناگەینەوە؟ بێگومان، با، چونكە خوشك و برامانن وەك نەسەب و ڕەچەڵەك.

بۆیە عەلی (رضي الله عنه) كە والییەكەی خۆی نارد بۆ میصر وەسیەتێكی درێژی بۆ كردوە، كە لە (نهج البلاغة) و لە هەندێك سەرچاوەی دیكەش دا هاتوە، پێی گوت: {الناس إمّا أخٌ لك في الدِّين، أو نظيرٌ لك في الخلق}[1]، واتە: خەڵك یان براتە لەدیندا، یان لە دروستكراودا وەك خۆتە.

یانی: ئەویش خوشك و برای نەسەبیی و ڕەچەڵەكیتە.

ئنجا ئایا ئیسلامێكی ئاوا، دەگونجێ ڕێ لە مرۆڤە نامسوڵمانەكان بگرێ، لەسایەی دا بژین؟!

---

(١) نهج البلاغة، باب المختار من كتب أمير المؤمنين ورسائله، (٥٣) و من عهد له كتبه للأشتر النخعي، ص ٤٨٠ - ٥٠٠، ط الأولى: ٢٠١٣.

٥- ئیسلامێك كە كتێبەكەی و پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) بە موڵكی هەموو بەشەر دادەنێ و، هەم كتێبەكەی و هەم پێغەمبەرەكەی، ڕوو لە هەموو مرۆڤایەتیی دەكەن:

أ- كتێبەكەی: ﴿ ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ يوسف، ﴿ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة.

ب- پێغەمبەرەكەیشی (صلى الله عليه وسلم): ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبياء، ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ (سبأ:٢٨).

كەواتە: دەوڵەتێك كە لەسەر بناغەی قوڕئان و لەسەر بناغەی ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، دادەمەزرێ، كە هەم قوڕئان بۆ هەموو بەشەر هاتووە، هەم پێغەمبەریش بۆ هەموو بەشەر نێردراوە، ئەو قەوارە سیاسییە، ڕێگا بەو بەشەرانە دەدا كە قوڕئان دەیاندوێنێ و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیاندوێنێ، بێن لە ژێر سایەیدا بژین!

بۆ ئیسپاتی هەموو ئەوانەش دەتوانین ئەو پێنج بەڵگەیە بێنینەوە:

**یەك: دادگەریی بناغەی حوكمڕانییە لەئیسلامدا و، ئامانجی شەریعەتە:**

هەڵبەتە دادگەریی هیچ مانایەكی نامێنێ كە تۆ ڕێگا نەدەی خەڵك لەگەڵت دا بژیی، لەژێر سایەی ئەو قەوارە سیاسییەدا كە تۆ بنیاتت ناوە، با ئەو خەڵكە بڕوای بە ئیسلامیش نەبێ، مادام بە تەبایی و ئاشتیی لەگەڵت دەژیی.

**دوو: پاراستنی ڕێزو حورمەتی مرۆڤەكان، گەورەترین بەهاو سەرەكییترین مافە و، دەبێ بۆ یەكە یەكەی مرۆڤەكان دابین بكرێ:**

چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾ (الإسراء:٧٠)، واتە: بەدڵنیایی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم، لە ڕۆڵەكانی ئادەم گرتووە.

ئنجا ڕۆڵەكانی ئادەم كە خوا ڕێزی لێ گرتبن، دەبێ تۆش ڕێگایان بدەی لەگەڵتدا بژین و لەژێر سایەی دەوڵەتەكەتدا، بحەوێنەوە.

**سێ: هاووڵاتیی بوونی نامسوڵمانان، مامەڵەی یەکسان لەگەڵیاندا دەخوازێ:**

چونکە: کە بەکەسێکت گوت، تۆش هاووڵاتیی! دەبێ وەك هاووڵاتیی مامەڵەی لەگەڵدا بکەی.

**چوار: پەیمان و گرێ بەستی نێوان دەوڵەتی ئیسلامیی و هاووڵاتییانی نامسوڵمان، دیسان مامەڵەی یەکسان لەگەڵیان دەخوازێ:**

چونکە نامسوڵمانان کە لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، لەسەر بناغەی گرێ بەستێکە، هەر بۆیە بە نامسوڵمانان گوتراوە: (أهل الذمّة)، یانی: خاوەن بەڵێن و پەیمان، بۆ زانیارییتان! هەندێك زاراوە جاری وایە مانایەکی شێوێنراو و خراپ پەیدا دەکەن! (الذمّة) یانی چی؟ لە سوورەتی (التوبة)دا خوا دەفەرموێ:

﴿لَا يَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً﴾ (التوبة:٨).

واتە: هاوبەشدانەرەکان لەگەڵتان دا ڕەچاوی هیچ خزمایەتیی و پەیمانێك ناکەن.

(إِلًّا) یانی: (قرابةً)، (ذمّة) یانی: (عهداً)[١]، کەواتە: (أهل الذمّة) واتە: (أهل العهد)، تۆ ئێستا دەچی بۆ ئەورووپا، نابێ فیزەت بدەنێ، ئەوجار کە لەوێ بمێنییەوە، نابیە پەنابەر؟ ئائەوە (ذمّة) و (عهد)ەکەیە، مسوڵمانان لە دەوڵەتی کافراندا (أهل الذمّة)ی کافرانن، کافریش لەلای مسوڵمانان (أهل الذمّة)ی مسوڵمانانن، یانی:(أهل العهد)ن، پەیمانیان هەیە لەگەڵ مسوڵمانان، کە زیانمان پێ نەگەیەنن، زیان بە دین و ژینمان نەگەیەنن و، لەگەڵمان تەبا بن، هەروەك چۆن مسوڵمانێك کە دەچێ بۆ ئەو وڵاتانە، ئەویش پەیمانی لێ وەردەگیرێ و بەڵێنی لێ وەردەگیرێ، کە نابێ زیانیان پێ بگەیەنێ، بۆیە هەموو ئەو تێکدان و خراپەکارییانەی لەوێ دەکرێن، ناشەرعیین، چونکە هەر کەسێك کە چووە بۆئەوێ، کۆمەڵێك شتیان پێ پڕکردۆتەوە و کۆمەڵێ

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٢٩و١٩٨. ط:٢٠١٢م للمطبعة المصرية.

مەرجیان لەسەری هەیە، بەلای کەمەوە: نابێ زیانیان پێ بگەیەنێ، ئەگەر چاکەشیان نەداتەوە، لەبەرانبەر چاکەیاندا، کە حەواندوویانەتەوە، بەلای کەمەوە نابێ زیانیشیان پێ بگەیەنێ:

﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الرحمن.

واتە: ئایا پاداشتی چاکە، هەر چاکەنیە!

سەد حەیف! مسوڵمانەتیی چی لێ هاتوە؟ کابرا دەچێ لەوێ خەڵکێکی ئاسایی لە شەقامێك دا، دەشێلێ، یان بەچەك دەکوژێ، ئنجا پێشی وایە جیهادی کردوە لە ڕێ خوادا!! لەحاڵێك دا کە زیانگەیاندن بەخەڵکی ئەو وڵاتە، پێچەوانەی ئەو عەهدو بەڵێنەیە، کە بەو وڵاتەی داوە و، خواش فەرموویەتی:

﴿ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾ (الإسراء:٣٤).

واتە: وە فادار بن بە بەڵێن، بەڵێن لێی دەپرسرێتەوە.

یانی: کارەکە لەبناغەوە ناشەرعییە، پێش ئەوەی بێینە سەر ئەوەی داخۆ ئەو نەفەرانە دروستە بکوژرێن یان نا؟ هەر کارەکە بۆخۆی ناشەرعییە.

**پێنج: بناغەی هەڵسوکەوتی مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵمانانی لاشەڕو بێ زیاندا، بریتیە لە چاکەکاریی و هاوکاریی:**

وەك خوای کارزان لە سوورەتی (الممتحنة)دا دەفەرموێ:

﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة.

واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات، کەسانێك کە لەسەر دینتان دژایەتییتان ناکەن و، لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەرتان نانێن، (واتە: نە دژی دینتانن، نەدژی ژینتانن) کە لەگەڵیان دا چاکەکار بن و، لە سامانی خۆشتان پشك و بەشیان پێ بدەن.

# باسی دووەم

## هاووڵاتییانی نامسوڵمان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، دروستە ئەرکە گشتییەکان (الوظائف العامة)یان پێ بسپێردرێن، بەپێی لێهاتووییان

چونکە بەبێ ئەوە:

**یەك:** دادگەریی ناچەسپێ و ستەم پەیدادەبێ، واتە: ئەگەر ئەو نامسوڵمانانەی کە لە وڵاتی مسوڵماناندا دەژین، ڕێیان لێ بگیرێ: بەشدار بن لە ئیدارەدانی کۆمەڵگا و لە خزمەت کردن بە کۆمەڵگا و، بەو قەوارە سیاسییە و دەوڵەتە، ئەگەر ڕێیان لێ بگیرێ، دادگەریی ناچەسپێ.

**دوو:** وەك مرۆڤ ڕێزیان لێ ناگیرێ و، ماف و ئازادییەکانیان ناچەسپن.

**سێ:** گرێبەستی نێوان ئەوان و مسوڵمانان، پابەندیی پێوە ناکرێ.

**چوار:** پاشان مسوڵمانان بە چاکەکارو هاوکار لە قەڵەم نادرێن لەگەڵیاندا، کە خوا دەفەرموێ: دەبێ لەگەڵیاندا چاکەکارو هاوکاربن.

بەڵام لێرەش دا جۆرێك لە تێپەڕاندن هەیە، چونکە: هەندێك لە زانایانی مسوڵمانی هاوچەرخ، بەپاساوی ئەوەی کە مسوڵمانان دەبێ باخەڵ فەڕاح

و تەبا و گونجاو و بێ فەرق بن، پێم وایە تێیان پەڕاندوە لە هەندێ شت دا، هەروەك چۆن هەندێکیان بۆ بەرگریی کردن لەوەی کە ئیسلام ستەمی لە ئافرەت نەکردوە و ئیسلام زۆر ڕێزی لە ئافرەت ناوە، پێم وایە تێیان پەڕاندوە لەوەدا کە گوتوویانە: دروستە ئافرەت ببێ بە خەلیفەی مسوڵمانان، یان سەرۆکی دەوڵەت! کە پێم وایە: ئەگەر قاتیی پیاوان (قحط الرِّجال) بێ و، هیچ پیاوی شایستە دەست نەکەون، ئەوکاتە ئەوە بۆ ئافرەت دروست و ڕەوایە، بەڵام کاتێك تەماشای سروشتی شەریعەت و، سروشتی ژیان و دنیا دەکەین، ئەوە شتێکی زۆر ڕیزپەڕو دەگمەنە.

مەبەستم ئەوەیە: جار جار هەندێ لە زانایانی مسوڵمان، لەژێر فشاری ئەو واقیعەدا کە تێیدا دەژین، بەلایەکی دیکەدا تێی دەپەڕێنن، وەك چۆن بارێك خوار دەبێ، بەلایەك دا خوار بووە، کابرا ڕاستی دەکاتەوە و، ئەوجار بەلایەکەی دیکەدا خواری دەکاتەوە! هەمیشە ڕێی ڕاست دیتنەوە و خەتی نێوەڕاست (وسط) گرتن زۆر گرنگە.

بەڵێ هەندێك لە زانایانی مسوڵمانی هاوچەرخ گوتوویانە: بەبێ هەڵاواردن، دروستە هەموو ئەرکەکان لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بە نامسوڵمانان بسپێرێن، بە سەرۆکی دەوڵەت و بە فەرماندەی سوپاو، بە سەرۆکی ئەنجوومی یاسادانانیشەوە! بەڵام پێم وایە چەند پۆستێك لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا، ناگونجێ خەڵکی نامسوڵمان وەریان بگرن و، بەخەڵکی نامسوڵمان بسپێررێن:

١- کەسی یەکەمی دەوڵەت (سەرۆکی دەوڵەت)، ئنجا سەرۆك کۆماری پێ دەڵێن، سەرۆك وەزیرانی پێ دەڵێن، خەلیفەی پێ دەڵێن، ڕاوێژکار (مستشار)ی پێ دەڵێن، وەك ئەڵمانیا، یان هەر ناوێکی دیکە، کەسی یەکەم، لە دەوڵەتیی ئیسلامی دا، ناگونجێ نامسوڵمان بێ.

٢- فەرماندەی سوپاو هێزی چەکدار، ناگونجێ نامسوڵمان بێ، چونکە فەرماندەی سوپاو هێزی چەکدار لە ئیسلامدا، بە یەکێك لە فەرێزەکان هەڵدەستێ کە بریتیە لە جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا، ئەوەش واجبێکی شەرعییە و،

لەسەر نامسوڵمانان پێویست نیە، کەواتە: چۆن دەگونجێ نامسوڵمانێك بکرێتە سەرۆکی سوپای مسوڵمانان، کە بەرگریی دەکات لە قەوارەی ئیسلامیی و، هەڵدەستێ بەئەرکێکی شەرعیی، کە جەنگ و جیهادە (لە هەلومەرجی خۆی دا و، لەکات و شوێنی خۆیدا).

**٣**- دادوەریی کردن(قضاء) لە نێوان مسوڵماناندا، دروست نیە بە نامسوڵمانان بسپێردرێ.

**٤**- هەڵهێنجانی یاساکانی شەریعەت لە قورئان و سوننەت، کەسێ کە نامسوڵمان بێ:

**یەکەم:** دوورە شارەزا بێ لە شەریعەت، کە یاساکان لە قورئان و سوننەت، هەڵبێنجێ.

**دووەم:** کە بڕوای بەئیسلام نەبێ، چۆن ئەرکی یاسادان (تقنین)ی پێ دەسپێررێ بۆ مسوڵمانان؟!

**٥**- پێشنوێژیی و وتاردانی ئایینیی.

هەڵبەتە ئەمانە هەندێکیان، بۆ نامسوڵمانانیش هەروان:

بۆوێنە:

**أ**- مسوڵمانانیش بۆیان نیە ببنە دادوەری نامسوڵمانان، مەگەر بۆ خۆیان دادوەریی خۆیان بێننە لای دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەگەرنا خۆیان گرفت و کێشەکانی خۆیان چارەسەر دەکەن، وەك دەفەرموێ:

﴿ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴾ (المائدة:٤٢).

واتە: ئنجا ئەگەر هاتن بۆ ئەوەی دادوەریی لە نێوانیاندا بکەی و، دەتوانی دادوەریی لە بەینیان بکەی و دەشتوانی لێیان گەڕێی (بۆ خۆیان دادوەریی خۆیان بکەن).

ب- هەروەها هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکانی خۆیان، یانی: کاروباری ئایینی خۆیان، مسوڵمانێك بۆی نیە بڵێ: دەبێ من ببم بەقەشەو پاپاتان!

ج- پێش نوێژیی و وتاردانی ئایینی خۆیان، دیسان مسوڵمانێك بۆی نیە ئەو پۆستانە وەربگرێ، یانی: ئەوشتانەی کە تایبەتمەندیی ئایینی خۆیانن، دروست نیە بەمسوڵمانان بسپێررێن.

هەڵبەتە بۆ مسوڵمانانیش هەروایە: کەسی یەکەمی دەوڵەتی ئیسلامیی، تایبەتمەندییەکی دینییە، چونکە: ئەو کەسەی دەبێتە جێ بەجێکاری شەریعەت، ئەوە تایبەتمەندییەکی ئایینی پێ سپێراوە، هەروەها فەرماندەیی سوپا، تایبەتمەندیی دینییە، چونکە بەئەرکی جیهادو جەنگ لە پێناوی خوادا هەڵدەستێ، هەروەها دادوەریی کردن بە پێی شەریعەت، ئەرکێکی دینییە و، ئەوانی دیکەش بە هەمان شێوە.

جگە لەوانە پێم وایە نامسوڵمانان بۆیان هەیە هەموو ئەرکەکانی دیکەیان پێ بسپێردرێن، مادام مۆرکێکی دینییان نەبێ، بۆ وێنە: ببنە وەزیر، ببنە پەرلەمانتار، ببنە بەرێوەبەر...هتد.

**بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە (الوثيقة)دا دەفەرموێ: {لِلْيَهُودِ دِينُهُمْ وَلِلْمُسْلِمَيْنِ دِينُهُمْ}[1]، واتە: جوولەکەکان دینی خۆیان بەرێوە دەبەن، مسوڵمانانیش دینی خۆیان بەرێوە دەبەن، کەواتە: مسوڵمانان ئەو شتانەی تایبەتمەندیی دینی خۆیانن، نابێ خەڵکی دیکە تەماعیان تێ بکات، هەروەك جوولەکەو نەصرانیی و مەجووسیی و خەڵکی دیکەش، ئەوەی تایبەتمەندیی دینی خۆیانە، نابێ کەس تەماعی تێ بکات و ئەوەیان لێ زەوت بکاو، تەنگیان پێ هەڵبچنێ.

لەباسی (شەشەم)یش دا دەیخەینە ڕوو: بەڵگە چییە لەسەر ئەوە کە نامسوڵمانان دروستە ئەرکە گشتییەکانیان پێ بسپێررێن؟!

---

(١) بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة، محمد حميد الله، الوثيقة رقم:١، ص ٥٧-٦٢، الفقرة:٢٥، ط ٨، ٢٠٠٩، دار النفائس.

باسی
سێیەم

## بۆچی لەدەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نامسوڵمانان پۆست و پێگەی سیاسیی و ئیدارییان پێ نەسپێرراون؟

ئەوە پرسیارێكی گرنگە و بەڕواڵەت ئیشكالێكی گەورەیە: ئەگەر نامسوڵمانان لە پێسپێردرانی ئەركە گشتییەكاندا (الوظائف العامّة)دا وەك هاووڵاتیی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێ، بۆچی لەدەوڵەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نەمان بیستوە: جوولەكەیەك، نەصرانییەك، ئەركێكی لەئەركەكانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و كۆمەڵگا پێ سپێردرابێ؟

ئەم پرسیارە: لەو كتێبانەدا كە لەو بوارەدا تەماشام كردوون، نەمدیوە، ئەو پرسیارە كرابێت و ئەو وەڵامەش درابێتەوە، وەڵامەكەش ئاوایە: لەسۆنگەی ئەوەوە كە نامسوڵمانانی ئەو كاتە، كە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیاون، خاوەنی ئیدارەی كۆمەڵایەتیی خۆیان بوون و، خاوەنی قەوارەی سیاسیی خۆیان بوون و، خاوەنی ژێرخانی ئابووریی خۆیان بوون، بگرە خاوەنی هێزی سوپایی خۆشیان بوون و، هەموو شتێكی خۆیان هەبووە، بۆوێنە: جوولەكەكان قەوارەی سیاسیی خۆیان هەبووە، لەڕووی ئابوورییەوە، بازاڕی خۆیان هەبووە، سامان و

موڵك و پارەی تایبەت بەخۆیان هەبووە، لەڕووی سوپاوە: شەڕیان کردوە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، هەروەها لەڕووی دادوەرییەوە: چارەسەری گرفت و کێشەکانی خۆیان کردوە، بەکورتی: هەمووشتێکی خۆیان هەبووە و، ئەسڵەن لە هەرێمێکی فیدراڵ زیاتر مافیان هەبووە و، بارودۆخیان وەك کۆنفیدراڵیی بووە، چونکە هەرێمێکی فیدراڵ، هەندێك پێگە و توانا کە ئەو کاتە جوولەکە هەیان بووە، ئەو پێگەو ئیمتییازانەی نین.

ئنجا ئایا ئەوەمان لە کوێ بۆ دەردەکەوێ؟

لە بەندەکانی (الصحيفة)دا، بۆ وێنە:

**یەك:** لەبەندەکانی: (٤ و٥و٦و٧و٨و٩و١٠و١١)دا یەك تەعبیر دووبارە بۆتەوە، لە هەموو ئەو بەندانەدا، کە هەمووی(٥٢) بەندە، یاخود (٤٧) بەندە، بەپێی جیاوازیی کورت و درێژیی بڕگەکانی (الصحيفة)، ئەم ماددەیە لە هەموو ئەو بەندانەدا هاتوە: {يَتَعَاقَلُونَ مَعَاقِلَهُمْ الْأُولَى، كُلُّ طَائِفَةٍ تَفْدِي عَانِيَهَا بِالْمَعْرُوفِ وَالْقِسْطِ بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ} واتە: خوێنی پێشیان دەدەن {واتە: ئەگەر کەسێك لە تائیفەیەك، لە بنەماڵەیەك، لەلایەك دەکوژرێ، کاتی خۆی چۆنیان خوێن داوە، هەر ئاوا خوێن دەدەن} هەروەها هەر کۆمەڵێك دیلەکەی خۆی کە گیراوە، بۆ ئەوەی بەری بدات، فەرەبووەکە خۆی دەیدا، بەشێوەیەکی بەپەسەند داندراوو بە دادگەرانە لەنێو ئیمانداراندا، چۆن باوە، ئاوا.

کەواتە: هەر کامێکیان، (مسوڵمان و جوولەکە و موشریکەکان) لە ڕوویی ئابوورییەوە، خەرجیی و مەسرەفی خۆی لەسەر بووە.

**دوو:** لە بەندی (٢٤)دا هاتوە: {وَإِنّ الْيَهُودَ يُنْفِقُونَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ مَا دَامُوا مُحَارِبِينَ}[١]، جوولەکەکان هەتا پێکەوە لەگەڵ ئیمانداراندا بجەنگن[٢]، پێکەوە خەرجیی و مەسرەفی جەنگەکە دەکێشن.

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) واتە: هەتا لەگەڵ مسوڵمانان دا یەك بەرە (الجبهة) بن. بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية.. محمد حميد لله، ص ٥٩ ، ٦٠ .

کەواتە: مەسرەفی هاوبەشیشیان هەبووە، جەنگێك، بووە: خەریکە دوژمنێك دێتە سەرمان فەرمووین: هاوپەیمانینە! وەرن، ئەوە دوژمنێکی هاوبەشەو کاتی خۆی ئیتیفاقمان پێکەوە هەیە، پێکەوە بەرگریی بکەین!

**سێ:** لە بەندی (٣٧)دا هاتوە: {وَإِنّ عَلَى الْيَهُودِ نَفَقَتَهُمْ وَعَلى المُسلمين نَفَقتهم}[١]، واتە: جوولەکەکان مەسرەف کێشانی خۆیان لەسەرە و، مسوڵمانانیش مەسرەف کێشانی خۆیان،

ئەمەش دیارە لە هەندێ شتدا، هەر کەسەو مەسرەفی تایبەتی خۆی کردوە.

هەڵبەتە ئەگەر وەك ئێستا وەزارەتی دارایی ببووایە، یان وەزارەتی بەرگریی ببووایە، بە جۆرێکی دیکە مامەڵە دەکرا، ئەوکاتە وەزارەتی دارایی بۆ هەمووان دەبوو و، وەزارەتی بەرگریی بۆ هەمووان دەبوو، بەڵام ئەو دامەزراوانە نەبوون و، مسوڵمانان هێزی خۆیان هەبووە و، ئەوانیش هێزی خۆیان هەبووە، مسوڵمانان ئیمکانیەتی ماددیی خۆیان هەبووە و، ئەوانیش ئیمکانیەتی ماددیی خۆیان.

**چوار:** لە بەندی (٤٥)دا هاتوە: {عَلَى كُلّ أُنَاسٍ حِصّتُهُمْ مِنْ جَانِبِهِمْ الّذِي قِبَلَهُمْ}[٢]، واتە: هەر کۆمەڵە خەڵکە، ئەو پشکەی کە دەکەوێتە سەریان، پێویستە جێ بەجێی بکەن.

**پێنج:** لە بەندی (٣٧)دا هاتوە: {وَإِنّ بَيْنَهُمْ النّصْرَ عَلَى مَنْ حارَبَ عَلى أَهْلَ هذهِ الصَّحيفة}[٣]، واتە: ئەو پێکهاتانەی ئەو وەسیقەیان ئیمزا کردوە (بە جوولەکەو مسوڵمان و هەمووانەوە) پێویستە یارمەتیی یەکدی بدەن، لە دژی هەر کەسێك کە دژی خەڵکی ئەم صەحیفەیە، خەڵکی ئەو صەحیفەیەش واتە: خەڵکی (یەثریب) بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٣) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

**شەشەم:** لە بەندی (٤٤)دا هاتوە: {وَإِنّ بَيْنَهُمْ النّصْرَ عَلَى مَنْ دَهَمَ يَثْرِبَ}[١] ئەوەی پێشێ: هەر کەسێك دژایەتیی ئەهلی ئەم صەحیفەیە بکات، لە دوورو نزیك، بەڵام ئەمەیان: ئەهلی ئەم پەیماننامەیە: هەر کەسێك بەسەر مەدینەدا بدات، هاوکاریی یەکدی بکەن بۆ بەرپەرچدانەوەی..

**حەوت:** لە بەندی (٣٩)دا هاتوە: {وَإِنّ يَثْرِبَ حَرَامٌ جَوْفُهَا لِأَهْلِ هَذِهِ الصّحِيفَةِ}[٢] واتە: نێوشاری یەثریب دەبێ بپارێزرێ. (واتە: هێمنیی و ئاسایشیی تێدا بەرقەرار بکرێ) لەلایەن خەڵکی ئەم صەحیفەیەوە.

**هەشت:** لە بەندی (٤٥)دا هاتوە: {وَإِذَا دُعُوا إِلَى صُلْحٍ يُصَالِحُونَهُ وَيَلْبَسُونَهُ، فَإِنّهُمْ يُصَالِحُونَهُ وَيَلْبَسُونَهُ، وَإِنّهُمْ إذَا دَعُوا إِلَى مِثْلِ ذَلِكَ، فَإِنّهُ لَهُمْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، إلّا مَنْ حَارَبَ فِي الدّينِ}[٣] واتە: هەر کاتێ پێکهاتەکانی کە ئەم پەیماننامە (وثیقة)یان ئیمزا کردوە (بەتایبەتی جوولەکەکان) بانگکران بۆ صوڵحێك کە پێی هەڵسن، دەبێ ئەوانیش بیکەن {ئەو صوڵحە پێکەوە بکەن، لەگەڵ لایەنێکدا، یانی: ئەگەر مسوڵمانان گوتیان: ئەی جوولەکەکان! ئێمە بەتەماین لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا صوڵح بکەین، دەبێ جوولەکەکانیش لەگەڵیاندا صوڵح بکەن} هەروەها ئەگەر جوولەکەکانیش بۆ پێکهاتن و صوڵح لەگەڵ کۆمەڵێك دا (قەوارەیەکی سیاسی)دا مسوڵمانەکانیان بانگ کرد، مسوڵمانانیش دەبێ بە دەمیانەوە بچن {واتە: هەر کەسێك ئاشتیی بکات لەگەڵ مسوڵماناندا، دەبێ جوولەکەش ئاشتیی لەگەڵ بکەن و، هەر کەسێکیش جوولەکەکان ئاشتیی لەگەڵ بکەن، دەبێ مسوڵمانانیش ئاشتیی لەگەڵ بکەن، چونکە دەبێ: هاوکاریی سیاسیی و، ئابووریی و، سوپاییان پێکەوە هەبێ}.

**نۆ:** لە پەیماننامەی نێوان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هۆزی (ثقیف)دا هاتوە: {ومَنْ كرِهوا أن يَلِجَ عليهم من الناس، فإنه لا يَلِجُ عليهم، وإن السوق والبيع

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٣) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

بأفنية البيوت، وأن لا يُؤَمَّر عليهم إلا بعضهم على بعض}[١].

هۆزی (ثقیف) هاتوون پەیمانێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەستوە، یەکێ لە بەندەکانی ئاوا بووە: هەر کەسێ پێیان ناخۆش بێ بچێ بۆ شوێن و دەڤەرەکەیان، نابێ بچێ [ئەگەر پێیان ناخۆش بێ، مسوڵمانان بچن، نابێ بچن] ئنجا بازاڕیان و، کڕین و فرۆشتنیان، لەبەر دەرگای حەوشەکانیانە، [دیارە ئەوە مەرجیان بووە، کە دەبێ لەبەر دەرگای حەوشەکانیان بازاڕ دابنێن] هەروەها نابێ هیچ کەسێ بەسەریانەوە بکرێتە بەرپرس و فەرماندە، مەگەر لەنێو خۆیاندا، دایبنێن.

دیارە ئەو هۆزە هاتوون مسوڵمانیش بوون، بەڵام بەو شێوەیە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر دا (صلی الله علیه وسلم) بەستوە، کەجۆرێك لە فیدراڵیی و خۆ بەڕێوەبردنیان هەبێت.

ئنجا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: باشە بۆ چی: لەکتێبەکەی (إبن القیم) (أحکام أهل الذمّة) و، لەکتێبەکانی دیکەدا باس کراوە، کە: لەسەر ئەهلی کیتاب فەرزە، جۆرێك لە پشتێن ببەستن کە (زیننار)یان پێ گوتوە و، جاری وایە لەسەریان فەرز کردوون کە دەبێ بەرگێکی تایبەت بپۆشن و، لەسەریان فەرز کردوون کە نابێ سواری وڵاخە بەرزە ببن و، لەسەریان فەرز کردوونك کەدەبێ ئاوا بکەن و ئاوا بچن،؟! دەڵێین: ئەوە هەمووی پەیوەندیی هەیە بەو بارودۆخە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە کە مسوڵمانان تێیدا ژیاون.

بۆ وێنە: ڕەنگە لەو شوێنەدا: جوولەکە شوولیان لێ هەڵکێشابێ و، نەصرانیی زوڵمیان لە مسوڵمانان کردبێ و، دەوڵەتیش دەوڵەتی مسوڵمانانە، گوتوویانە: با تۆزێك سنووردارییان بکەین، ئەوەش بۆچوون و (إجتهاد)ی ئەو زانایانە بووە لەو کاتەدا، بەڵام لە شەریعەتی ئیسلامییدا ئاوا داندراوە، وەك پڕەنسیپ (مبدأ)، کە باسمان کرد ئنجا دوایی ئەگەر حوکمڕانێك لایداوە و کارێکی کردوە، نەیپێکاوە، یان زانایەك ئیجتیهادێکی کردوە و نەیپێکاوە، ئەوە ماڵی قەڵپ سەر بە خاوەنیەتی.

---

(١) الأموال، لأبي عبيد، ص ١٩١.

باسی
چوارەم

## سەرجەم نامسوڵمانان بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا

بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەو ناوونیشانەی سەرێ، دەتوانین زۆر بەڵگان بهێنینەوە، بۆنموونە:

١- خوا ژیانی دنیای کردۆتە شوێنی تاقییکردنەوەی مرۆڤ و جند: ﴿ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَیَوٰةَ لِیَبۡلُوَكُمۡ أَیُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلࣰاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِیزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾ الملك.

واتە: (خوا) ئەوکەسەیە کە مردن و ژیانی ڕەخساندوون تاکو تاقییتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی باشترە و، ئەو زاڵی لێبوردەیە.

کەواتە: دەبێ مرۆڤەکان بۆیان هەبێ: تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن.

٢- چونکە: هەر کام لە قورئان و پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بۆ هەموو بەشەر نێردراون، وەك پێشتریش باسمانکرد:

﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرࣱ لِّلۡعَـٰلَمِینَ ۝٢٧﴾ (التكوير)، ﴿وَمَاۤ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةࣰ لِّلۡعَـٰلَمِینَ ۝١٠٧﴾ (الأنبياء).

کەواتە: دەبێ بوار بۆ هەموو مرۆڤەکان بڕەخسێنرێ، لێیان بەهرەمەند بن.

٣- هەر کەسێك لەناخیدا و بە قەناعەت ئیمان نەهێنێ، بەزۆر نابێتە ئیماندار، ئایینی خواش خەڵك ناکاتە مونافیق، وەك خوا عزوجل بە پێغەمبەری کۆتایی (محمد)ی فەرمووە:

﴿ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ (٩٩) يونس.

واتە: ئایا تۆ خەڵکی ناچاردەکەی تاکو ببنە بڕوادار؟!. هەروەها فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ﴾ (البقرة: ٢٥٦).

واتە: ناچارکردن (لەسەر مسوڵمان بوون) لەئایین دا نیە.

٤- خوا ڕایگەیاندوە، کە بە دڵنیایی بەشێك لەمرۆڤەکان کافر دەبن، وەك فەرموویەتی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ ﴾ (التغابن:٢).

واتە: ئەو (خوا) ئێوەی دروستکردوە، ئنجا هەتانە بێبڕوایە...

دیارە ئەم بابەتە، بابەتێکی زۆر مشت و مر هەڵگرە، بەڵام زۆر بۆتان پوخت دەکەمەوەو بەگوشراویی شیلەکەیتان دەخەمە بەر دەست، ئەگەرنا لە کتێبە فیقهییەکان و کتێبەکانی سیاسەتی شەرعییدا، بۆوێنە: کتێبەکەی (السَّرخْسي)دا زۆر بە تەفصیل باسیان کردوە.

لەوبارەوە کە ئایا چ جۆرە کەسانێك بۆیان هەیە، ببنە هاووڵاتیی لەکۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا؟

چوار جۆرە ڕاوبۆچوون هەن:

**ڕای یەکەم:** تەنها خاوەن کتێبەکان و مەجووسییەکان بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، ئەمەش ڕای شافیعییەکان و حەنبەلییەکان و زاهیرییەکان و ئیبازییەکان و ئیمامییەکانە (واتە: شیعەی دوازدە ئیمامیی)[1].

---

(١) آثار الحرب، وهبة الزحيلي، ص ٦٩٧.

**ڕای دووەم:** هەموو نامسوڵمانان بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەدەوڵەتی ئیسلامیدا، بێجگە لە عەرەبە بتپەرستەکان و هەڵگەڕاوەکان (المرتدین)، ئەمەش ڕای حەنەفییەکان و، زەیدییەکان و، ئەبو عوبەید، مالیك و، ئەحمەدیشە، لە یەکێ لە ڕیوایەتەکاندا.

**ڕای سێیەم:** هەموو نامسوڵمانان بێجگە لە هەڵگەڕاوەکان، بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، ئەم ڕایەش هی ئەوزاعیی و، ئەورِیی و، (فقهاء الشام) و، مالیکییەکانە، لەوەی کە لەمەزهەبیان دا باوە.

**ڕای چوارەم: ڕایەی بەندە:** پێم وایە سەرجەم مرۆڤەکان بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، بەمولحید و هەڵگەڕاوەکانیشەوە، واتە: ئەوانەی مسوڵمان بوون و هەڵگەڕاونەتەوە.

بەڵگە و پاساویشم بۆ ئەم ڕایە ئەوەیە: خوای پەروەردگار ئیسلامی بۆیە ناردوە بۆ هەموو بەشەر، کە هەموو سەر زەوی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، ئنجا دایبنێ: ڕۆژێ دەوڵەتێکی ئیسلامیی پەیدا بوو و هەموو خڕۆکەی زەوی خستە ژێر ڕکێفی خۆی!

کەواتە: بەپێی ڕای یەکەمیان، تەنیا جوولەکەو نەصڕانیی و مەجووسییەکان، بۆیان هەیە لەژێر سایەیدا بژین! ئەدی بتپەرستەکان و مورتەد و مونافیقان چی لێ بکەین؟ دەبێ هیچیان نەمێنن!!

بەپێی ڕای دووەمیش دەبێ عەرەبە بتپەرستەکان و، هەڵگەڕاوەکان، سەرجەم قەلاچۆ بکرێن!

بەپێی ڕای سێیەمیش، هەموویان ڕێیان دەبێتەوە، بەڵام هەڵگەڕاوەکان، دەبێ تاقیان نەمێنێ!

ئنجا بۆیە من ئەو ڕای چوارەمم هەڵبژاردوە، چونکە دەڵێم: خوا سبحانە و تعالی ئەم سەر زەوییەی داناوە مرۆڤی تێدا تاقی بکاتەوە، کەواتە: دەبێ هەموو مرۆڤەکان بۆیان هەبێ تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن.

ئنجا هەڵگەڕاوە (مرتد) بەڵێ هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام، بەڵام خوا کە دەفەرمویٚ: [لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ]، وەك لەوناميلكەيەدا گوتوومە كەلە بەرگی دووەمی مەوسووعەی:{ئيسلام و دەوڵەتداريی}دا دەرم هێناوە[1]، بەناوونيشانی: (حوكمی هەڵگەڕانەوە لە ئيسلام) لەوێدا نووسيومە: كە خوا دەفەرمویٚ: {( لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ )، أي: ابتداءاً، وانتهاءاً}، يانی لەسەرەتاوە زۆريی لیٚ ناكریٚ بكرێتە مسوڵمان و، دواييش ئەگەر قەناعەتی بە ئيسلام نەما، هەر زۆريی لیٚ ناكریٚ بگوتریٚ: نەخێر دەبیٚ هەر مسوڵمان بی! بڵێ: ئاخر قەناعەتم نەماوە! پێی بگوتریٚ: نەخێر قەناعەتيشت نەمابیٚ، هەر دەبیٚ مسوڵمان بی! ئەمە وەك ئەوە وايە كەسێك بيەویٚ بەزۆر خواردنێك دەرخواردی كەسێك بدات، ئەويش هەرچەندە بڵێ: ئەو خواردنەم پیٚ خۆش نيە! پێی بڵێ: نا هەردەبیٚ پێت خۆش بیٚ! كە بێگومان شتی وا ناگونجیٚ و، ئەوە پێچەوانەی سروشتی شتانە.

هەڵبەتە من لەو سەرچاوەيەدا زۆر بەڵگەم هێناونەوە، بەڵام لێرە تەنيا ڕووحی شەريعەت و دەقەكانم كردوە بەبەڵگە.

ئەم دوو دەقەش لە سوننەتدا هاتوون، لەبارەی ڕێپێدانی هەڵگەڕاوان (مرتدّون) كە ببنە هاووڵاتيی دەوڵەتی ئيسلاميی:

١- (رَوى سعيد بن منصور في سننه) برقم (٢٥٨٨): {أنّ تُستُر كانت في صلح، فكفر أهلها، فغزاهم المهاجرون، فقاتلوهم، فهزمهم المسلمون وسَبُوهم، فأصاب المسلمون نساءَهم، حتّى ولد لهم منهن، قال: وقد رأيت بعض الأولاد من تلك الولادة، قال: فأمر عمر بن الخطاب بِمَنْ سُبِيَ منهم، فَرُدُّوا على حريتهم، وفَرّق بينهنّ وبين سادتهن، وقال لي: قد كفيتك ذلك}.

واتە: سەعيدی كوڕی مەنصوور لە (سنن)ی خۆيدا گێڕاويەتەوە كە: خەڵكی (توستور) [قەڵايەك و، شارێك بووە لە ئێران گيراوە] لەحاڵەتی سوڵح دابوون، دوايی

---

(١) بڕوانە: مەوسووعەی: ئيسلام و دەوڵەتداريی، كتێبی دووەم: بنەماكانی سيستمی حوكمڕانيی لە ئيسلام دا، لاپەڕە: ٢٠٣-٢٣٩، مافە فيكرييەكان: ئازاديی بڕواهێنان و هەڵبژاردنی ئايين.

خەڵکەکە کافر بۆتەوە [مسوڵمان بوون و هەڵگەڕاونەتەوە] کۆچکەرانیش [دیارە ئەو سوپایە زیاتر هی کۆچکەران بووە] جەنگیان لەدژ کردوون و شکاندوویانن و، ژن و منداڵەکانیان بەدیل گرتوون، تەنانەت منداڵیشیان لێیان بووە ـ ڕاوی دەڵێ: هەندێك منداڵی ئەو کەنیزەکانیشم بینیون ـ عومەری کوڕی خەتتابیش (رضي الله عنه) فەرمانی کردوە: ئەوانەیان کە بەدیل گیراون لە ژن و منداڵەکانیان [مسوڵمانیش نەبوون] بگێڕدرێنەوەو بەر بدرێن و [سەرانەیان لەسەر دابنرێ] و، لەگەڵ خاوەنەکانیان لەیەك جیاکرانەوە و گوتی: ئەوەم لەکۆڵ تۆ کردەوە.

ئنجا هەندێ دەڵێن: هەڵگەڕاوە، سزاکەی کوشتنە، کەچی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) ئاوای کردوە!.

**٢**- (روى عبدالرزاق في المصنف) برقم: (١٨٧٠٤): {أن قوماً أسلموا (من أهل الجزيرة) ثم لم يمكثوا إلا قليلاً حتى ارتدوا، فكتب فيهم (ميمون بن مهران) إلى عمر بن عبد العزيز فكتب إليه عمر: أن رُدَّ عليهم الجزية ودَعْهُم}.

واتە: کۆمەڵێك لە ئەهلی جەزیرە (لە عێراق) مسوڵمان بوون، دوایی زۆری پێ نەچوو هەڵگەڕانەوە، (مەیموونی کوڕی میهڕان) [کە یەکێ بووە لە زانایانی بەرجەستە] نامە دەنووسێ بۆ عومەڕی کوڕی عەبدولعەزیز کە چییان لێ بکەین؟ [ئنجا ئەگەر سزای هەڵگەڕاوە (مرتد) هەر کوشتن بووایە، پێویستیی نەدەکرد پرسی پێ بکا، بەڵام زانیویەتی وا نیە] ئەویش نامەی بۆ نووسی: سەرانەیان لێ وەربگرەو لێیان گەڕێ.

لێیان گەڕێ، یانی: هەر لە دەوڵەتی ئیسلامییدان و هاووڵاتیین.

کەواتە: ئەوە ڕاست نیە کە هەڵگەڕاوەکان ڕێیان نادرێ: هاووڵاتیی بن لە دەوڵەتی ئیسلامییدا.

باسی
پێنجەم

## سەرانە لێ وەرگیران، مەرجی هاووڵاتیی بوونی نا مسوڵمانان نەبووە، لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا، بەڵکو ڕەمزو نیشانەی لاشەڕیی و تەباییان بووە

یەکێك لەو هەڵانەی زۆر باون، ئەوەیە کە ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ و دەستەڵاتی هەبێ، هەموو ئەوانەی کە نامسوڵمانن (کە زیاتر مەبەستیان پێ خاوەن کتێبەکان بووە) دەبێ سەرانە بدەن! بەڵام ئەوە کە بۆتە شتێکی باو، وانیە، یانی: ڕاست نیە کە ئیسلام لە غەیری خۆی قبووڵ نەکات هاووڵاتیی بێ، مەگەر سەرانە بدات.

ئەمەش چوار بەڵگە بۆ ئیسپاتی ئەوە کە سەرانە (جزية) لێوەرگیرانی نامسوڵمانان، بەمەرج نەگیراوە، بۆ بەهاووڵاتیی لەقەڵەم دانیان لەدەوڵتی ئیسلامیی دا:

## بەڵگەی یەکەم: ئەو ڕێککەوتننامەیەی نێوان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و جوولەکەکانی مەدینە:

شافیعیی گوتوویەتی: {لَم أَعْلَمْ مُخَالِفًا من أَهْلِ الْعِلْمِ بِالسِّيَرِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى اللَّهُ عليه وسلم لَمَّا نَزَلَ بِالْمَدِينَةِ، وَادَعَ يَهُودَ كَافَّةً على غَيْرِ جِزْيَةٍ}[1].

واتە: هیچ کەسێکم نەبینیوە لەشارەزایان بەسیرەو ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەهەڵسوکەوت لەگەڵ نامسوڵمانان، [وشەی (سِيَر) مەبەستیان پێی ئەوە بووە]، کە کاتی خۆی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چووە بۆ مەدینە، پەیمانی لەگەڵ جوولەکەکاندا بەستوە، بەبێ سەرانە لێ وەرگرتن.

(إبن تيمية)ش دەڵێ: {النبـي صلى الله عليه و سلم لما قدِمَ المدينة وادَعَ جميع اليهود الذين كانوا بها موادعةً مطلقة، ولم يضرِبْ عليهم جزيةً، وهذا مشهور عند أهل العلم بمنزلة المتواتر بينهم}[2].

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاتێ چوو بۆ مەدینە، پەیمانی بەست لەگەڵ هەموو جوولەکەکانی مەدینەدا [(موادعة) واتە: پەیمان بەستنێك کە: شەڕمان مەکەن شەڕتان ناکەین] موادەعەیەکی ڕەها و سەرانەی لەسەر پێویست نەکردن، ئەمە لە نێو ئەوانەدا کە زانان، هێندە بڵاوە، لە پلەی تەواتوردایە.

---

(١) الأم، ج٩، ص١٧٣.

(٢) الصارم المسلول على شاتم الرسول، ص٦٢.

بەڵگەی دووەم: چەند ئایەتێك لەو بارەوە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ الأنفال٦١.

واتە: ئەگەر بەرامبەرەکانت (ئەهلی کوفر، ئەوانەی کە لە دژی ئیسلام دەجەنگن) باڵیان شۆڕ کرد بۆ ئاشتیی، تۆش باڵی بۆ شۆڕ بکە و پشت بەخوا ببەستە.

ئنجا دیارییش نەکراوە لەبەرانبەر چی دا؟ کەواتە: چەمکەکەی ڕەهایە.

٢- هەروەها ئایەتەکانی: (٨٩ و٩٠) لە سووڕەتی (النساء)دا، هەر زۆر ڕوونن لەوبارەوە، خوا دەفەرموێ:

﴿فَإِن تَوَلَّوۡا۟ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَیۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُوا۟ مِنۡهُمۡ وَلِیࣰّا وَلَا نَصِیرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِینَ یَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَیۡنَكُمۡ وَبَیۡنَهُم مِّیثَـٰقٌ أَوۡ جَاۤءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن یُقَـٰتِلُوكُمۡ أَوۡ یُقَـٰتِلُوا۟ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَاۤءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَیۡكُمۡ فَلَقَـٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ یُقَـٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡا۟ إِلَیۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَیۡهِمۡ سَبِیلࣰا ﴿٩٠﴾﴾.

واتە: ئنجا ئەگەر ئەوانە پشتیان هەڵکرد، بیانگرن و، بیانکوژن لە هەر شوێنێك چنگتان کەوتن و، هیچ کەسیان لێ مەگرن بە دۆست و یارمەتییدەر.

واتە: ئەهلی کوفر کە لەدژی ئەهلی ئیسلام دەجەنگن (دوایی کۆمەڵێکیان لێ هەڵداوێرێ و جیایان دەکاتەوە و دەفەرموێ): [إِلَّا ٱلَّذِینَ یَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَیۡنَكُمۡ وَبَیۡنَهُم مِّیثَـٰقٌ]، واتە: جگە لەوانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ کۆمەڵێك دا هەیە، [عەشیرەتێك، قەوارەیەکی سیاسیی] کە ئەو کۆمەڵە، ئەو قەوارە سیاسییەش لەگەڵ ئێوەدا پەیمانی هەیە.

[أَوۡ جَاۤءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن یُقَـٰتِلُوكُمۡ أَوۡ یُقَـٰتِلُوا۟ قَوۡمَهُمۡ]، واتە: یان [هاوپەیمان نین لەگەڵ قەوارەیەکی سیاسیی دا کە هاوپەیمانی ئێوەیە، یاخود پەیوەندییان نیە لەگەڵ قەوارەیەکی سیاسی دا کە لەگەڵ ئێوەدا هاوپەیمانن] بەڵام هاتوون نە پێیان خۆشە لە دژی ئێوە بجەنگن، نە لەدژی خەڵکەکەی خۆشیان [کە خەڵکەکەی خۆیان کافرن و، ئەوانیش هەر کافرن، بەڵام حەز دەکەن لا شەڕ بن، بێ لایەن بن].

ئنجا دەفەرموێ: [وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ]، واتە: ئەگەر خواش ویستبای: ئەوانەی بەسەر ئێوەدا زاڵ دەكردو لەدژی ئێوە دەجەنگان.

[فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ] ئنجا ئەگەر ئەوان كەناریان گرت، [فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ] لەدژتان جەنگیان نەكرد و [وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ] لەگەڵ ئێوەدا ئاشتییان نیشاندا [فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا] ئەوە خوا هیچ ڕێیەكی بۆ ئێوە دانەناوە كە شەڕیان لەدژ بكەن و، زیانیان پێ بگەیەنن، واتە: مادام ئەوان داوای بێ لایەنیی بكەن، ئێوەش ئەو بێ لایەنیی و ئەو تەباییەیان لێ قبووڵ بكەن.

## بەڵگەی سێیەم: ڕێككەوتننامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ (بنو ضمرة)دا:

لەسەرچاوەكانی سیرەدا هاتوە: {خرج رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لاثنتي عشرة ليلةً خلت من صفرٍ في السّنة الثانية للهجرة، في سبعين رجلاً ليس فيهم أنصاريٌّ، يريد قريشاً وبني ضمرة، فاتفق له موادعة سيد بني ضمرة، وهو مجديّ بن عمرو واستقرت المصالحة على أن: لا يغزو بني ضمرة ولا يغزونه، ولا يُكْثِروا عليه جمعاً، ولا يُعينوا عليه عدواً}[1].

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوازدە (١٢) شەو تێپەڕی بوون لە مانگی (صفر) لەساڵی دووەمی كۆچیی، خۆی و حەفتا (٧٠) كەس دەرچوون، كەهیچ كام لە پشتیوانانیان لەگەڵ نەبوون [هەموویان لە جەنگاوەرانی كۆچكەر بوون] مەبەستی بوو بەرەو هۆزی قورەیش و هۆزی (بنو ضمرة) بچێ، ئەوە بوو كە ڕێككەوت لەگەڵ سەرۆكی (بنو ضمرة)دا كە ناوی مەجدیی كوڕی عەمرە و، بەو شێوەیە ڕێككەوتن كە: نە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و مسوڵمانان هێرش بكەنە سەر (بني ضمرة) و نە ئەوانیش هێرش بكەنە سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و مسوڵمانان، هەروەها هیچ دوژمنێك زۆر نەكەن لە دژی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوكاریی

---

(١) مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبي (صلى الله عليه وسلم) والخلافة الراشدة، رقم (١٦٨) ص (٢٦٧).

هیچ دوژمنێکیش نەکەن. [واتە: نەوەك سوپا بەشداریی هیچ هێزێك بکەن کە دژی مسوڵمانانن، نە وەك هاوکاریی ماددیی و چەك و چۆڵیش].

## بەڵگەی چوارەم: ڕێککەوتنی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) لەگەڵ (العرب الجراجمة)دا:

(البلاذري) دەڵێ: {صالَحَ عُمَرُ العَرَب الجراجمة الجبلية الساكنة على حدود سورية، حينما فتح الشام، على أن يكونوا أعواناً للمسلمين وعيوناً ضد الروم، شريطة أن لايَطْلُبَ منهم الجِزْيَة}[1].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) ئاشتەوایی و ڕێککەوتن (إتفاقية)ی کرد لەگەڵ عەرەبی (الجراجمة)ی چیایی، کە لە تخوبی سنوورەکانی سووریا نیشتەجێن، کاتێك کە شام ئازاد کرا، ڕێککەوتنەکەیان وابوو کە ئەوان: لە ڕووی هەواڵگرییەوە یارمەتیی مسوڵمانان بدەن، لە دژی ڕۆمەکان، بەڵام بەمەرجێك سەرانەیان لێ داوا نەکات. [بەس هاوکاریی هەواڵگریی بکەن].

ئەمانە هەموویان بەڵگەی بەهێزن، لەسەر ئەوە کە مەرج نیە هەر کۆمەڵە خەڵکێك [ئنجا چ قەوارەیەکی سیاسیی بێ، چ عەشیرەتێك بێ، هەرچی بن] ئامادەبوون لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بن، حەتمەن لەسەریان پێویست بێ: سەرانە(جزية) بدەن، ئەوە هیچ ئەصڵ و بنەمایەکی نیە.

ئەدی ئایا سەرانە(جزية) چی دەگەیەنێ؟!

سەرانە (جزية) بریتی بووە لە: ڕەمزو نیشانەیەك کە ئەو لایەنەی سەرانە دەدا، لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی، لە حاڵەتی ئاشتیی دایە، ئنجا ئەگەر ئەو پیشاندانی حاڵەتی ئاشتییە، بەشتێکی دیکەش بێتە دی، وەك هاوکاریی هەواڵگریی، یاخود: شەڕم مەکەو شەڕت ناکەم! ئەوە بەهەمان شێوەیە، کەواتە: وەرگرتنی سەرانە، شتێکی حەتمیی و پێویست نەبووە.

---

(١) فتوح البلدان، ص ٢٠٩.

باسی
شەشەم

## مافەکانی نامسوڵمانان
## لە دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامییدا

ئەم بابەتەش بابەتێکی زۆر بەربڵاوە و، لە کتێبی چوارەمی: مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی} داو[١]، لەکتێبی دوازدەیەمی مەوسووعەی: (الإسلام کما یتجلّی في کتاب الله)دا[٢] بەدرێژیی لەبارەیەوە دواین و، لێرەش دا بەکورتیی لە سێ (٣) بڕگەدا باسی دەکەین:

**بڕگەی یەکەم:** مافە کەسیی و تایبەتییەکان.

**بڕگەی دووەم:** مافە فیکرییەکان.

**بڕگەی سێیەم:** مافە سیاسییەکان.

---

(١) {نامسوڵمانان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا}.

(٢) {الإسلام: نظرة سدیدة تجاه الناس وتعامل صحیح معهم}.

## بڕگەی یەکەم: مافە کەسیی و تایبەتییەکان:

ئەم مافانەش بەگشتی سێ جۆرن.

### جۆری یەکەم: مافی ژیان و هێمنیی و ئاساییش:

دەبێ هەر کەسێك لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژی: ژیانی و، هێمنیی و ئاسایشی، پارێزراو بێ.

لەو بارەشەوە دەق زۆرن، بۆنموونە:

١- خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ﴾ (المائدة:٤٥).

واتە: لەسەرمان پێویست کردبوون کە نەفس بەنەفسە (هەرکەس کەسێکی کوشت بەئانقەست، دەکوژرێتەوە).

٢- هەروەها خوادەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ ﴾ (البقرة:١٧٩)، واتە: لەتۆڵەدا ژیانتان بۆهەیە...

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {أَلَا مَنْ ظَلَمَ مُعَاهِدًا، أَوْ انْتَقَصَهُ، أَوْ كَلَّفَهُ فَوْقَ طَاقَتِهِ، أَوْ أَخَذَ مِنْهُ شَيْئًا بِغَيْرِ طِيبِ نَفْسٍ، فَأَنَا حَجِيجُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} أخرجه أبو داود برقم (٣٠٥٢)، والبيهقي برقم (١٨٥١١)، قال الألباني صحيح.

واتە: ئاگاداربن! هەر کەسێك ستەم بکا لە هاوپەیمانێك، یاخود مافی لێ پێشێل بکات، یاخود شتێکی لێ داوا بکات لە توانایدا نەبێت، یان شتێکی لێ وەربگرێ، بەبێ دڵ پێ خۆش بوونی خۆی، لە ڕۆژی قیامەتدا من دێمە بەرامبەری و، بەرگریی دەکەم لەو هاوپەیمانە ستەم لێ کراوە.

٤- هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: {مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا تُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا} أخرجه أحمد برقم (٦٧٤٥)، والبخاري برقم (٢٩٩٥)، والنسائي برقم (٤٧٥٠)، وابن ماجه برقم (٢٦٨٦).

واتە: هەر کەسێك هاوپەیمانێك بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکات، هەر چەندە بۆنەکەشی چل (٤٠) ساڵ ڕێ دەڕوا.

ئنجا شەرعزانان لەوەدا کە ئەگەر مسوڵمانێك هاووڵاتییەکی نامسوڵمان بکوژێ، ئایا پێی دەکوژرێتەوە، یان نا؟ ڕا جیاییان هەیە، بەڵام من ئەو ڕایەم پێ پەسندە، کە پێی دەکوژرێتەوە، چونکە ئایەتەکان بە ڕەهایی فەرموویانە، ئەدی بۆچی زانایان ڕاجیاییان هەبووە؟ چونکە ئەو کاتە ئەوانەی کە جوولەکەو نەصرانیی و... هتد بوون، بەزۆریی لە حاڵەتی جەنگدا بوون، هەڵبەتە بابایەکیش کافری جەنگیی بێ و، لەحاڵەتی جەنگدا بێ لە دژی مسوڵمانان، ئەگەر بکوژرێ، خوێنەکەی بەبەلاش دەچێ.

٥- هەروەها پێغەمبەر دەربارەی پاراستنی مافی هاووڵاتییانی نامسوڵمان، دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ فِي الدُّنْيَا} أخرجه أحمد برقم (١٥٣٦٦)، ومسلم برقم (٢٦١٣)، والنسائي في الكبرى برقم (٨٧٧١)، والطبراني برقم: (٤٣٧)، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (٣٠٤٥).

واتە: بێگومان خوا ئەشکەنجەی ئەوانەی دەدات، کە لە دنیادا ئەشکەنجەی خەڵك دەدەن.

ئنجا لە کاتێکدا هاوەڵێك ئەوەی گوت، گوتی: گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، کە وایفەرمووە، کەیەکێك لە والییەکان لەو حوکمڕانانەی کە لەبەر دەستی موعاویەدا خوا لێی ببورێ، بوون، هەندێك لە ئەهلی کیتابی ڕاگرتبوون لەبەر خۆرەتاو، لەسەر ئەوەی کە سەرانەیان نەدابوو!

جۆری دووەم: مافی نیشتەجێ بوون و هاتن و چوون:

**یەكەم:** زۆر جار خەڵك وا دەزانێ: تەنیا لە سیرەدا هاتوە، بەڵام ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم): {لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ} أخرجه أحمد برقم (١٣٣٧٢)، والبخاري برقم (٣٨٥)، وأبو داود برقم (٢٦٤١)، والترمذي برقم (٢٦٠٨) وقال: حسن صحيح غريب، والنسائي برقم (٣٩٦٧)، وابن حبان برقم (٥٨٩٥)، والدارقطني (٢٣٢/١)، والبيهقي برقم (٢٠٣١).

واتە: بۆ نامسوڵمانان هەمان ماف هەیە كە مسوڵمانان هەیانە و، هەمان ئەرك كە لەسەر مسوڵمانانە لەسەر ئەوانیشە.

واتە: ئەو ئەركانەی كە لەگەڵ دینەكەیاندا تێك ناگیرێن، ئەگەرنا ئەوان لێیان داوا نەكراوە كە بەشداریی جەنگ و جیهاد بكەن، چونكە جەنگ و جیهاد كردن لەئیسلامدا، فەریزەیەكی تایبەتە بەمسوڵمانەوەو وەك دینداریی پێی هەڵدەستن.

**دووەم:** لەو پەیمانە دا كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ نەصرانییەكانی نەجراندا بەستوویەتی، هاتوە: {...لأني أعطيتهم عهد الله على أنَّ لهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين، وعلى المسلمين ما عليهم، بالعهد الذي آستوجبوا حقَّ الذِّمام، والذَّبَّ عن الحرمة، واستوجبوا أن يُذَبَّ عنهم كلُّ مكروه، حتى يكونوا للمسلمين شركاء، فيما لهم وفيما عليهم}[1].

واتە: .. چونكە من پەیمانی خوام پێداون: هەمان ماف كە بۆ مسوڵمانان هەیە، بۆ وانیش هەبێ و، هەمان ئەرك كە لەسەر مسوڵمانانە، لەسەر ئەوانیش هەبێ، مسوڵمانانیش هەمان ئەركیان لەسەر شانە كە ئەوان لەسەریانە، بەو پەیمانەی كە لە بەینیاندا بەستراوەو، مافیانە كە بەڵێنیان لەگەڵ ببرێتە سەر، هەروەها مافیانە كە بەرگریی بكرێ لە كەرامەت و حورمەتیان و، لەسەر ئێمەیان پێویست كردوە كە هەموو نارەحەتیی و ناخۆشییەكیان لێ دوور بخرێتەوە

---

(١) مجموعة الوثائق، رقم ٩٧.

- واتە هەموو دەستدرێژییەك - هەتا وەك مسوڵمانان هاوبەش دەبن، لەمافەکان و لە ئەرکەکاندا.

## جۆری سێیەم: مافی کارو کاسبیی و دابین کردنی پێداویستییەکانی ژیان:

لەوبارەوەش ئەم سێ بەڵگەیە دەهێنینەوە:

أ- خوای پەروەردگار بەگشتی ڕووله مرۆڤ دەکات و، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ البقرة: ٢٩.

واتە: (خوا) ئەوکەسەیە کە ئەوەی لەزەوی دایە، بۆهەموانتانی دروستکردوە.

ب- هەروەها خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرحمن.

واتە: (خوا) زەوی بۆ خەڵك داناوە.

مانای وایە: خوا بەگشتی ئەم سەر زەوییەی بۆ هەموو مرۆڤەکان داناوە و، هەموو مرۆڤەکان بۆیان هەیە تێیدا بێن و بچن و کارو کەسابەت بکەن.

ج- لەو ڕێککەوتنەدا کە خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) لەگەڵ ئەهلی کیتابدا کردوویەتی هاتوە:{وَجَعَلْتُ لَهُمْ أَيُّمَا شَيْخٍ ضَعُفَ عَنْ الْعَمَلِ, أَوْ أَصَابَتْهُ آفَةٌ, أَوْ كَانَ غَنِيًّا فَافْتَقَرَ، وَصَارَ أَهْلُ دِينِهِ يَتَصَدَّقُونَ عَلَيْهِ, طُرِحَتْ جِزْيَتُهُ, وَعِيلَ مِنْ بَيْتِ مَالِ الْمُسْلِمِينَ وَعِيَالُه}[1].

واتە: بەپێی ئەو ڕێککەوتنە وامان بۆ بڕیار داون، کە هەر پیاوێکی بەتەمەن کە نەیتوانی کار بکا، یاخود تووشی نەخۆشییەك بوو، یاخود پێشتر دەوڵەمەند بووە، بەڵام دوایی هەژار کەوتوە، بەشێوەیەك کە ئەهلی دینەکەی خۆی، هاوکارییان دەکرد، سەرانەی لەسەر لا دەچێ و، لە خەزێنە (بيت المال)ی مسوڵمانان دەبێ خۆی و ئەوانەی کە نەفەقەیان لە سەریەتی، مەسرەفیان بکرێ [واتە: مووچەیان بۆ ببڕێتەوە].

---

(١) الخراج، ص ١٥٥-١٥٦.

### بڕگەی دووەم: مافە فیکرییەکان:

ئەمانیش بۆسێ جۆری سەرەکیی دابەش دەبن:

### جۆری یەکەم: مافی دەربڕینی بیروڕا:

هەموو هاوڵاتییانی کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، بۆیان هەیە ئازادانە بیروڕای خۆیان دەربڕن، چونکە:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾ (البقرة:٢٥٦). کەپێشتر چەندجارێك مانامان کردوە.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ (الكهف:٢٩)، ئەمیشمان چەند جارێك مانا کردوە.

### جۆری دووەم: مافی وتاردان و نووسین و چالاکییە کلتوورییەکان:

لەوبارەوەش ئەم سێ دەقە بەڵگە دەهێنینەوە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ (البقرة:١١١).

بە خاوەن کتێبەکان دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگەکەتان بێنن!

کە بێگومان ئەمەش دەرگای وتوویژ و گفت و گۆکردن، کردنەوەیە.

٢- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾ (العنكبوت:٤٦).

واتە: بەچاکترین شێواز نەبێ، مشت و مڕ لەگەڵ خاوەن کتێبەکان دا مەکەن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ البقرة، واتە: بڵێ بەڵگەتان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵگەتان بێنن! هیچ کەس یەکسەر بەڵگەکەی ناهێنێ بە ڕووتیی! بەڵکو قسە دەکاو، وتوویژ دەکاو، دیالۆگ دەکا، جاری وایە کەسێك سەعاتێك قسە دەکات، ئنجا دوو بەڵگە دێنێتەوە، مانای وایە: نامسوڵمانەکان مافی ئەوەیان هەیە بەرگریی لە دینی خۆیان بکەن و قسە بکەن و، بەڵگە بێننەوە.

دیسان خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا بەباشترین شێوە نەبێ وتووویژ مەکەن، مانای وایە: لەسەر مسوڵمانان پێویستە باشترین کەش و هەوای دیالۆگ و مشتومڕکردن لەگەڵ مسوڵمانان دا بڕەخسێنن و، بەچاکترین شێوازیش بیاندوێنن.

٣- هەرلەو بارەوە سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ ڕووداوێکی مێژوویی کە لە (صحیح البخاري)یدا هاتوە بە ژمارە (٤١١٩) و، (إبن جریر) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی لە (إبن عباس)ەوە[١] و، (البیهقي) لە (دلائل النبوة)دا هێناویەتی[٢]، هەروەها (الطبراني)یش لە (الأوسط)دا بەژمارە: ٣٩٨، هێناویەتی و، (البیهقي) دووبارە لە (دلائل)دا هێناویەتی و[٣]، (الحاکم) لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی، لە (المستدرك)دا[٤]، بەسەرهاتەکەش ئاوا بووە:

وەفدێکی نەصرانییەکان لە نەجرانەوە هاتوە، وتوێژ بکات لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) و، ئەگەر قەناعەتیان هات، مسوڵمان ببن و، ئەگەر قەناعەتیشیان نەهات، هیچ، هاتوون سێ شەوو سێ ڕۆژ (بەلای کەمەوە) لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بوون لە مەدینە و، وتووێژیان کردوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، کە درێژییەکی هەیە و،

---

(١) جامع البیان للطبري، ج٣ص ٣٠٥.

(٢) دلائل النبوة، ج٥ ص ٣٨٤.

(٣) دلائل النبوة، ج ٥ص، ٣٨٢

(٤) المستدرك ج٢ص ٥٩٣.

ئەو ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی (آل عمران) بەو بۆنەیەوە دابەزیون، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بەدڵنیاییی وێنەی عیسا لەلای خوا، وەك وێنەی ئادەمە کە لەگڵ دروستیکردو پێی فەرموو: ببە، یەکسەر بوو.

ئایەتەکانی پێشێ و دوایەش هەموویان لەو بارەوەن، سێ شەوو سێ ڕۆژان ئەوانە لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بوون و وتووێژیان کردوە، گوتوویانە: عیسا (علیه السلام) کوڕی خوایە و، عیسا (علیه السلام) بەشێکە لەخوا و، ئەو قسانەی کە نەصرانییەکان دەیانکەن، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) وتووێژی لەگەڵدا کردوون، موناقەشەی لەگەڵدا کردوون و، لەمزگەوتی پێغەمبەریشدا (صلی الله علیه وسلم) پشوویان داوە، (ئەو کاتە هۆتێل و موتێل شوێنی حەوانەوەو ئیسراحەت، نەبوون)، ئنجا دواییش چوونەوەو مسوڵمانیش نەبوون!

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە: ئیسلام بە باخەڵ فەراحیی و، سینە فراوانیی، مامەڵە دەکات لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی کە لە سایەی دەوڵەتەکەیدا دەژین، چونکە بەسەرهاتی نەصرانییەکانی نەجران، لە ساڵی نۆیەم و دەیەمی کۆچییدا، واتە: ساڵێك دوو ساڵ پێش کۆچیی دوایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، کە ئیسلام لەو پەڕی دەسەڵاتدا بووە.

## جۆری سێیەم: ئازادیی فێرکردن و فێربوون:

نامسوڵمانانی هاووڵاتیی حەقی خۆیان بووە و، حەقی خۆیانە، خەڵکەکەی خۆیان فێری دینی خۆیان بکەن و، فێری دینەکەی خۆیان ببن، بەڵام ئایا هەقیانە لە ڕاگەیاندندا (باسی ئایینی خۆیان بکەن)؟ پێم وایە: بەڵێ، چونکە ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: [وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ]، شەڕەقسە (جدال)

ئەگەر جاران لە ژوورێك دابووە، ئێستا لە بەرچاوی كەناڵێكی تەلەفزیۆنیی دادەنیشن، خواش بەڕەهایی دەفەرموێ: موجادەلەیان لەگەڵدا مەكەن، مەگەر بە باشترین شێوە، هیچ قەید و مەرجی ئاشكرا و پەنهانیشی، نەخستۆتە سەر! هەروەها كەدەفەرموێ: [قُلْ هَاتُواْ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ] ڕەنگە یەكێ بڵێ: یانی: لە شوێنی خۆیان، بەڵام ئەوەش ڕاست نیە، چونكە خوای پەروەردگار كە باسیان دەكات، مسوڵمانان نەچوون لەوێ لەكونی ژووری موناقەشەیان لەگەڵدا بكەن! بەڵكو ئەوان هاتوونە مزگەوتی مسوڵمانان، هاتوونە مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) !!

بەڵێ هەندێ كەس: دەیەوێ ئەو دەقانە مل پێ بسووڕێنێ و، لەگەڵ واقیعێكدا بیانگونجێنێ، كە دوایی مسوڵمانان لەو واقیعە سیاسییەدا ژیاون و، زۆر تەنگیان هەڵچنیوە بەهەندێك لەئەهلی كیتاب و ئەوانی دیكەش! بەڵام هەق ئەوەیە كە هەڵس و كەوت و واقیعی لار و خوار، بەپێی پێوەر و تەرازووی شەریعەت ڕاستبكەینەوە، نەك بەپێچەوانەوە!

### بڕگەی سێیەم: مافە سیاسییەکان:

ئەمانیش بۆسێ جۆری سەرەکیی دابەش دەکەین:

**یەکەم:** مافی هاووڵاتیی بوون.

**دووەم:** مافی بەئەستۆ وەرگرتنی ئەرکە گشتییەکان.

**سێیەم:** مافی کۆبوونەوە و پێکهێنانی ڕێکخراوی سیاسیی و مەدەنیی.

### جۆری یەکەم: مافی هاووڵاتیی بوون: (حق المواطنة):

(المواطنة) یانی چی؟ (الكاساني) دەڵێ: {والذِّمِّيُّ مِن أهلِ دارِ الإسلام}[1]، دەڵێ: هاوپەیمان لە خاوەنانی مەنزڵگای ئیسلامە. [ئەوەی ئێمە بە زاراوەی ئەمڕۆ دەڵێین: هاووڵاتیی(مواطن) ئەوکاتە پێیان گوتوە:(مِن أهل الدار)].

٢- (السنهوري) دەڵێ: {المواطَنَة: مِعيارٌ سياسيٌ ولَيس مِعياراً عَقَدياً}[2]، واتە: هاووڵاتیی بوون پێوەرێکی سیاسییە و، پێوەرێکی عەقیدەیی نیە. [ئەوەی کە لەگەڵ عەقیدەتدا نەبێ، نەتوانێ لە وڵاتتدا بژی].

٣- (د. فتحي الدريني) دەڵێ: {وإنّ أساس المواطنة: الولاء للدولة}[3]، واتە: بناغەی هاووڵاتیی بوون، سەر بەدەوڵەت بوونە.

لە ئایەتی ژمارە (٧٢)ی سوورەتی (الأنفال)دا خوای کاربەجێ، دەفەرموێ:

---

(١) بدائع الصنائع، ج ٥، ص٤٨١، کتێبێکی زۆر مەشهوورە لە فیقهی حەنەفیی دا.

(٢) فقه الخلافة وتطورها.

(٣) خصائص التشريع الإسلامي في السياسة والحكم، ص٨٤.

[...وَالَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ].

باسی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیی دەکا: کۆچکەران، ئنجا پشتیوانان، دوایی دەفەرموێ: ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە، بەڵام کۆچیان نەکردوە، ئێوە هیچ پەیوەندییەکتان پێیانەوە نیە، هەتا کۆچ دەکەن و، ئەگەر لەکارێکی دینییشدا داوای یارمەتییان لێ کردن، هاوکارییان بکەن [ئەگەر کەسێك زوڵمی دینیی لێ کردن] [إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ]، واتە: مەگەر لە دژی کۆمەڵێك کە لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان هەیە [واتە: قەوارەیەکی سیاسیی زوڵم دەکات لە هەندێك لە مسوڵمانان، ئەو مسوڵمانانەش هانا دەبەنە بەر دەوڵەت، دەوڵەتی ئیسلامیی دەبێ بە دەمیانەوە بچێ، بەڵام بە مەرجێك ئەو قەوارە سیاسییە کە زوڵمی لە مسوڵمانان کردوە، لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا هاوپەیمان نەبێ، ئەگەر هاوپەیمان بێ، هاوپەیمانەتییەکە بپارێزرێ باشترە، لە یارمەتیی دانی ئەو مسوڵمانە ستەملێکراوانە] تەماشای دووربینیی ئیسلام بکەن!!

ئەمە بە نسبەت مافی هاووڵاتیی بوونەوە، کەواتە: نامسوڵمانان مافیان هەیە و، ئەوانیش وەك مسوڵمانان هاووڵاتیین.

## جۆری دووەم: مافی بە ئەستۆوە گرتنی ئەرکە گشتییەکان:

پێشتریش باسمان کرد، کە زانایان و شەرعزانان زۆر باسی ئەم مەسەلەیان کردوە، بەڵام شەرعزانان، هەتا لە قورئان و سوننەتەوە نزیکتر بووبن، سینە فراوانترانە فەتواو قسەکانیان کردوە و، هەتا زیاتر پەیوەست بووبن بە واقیعە سیاسییەکەی خۆیانەوە، بەپێی واقیعی سیاسیی خۆیان قسەیان کردوە، بۆ وێنە: حوکمڕانێك جوولەکەو نەصرانییەکانی چەوساندۆتەوە، ئنجا ئەو مامۆستایە ئەو زانایە کە لەوکاتەدا بووە، وەك ئێستا دەبینن: ئەگەر موراعاتی وەزعە سیاسییەکەی کردبێ، بەگوێرەی ئارەزووی ئەو سوڵتەو دەسەڵاتە قسەی کردوە

و، ئەگەر موراعاتی دەقە شەرعیەکانیشی کردبێ، بەجۆرێکی دیکە قسەی کردوە، بەڵام ئەصڵی شەریعەت ئەوەیە کە هاووڵاتییان بەیەك چاو تەماشا دەکات: {لَهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين}، کە ئەوە تەعبیری پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا دیارە لە دەوڵەتی عەبباسییدا هەندێك لە نەصرانییەکان، زیاتر لە جارێك بوونە وەزیر، بۆ وێنە: (نصر بن هارون) لە ساڵی (٣٦٩ی کۆچیی)دا بۆتە وەزیر، هەروەها (عيسى بن نسطورس) لە ساڵی (٣٨٠ی کۆچیی)دا وەزیر بووە، لە دەوڵەتی عەبباسییدا، وەك لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتوە(١).

## جۆری سێیەم: مافی کۆبوونەوەو پێکهێنانی ڕێکخراویی سیاسیی و مەدەنیی:

دەتوانین لەوبارەوە زۆر بەڵگان بهێنینەوە، بەڵام تەنیا سێیان لێ بەنموونە دەخەینەڕوو:

١- خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف:٢٩)، واتە: هەر کەسێ حەز دەکات با ئیمان بێنێ و، هەر کەسێ حەز دەکات با بێبڕوا بێ.

٢- ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد: ڕێپێدانی مرۆڤەکان بە بێبڕوایی، لەهەمان کات دا ڕێپێدانیشیانە بەوەی خۆیان لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و مەدەنیی و فیکریی جۆراوجۆر دا ڕێکبخەن، وەك لەسەردەمی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی و بەدرێژایی تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامییش، لەڕۆژگاری ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانییەکاندا، هەروا بووە.

---

(١) غير المسلمين في المجتمع الإسلامي. د. يوسف القرضاوي، ص٢٤.

پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {لَهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين}[١]، هەڵبەتە ئەم بنەمایەش تێكڕای مافەكان دەگرێتەوە، لەپێشیانەوەش: مافی كۆبوونەوەو، پێكهێنانی حیزبی سیاسیی و، ڕێكخراوی مەدەنیی.

٣- {لليهود دينهم وللمسلمين دينهم}[٢] واتە: جوولەكە دینی خۆیان بەڕێوە دەبەن، مسوڵمانانیش دینی خۆیان، ئنجا لە دینی جوولەكان و لەدینی نەصڕانییاندا ڕێگا دراوە كە: بۆخۆیان كۆببنەوە و لەژێر ناوو نیشانێكی سیاسییدا، خۆیان ڕێك بخەن، كەواتە: ئەوە مافێكی سروشتیی و ڕەوای خۆیانە، كە خۆیان لە ڕێكخراوی پیشەیی و مەدەنیی، یان حیزبی سیاسیی دا ڕێك بخەن.



---

(١) أخرجه احمد: ١٣٣٧٢، والبخاري: ٣٨٥، وأبو داود: ٢٦٤١، والبخاري: ٢٦٠٨، والنسائي: ٣٩٦٧، وغيرهم.

(٢) مجموعة الوثائق السياسية، محمد حميد الله . الوثيقة رقم: ١، ص٥٧-٦٢، الفقرة: ٢٥.

## بـــەرایی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشی پێنجەمە، لەم تەوەری پێنجەمەی بابەتی فراوانی:

(بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا) کورتترین بەشی ئەم تەوەرەیە و، پوختە و خولاسەکەشی بریتییە لەهێنانەوەی چوار جۆرە بەڵگە، بۆ ئیسپاتی: ڕەوایی و بگرە پێویستبوونی:

(مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستبوونی نەتەوەکان)، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**بەڵگەی یەکەم:** بنەما قورئانییەکان.

**بەڵگەی دووەم:** ئامانجی نێرانی پێغەمبەران (علیهم السلام) چەسپاندنی دادگەرییە.

**بەڵگەی سێیەم:** بنەما عەقڵییەکان.

**بەڵگەی چوارەم:** ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان.

شایانی باسیشە بیروڕاو هەڵوێستی بەندە، لەڕووی بابەتی نەتەوایەتیی و مافی چارەنووس و، سەرجەم مەسەلە پەیوەندییدارەکانیەوە، لەکتێبی: (سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم)دا بەتێرو تەسەلی خراوەتە ڕوو. بەتایبەت لەچاپی چوارەمی دا، کە بەشی پێنجەمیشی لێ زیاد کراوە و ژمارەیەکی زۆر لەوتار و نووسین و هەڵوێستە فیکری و سیاسییەکانمی ـ کە پێشتر تێدانەبوون ـ گرتوونە خۆی.

بەڵگەی
یەکەم

## بنەما قورئانییەکان

لەقورئانی بەهێز و بەپێزدا، چەندان بنەما هەن کە: (خاوەنی چارەنووسی خۆبوون و ئیدارەی خۆ بەدەستبوونی نەتەوەکان) دەکەنە مەسەلەیەکی سەلمێنراوی نکووڵیی لێنەکراو، بۆنموونە، ئەم حەوت بنەمایە:

### ١- جێنشینی خوا بوونی مرۆڤ:

خوای زاناو شارەزا دەفەرمویٰ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرة: ٣٠).

واتە: یاد بکەوە! کاتێك پەروەردگارت بەفریشتەکانی فەرمووی: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم.

کەواتە: مرۆڤ جێنشینی خوایە، ئنجا مرۆڤ جێنشینی خوایە، خوا (عزوجل) بەڕەهایی فەرموویەتی، نەیفەرمووە: مرۆڤی عەرەب، مرۆڤی کورد، مرۆڤی عەجەم، مرۆڤی مسوڵمان، یان نامسوڵمان، مرۆڤی نێر، یان مێ، .. هتد، بەڵکو هەموو مرۆڤێك جێنشینی خوایە و، جێنشینی خواش، دەبیٰ ڕێزو حورمەتی لیٰ

بگیرێ و، دەبێ خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ، چونکە ئەگەر تاك تاکی مرۆڤەکان بەڕێز بن، دیارە بە کۆمەڵیشیان هەر بەڕێزن، وەك خوای دادگەر و کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: بەدڵنیایی ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە..

## ٢- مرۆڤ هەڵگری سپاردەی خوای پەروەردگارە:

وەك خوادەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾ (الأحزاب:٧٢).

واتە: ئێمە ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەویی و چیایەکان، کەچی نەیانتوانی هەڵی گرن و، لێی ترسان، بەڵام مرۆڤ هەڵیگرت.

کەواتە: مرۆڤ هەڵگری ئەمانەتی خوایە، ئنجا ئایا: مەخلووقێك ئەمانەتی خوای هەڵگرتبێ، دەکرێ ئازادیی و چارەنووس و ئیرادەی لێ زەوت بکرێ؟ نەخێر.

## ٣- خوا ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە مرۆڤان سپاردوە:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾ (هود:٦١).

واتە: خوا ئێوەی لە زەوییدا پێگەیاندوەو، ئاوەدانکردنەوەی زەویشی بەخۆتان سپاردوە

ئێمە لەم سەر زەوییە داندراوین، وەك مرۆڤ، تاکو ئاوەدانی بکەینەوە، بە جیاوازیی نەتەوەکان و، ڕەنگ و زمانەکانەوە.

٤- بەمەبەستی پێك ئاشنابوون و هاوکاریی پێکەوە کردن، خوا مرۆڤایەتیی بۆ چەند گەل و هۆزێك دابەشکردوە:

وەك خوا دەفەرموێ: [يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ﴿١٣﴾] الحجرات.

ئێستاش با بە کورتیی و لە حەوت (٧) بڕگەدا، تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکە بکەین:

١- [يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ]: ئەی خەڵکینە! ئەمە مرۆڤەکان هەموویان دەگرێتەوە، بە نێرو مێوە، بە ڕەش و سپییەوە، بە عەجەم و عەرەبەوە، هەموویان دەگرێتەوە.

٢- [إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم]: ئێمە دروستمان کردوون، کەواتە: هەموویان دروستکراوی خوان.

٣- [مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ]: لەنێر و مێیەك، یانی: هەموویان لە باب و دایکێکن.

٤- [وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ ]: گێڕاومانن بەچەند گەل و هۆزێك، هەموویان خوا گێڕاونی بەچەند گەل و هۆزێك و، هیچ کامیان ئیمتیاز و پلەی بەسەر ئەوانی دیکەدانیە.

٥- [لِتَعَارَفُوٓاْ ]: بۆ ئەوەش گێڕدراون بە چەند گەل و هۆزێك، تاکو پێك ئاشنابن و پێکەوە هاوکار بن.

٦- [إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ]: بێگومان ڕێزدارترتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە، یانی: مرۆڤەکان ئەوەیان لەلای خوا بەڕێزترە، کە پارێزکار ترە، نەك دەوڵەمەندتر، یان چی و چی تر.

٧- [إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ]: بەدڵنیایی خوازانای شارەزایە، یانی: کەسیش بۆی نیە بانگەشەی تەقوای زۆر بکات، چونکە هەر خوا زانای شارەزایە.

بەپێی ئەم بنەما قورئانییانە نەتەوەکان هەموویان وەك یەکن، وەك عەرەب دەڵێن: (على قدم المساواة) کەس لەکەس زیاتر مافی نیە، کەواتە: ئەگەر عەرەب و، فارس و، تورك و، ئەفغان و، پاکستان و، ئینگلیز و، کێ و کێ...، مافیان هەبێ، دەوڵەتیان هەبێ، کوردیش و هەر نەتەوەیەکی دیکەش، مافی هەیە خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ.



بەڵگەی دووەم

## ئامانجی نێردرانی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، چەسپاندنی دادگەرییە

خوا سبحانە و تعالى چۆن بۆمان باسی نێردرانی پێغەمبەران دەكات و، بۆچی ناردوونی؟ چەند جارێك ئەو ئایەتەمان هێناوە، ئایەتی ژمارە (٢٥) لەسوورەتی (الحدید):

[لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ]،

واتە: پێغەمبەرانمان (علیهم الصلاە والسلام) بەبەڵگە ڕۆشنەكانەوە ناردوون و كتێب و تەرازووشمان پێدا ناردوونە خوار، تاكو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن...

هەڵبەتە كاتێك خەڵك بەدادگەریی بەڕێوە دەچن، هیچ نەتەوەیەك مافی لاف لێدانی نابێ بەسەر نەتەوەیەكی دیكەدا، هەروەها هیچ تاكێك، هیچ عەشیرەتێك، هیچ ڕەنگێك و، هیچ ڕەگەزێك، هەموویان دەبێت بەیەك چاو تەماشا بكرێن.

## بەڵگەی سێیەم

### بنەما عەقڵییەکان

دەتوانین بۆ ئیسپاتی: (خاوەنی چارەنووسی خۆبوون و ئیدارەی خۆ بەدەستبوونی نەتەوەکان)، زۆر بنەمای عەقڵیی بهێنینەوە، یەکێك لەوانە:

بنچینەیەکی عەقڵیی و مەنتیقیی هەیە دەڵێ: دەبێ شتە وەك یەکەکان، مامەڵەیەکی یەکسانیان لەگەڵدا بکرێ و، شتە لێك جیاوازەکانیش، مامەڵەی جیاوازیان لەگەڵدا بکرێ، {التسوية بين المتماثلين، والتفرقة بين المختلفين}، ئنجا ئەو بنەمایە هەرچەندە زانایان بۆ (ئوصولی فیقە) بەکاریان هێناوە، بەڵام بنچینەیەکی عەقڵییە، کە ئەو شتانەی وەك یەکن، دەبێ وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵدا بکری، تەنانەت منداڵی گچکەش، ئەو بنچینەیە دەزانێ، بۆوێنە: تۆ وەك باب یان دایك: کوڕت هەیە، کچت هەیە، تۆ بێنە شتێك بدە بەکوڕەکە زیاتر، یان بەکچەکە زیاتر، ئەوەی کەمتری پێدراوە دەڵێ: بۆچی زیاترت داوە بەو؟ مرۆڤ بە فیترەت دەزانێ: کەمادام ئەویش منداڵەو ئەویش منداڵە، مادام وەك یەکن لەوەدا، کە هی باب و دایکێکن و، خوشك و بران، نابێ جیاوازییان پێ بکرێ، کە بێگومان لە ڕووی شەرعییشەوە هەر وایە.

پیاوێك بەناوی (بشیر) ڕۆژێك ویستی کۆیلەیەك بدات بە یەکێك لە کوڕەکانی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هات، گوتی: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)! تۆ شاهێدبە من ئەو کۆیلەیە دەدەم بە فڵان کوڕم، ئەویش فەرمووی: ئەی بەشیر! جگە لەم، کوڕی دیکەشت هەن؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: مەمکە بە شاهێد لەسەر زوڵم، من شاهێدیی نادەم لەسەر زوڵم، [دەبێ وەك یەك بیاندەیە][1].

مەبەستم ئەوەیە: گەلی کوردیش دەوڵەتی نیە، لەحاڵێك دا کە کوردیش وەك فارس و عەرەب و تورك و.. ئەو گەلانەی دیکە، نەتەوەو گەلە، ئایا بۆچی ئەوان هەیانبێ و کورد نەیبێ؟ ئەوە پێچەوانەی ئەو بنچینە عەقڵییەیە کە دەڵێ: دەبێ شتە وەك یەکەکان، مامەڵەی یەکسانیان لەگەڵدا بکرێ .

من سی و پێنج (٣٥) ساڵ لەمەو پێش (١٩٨٣ز) لە کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی)دا باسی ئەوەم کردوە کە مادام عەرەبستان هەیە، تورکمانستان هەیە، ئەفغانستان هەیە، پاکستان هەیە، عەجەمستان هەیە، کوردستانێکیش هەیە و، ئەگەر ئەو وڵاتانەی دیکە ئەو گەلانەیان تێدا دەژین، کوردستانیش گەلی کوردی تێدا دەژی و، کەئەو گەلانە دەوڵەتیان هەیە، گەلی کوردستانیش مافی خۆیەتی هەیبێ و ستەمە، نەیبێ!

---

(١) ئەمە دەقی فەرموودەکەیە:
{عن النُّعمان بن بشير رضي الله عنها أن أَباهُ أتى به رسولَ الله صلى الله عليه وسلم فقال" إني نَحَلْتُ ابنـي هذا غُلاماً كان لي، فقال رسولُ الله، يا بشير أَلَكَ وَلَدٌ سوى هذا؟ قال: نعم، قال: أَكُلُّهم وهَبْتَ لَهُ مِثْل هذا؟ قال: لا، قال: فَلا تُشْهِدْني إذاً، فإني لا أَشْهَدُ على جَوْرٍ} رواه البخاري: ٢٦٥٠، ومسلم ١٦٢٣.

بەڵگەی
چوارەم

## ڕێككەوتنامە نێودەوڵەتیەكان

هەڵبەتە دەگونجێ، لەوبارەوە ئاماژە بە زۆر شت بكرێ، بەڵام بەئاماژەكردن بەشەش(٦)لەو ڕێككەوتننامە نێودوڵەتییانە واز دێنین:

١- (وێڵسن) سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە (١٩١٨/١/١٨)دا، داوای لە كۆنگرێس كرد، بڕیاری مافی چارەنووسی گەلان بدرێ، كە ئەوە هەنگاوێكی سەرەتایی بووە، لەوبوارەدا.

٢- لە ساڵی (١٩١٩)دا، لە پەیمانی (ڤێرسای)دا، كە لەنێوان كۆمەڵێك لە دەوڵەتی ڕۆژئاوایی بوو، مافی چارەنووسی گەلان جێگیر كرا، دوای ئەوەی كە پێشتر داوا كرابوو، لەو پەیمانەدا ئەوە چەسپێنرا.

٣-لە ساڵی (١٩٤١)دا، سەرۆك كۆماری ئەمریكا (ڕۆز فێلت) لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (وینستۆن چەرچل) پەیماننامەیەكی دوو قۆڵییان ئیمزا كرد و، ئەمەی تێدا هات: (مافی گشت گەلانە، جۆری ئەو حكوومەتە دیاریی بكەن كە بەدڵیانە).

٤- لە (١٩٦٠/١/١٤)دا، کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیاری ژمارە (١٥١٤)یان دەرکرد، کە: (بەخشینی سەربەخۆیی بە گەلانی ژێر دەست)ی تێدا چەسپاوە.

٥- لە (١٩٧٠/١٠/١٢)دا، بڕیاری (٢١٢٦) بۆ هەمان مەبەست، دووپاتی ئەوەی کردەوە، کە پێشتر چەسپابوو، ئەوە بەنسبەت گەلانەوە بەگشتی.

بە نسبەت گەلی کوردەوە:

٦- لە ساڵی (١٩٢٠)دا، پەیماننامەی (سیڤەر)، لە بەندەکانی: (٦٢و ٦٣و ٦٤)دا، کە وردەکاریی زۆریان هەیە، بۆیە نەمهێنان، بەڵێن بە کوردەکانی باکوورو ویلایەتی موسڵ درا، کە چارەنووسی خۆیان بەدەست خۆیان بێ، بەڵام بەداخەوە دوایی: لە ڕێککەوتنی (لۆزان) لە ساڵی (١٩٢٢)دا، ئەو بەڵێنە هەڵوەشێندرایەوە.

## بــــەرایی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشی شەشەمە لەم تەوەری پێنجەم و كۆتایی، تەرخانكراوە بۆ توێژینەوە لەبارەی ڕاوێژ (شوری) و دیموكڕاسییەوە، ئاشكراشە ڕاوێژ وشە و زاراوەیەكی ئیسلامییە و، دیموكڕاسییش وشە و زاراوەیەكی ڕۆژئاوایی یە.

ئەم بەشەش لەچوار باس پێكهاتوە، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**باسی یەكەم:** پێناسەی ((ڕاوێژ)) و ((دیموكڕاسیی)).

**باسی دووەم:** نێوەڕۆكی ڕاوێژ و دیموكڕاسیی لەمێژینەیە و، كاڵایەكی ڕۆژئاوایی نیە.

**باسی سێیەم:** خاڵەكانی پێكگەیشتن و، لەیەك جیابوونەوەی ڕاوێژ و دیموكڕاسیی.

**باسی چوارەم:** پوختەی ڕای بەندە لەبارەی ڕاوێژ و دیموكڕاسییەوە.

شایانی گوتنیشە كە ئەوەی لێرەدا لەبارەی ڕاوێژ و دیموكڕاسییەوە دەیخەینەڕوو، پوختە و شیلەی ئەوەیەكە لە كتێبی یازدەیەمی[1] مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله} و كتێبی دووەمی[2] مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا باسمان كردوە.

---

(١) بەناوونیشانی: (تطبيق المجتمع للشريعة) أو (معالم الدولة في الإسلام).

(٢) بەناوونیشانی: (بنەماكانی سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا).

باسی
یەکەم

## پێناسەی (ڕاوێـژ) و (دیموکڕاسیی)

### ١- ڕاوێـژ (شـوری):

وشەی (شوری) لەزمانی کوردییدا بە (ڕاوێژ) ماناکراوە، لەڕووی چەمك و واتا زمانییەکەیەوە، بەمجۆرە پێناسەکراوە: {شار العَسَل: آجتناها، وبابُهُ قطع واشتارَها أيضاً، والشَّوار بالفتح: مَتاعُ البيت والرَّحْل بالحاءِ، والشارة: اللِّباسُ والهيئة، والمِشوار بالكَسْر: المكان الذي تُعْرَضُ فيه الدواب للبيع، ويقال: إيّاك والخُطَبَ، فإنَّها مِشْوار كثير العِثارِ. والمَشْوَرَةُ: الشُّورى، وكذا المَشُورَة بِالضَّمِّ، تقولُ: شاوَرهُ في الأمر واستشارَهُ بمعنىً}[1].

واتە: دەگوترێ: (شار العَسَل) یانی: هەنگوینەکەی لە خەڵێف (سندووق) دەرهێنا، هەروەها (اجتناها)ش بەهەمان شێوە..

(شَوار)یش بەمانای کەل و پەلی ماڵوبارە (مِشْوار)یش ئەو شوێنەیە کە وڵاخی تێدا ڕادەنوێنرێ بۆ فرۆشتن. (بۆ وێنە: ئەسپ، مایین، حوشتر) هەر بۆیە گوتراوە: {إياكَ والخُطَبَ فإنها مشوارٌ كثير العِثار}، یەکێك ئامۆژگاریی

---

(١) مختار الصحاح للرازي، ص٣٥٠.

کەسێك دەکات دەڵێ: خۆت لە وتاران بپارێزە، چونکە مەیدانێکە ئینسان زۆر تێیدا ساتمە دەباو تووشی هەڵە دەبێ، وشەی (مَشْوَرَة) و (مَشُورَة)ش هەردووکیان: ڕاوێژکردن، هەروەها دەگوترێ:{شاوره في الأمر واستشاره}، هەر یەك مانایان هەیە: ڕاوێژی پێکرد لە کارەکەدا.

کەواتە: (شوری) یانی: وەك چۆن هەنگ هەنگوین لە شانەکان دا دادەنێ و، هەنگەوانەکەش دەچێ شانەکان دەردێنێ، ئەوانەش کە ڕاوێژ دەکەن بەوجۆرە ڕایەپەسەندو چاکەکان دەردێنن.

یان وەك چۆن هەنگ دەچێ شیلەی گوڵان دەمژێ و، کۆی دەکاتەوەو هەنگوین دروست دەکا، بابای ڕاوێژکاریش ئاوا بیروبۆچوونە پەسەندەکان کۆدەکاتەوە.

(مشورة)ش ئەوەیە کە خەڵکێك دادەنیشن پێکەوە پرس و ڕاوێژ دەکەن، بۆ ئەوەی بگەنە ئەو ڕایەی کە ڕاستترەو چاکترە، ئەوەیان تەبەننیی بکەن و هەڵیبژێرن.

## ٢- دیمـوکڕاسـیی:

وشەیەکی لاتینییە، بە مانای (حوکمی گەل) دێ، لە هەردووك وشەی (demos) و (kratos) پێکهاتوە، (demos) یانی: گەل، (kratos) یانی: حوکم.

١- (الموسوعة السياسية) دەڵێ: {الديموقراطية: الحكم الذي تكون فيه السلطة للشعب}[1]، واتە: دیموکڕاسیی بریتیە لەو حوکمەی کە دەستەڵات بە دەست گەلەوەیە.

٢- (فرانسیس فۆکۆیاما) دەڵێ: {دیموکڕاسیی سێ شتی پێویستن: یەك: دامەزراوەکان، دوو: سەروەریی یاسا، سێ: لێپرسینەوە}[2].

---

(١) ج٢ ص ٧٥١.

(٢) سیستمی سیاسیی و ئاژاوەی سیاسیی: ٢٠٠٥.

٣- (ئیریك فرۆم) دەڵێ: {بەپێی سیستمی دیموکڕاسیی، تێکڕای خەڵك و هاووڵاتییان لە بەرپرسیاریەتیی دروستکردنی بڕیاریی سیاسییدا، یەکسانن}[١].

٤- (کارل پۆپەر) دەڵێ: {دیموکڕاسیی سیستمێکە کە هاووڵاتییان تێیدا دەتوانن بەبێ خوێن ڕشتن کاربەدەستانی خۆیان بگۆڕن}[٢].

٥ـ منیش ئاوا دیموکڕاسیی پێناسە دەکەم: ئەو سیستمەیە کە خەڵك مافی هەبێ لە دانانی حوکمڕانان و، ڕەخنەلێ گرتنیان و، لابردنیاندا.




---

(١) سیکۆلاریزم و دیموکڕاسیی لە ئەزموونی کوردستان دا، چاپی ٢٠١٦/١.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، شایانی باسە: لەم سەرچاوەیەدا ورد ترو زیاتر پێناسەی دیموکراسیی مان کردوە.

باسی
دووەم

## نێوەڕۆکی ڕاوێژ و دیموکڕاسیی، شتێکی لەمێژینەیەو کاڵایەکی ڕۆژئاوایی نیە

وەك جارانی دیکەش باسمان کردوە[1] ئەوە هەڵەیەکە زۆر لە نووسەرەکان تێی کەوتوون، کە پێیان وایە: دیموکڕاسیی ئەو حوکمەیە کە کاتی خۆی لە یۆنان هەبووەو، دوایی لە ڕۆژئاوادا هەیەو، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ!! بەڵام لە ڕاستییدا وانیە، چونکە ئەوە کە بگەڕێیەوە بۆ ڕای خەڵك، بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، کە ئەوە ئامانجی دیموکڕاسییە، کە وڵات بەڕێوە بچێ بەپێی ڕای خەڵك و پرس بە خەڵك بکرێ و، ئیرادەیان هەبێ لە بەڕێوەبردنی وڵاتی خۆیاندا، بەڵێ ئائەوە، شتێکی زۆر لە مێژینەیە و، دەتوانین زۆر بەڵگان لەسەر ئەوە بهێنینەوە:

١- لە سووڕەتی (النمل) لە ئایەتی (٢٩) تاکو (٣٢)، تەماشا بکەن! شاژنی (سەبەء) کە هەندێك دەڵێن: ناوی (بەلقیس) یان (بەلقیسا) بووە، سولەیمان (علیه الصلاة والسلام) کە پێغەمبەری خوایەو پادشاشە، نامەیەکی بۆ دەنێرێ، ئەویش ڕاوێژ دەکا بە کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی، بۆچۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەودۆخەدا، باسەرنجی ئایەتەکان بدەین:

---

(١) سیکۆلاریزم و دیموکڕاسیی لە ئەزموونی کوردستان دا، چاپی ١/٢٠١٦.

﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ ﴾.

واتە: شاژن گوتی: ئەی پیاو ماقوولآن! (کەلەجێی پەرلەمانی ئێستا بوون) من نامەیەکی بەڕێزم بۆ هاتوە و، ئاوایە: ئەمە لە سولەیمانەوەیە: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، خۆتان لەبەرامبەر مندا بەبەرز مەگرن و، بەملکەچیی وەرن بۆ لام، شاژن گوتی: ئەی پیاو ماقوولآن! (ئەی مەجلیس) لەبارەی کاری خۆمەوە بۆچوونی خۆتانم پێ بڵێن، من هیچ بڕیارێك نادەم، تاکو ئێوە ئامادە نەبن و قسەی لێ نەکەن.

کەواتە: ئەو نێوەڕۆکە (کە بەئیرادە و پرس و ڕای خەڵك کاروبار بەڕێوە ببرێ) ئەوەتا لە قورئاندا باسکراوە و، خوای پەروەردگار مەدحی ئافرەتێك دەکات، چونکە ئەوباس و خواسە، خوا لە مەقامی مەدحدا دەیهێنێ و، دواییش ئەو ئافرەتە ئەو عەقڵەی دەیگەیەنێتە ئەوەی، سەردانی سولەیمان بکات و لە کۆتاییەکەیدا بڵێ:

﴿ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ النمل.

واتە: پەروەردگارم من ستەمم لەخۆم کردبوو -کە بێڕوابووم- ئێستاش لەگەڵ سولەیمان دا بۆپەروەردگاری جیهانییان ملکەچم.

کەواتە: لە مەقامی مەدحدا خوای پەروەرگار باسی دەکات، کە ئاوا ڕاوێژی کردوە بە دەوروبەری خۆی و خەڵك و قسە ڕۆیشتووانی گەلەکەی خۆی، کەواتە: ئەو نێوەڕۆکە کۆنەو، شتێکی لە مێژینەیە.

٢- (راول مانغلابوس) لە کتێبێکیدا بەناوی: (إرادة الشعوب)[1]، دەڵێ: دیموکراسیی بەر لە دەستەڵاتی ڕۆمانەکان، لە باکووری ئەورووپا حوکمی دەکرد، لە نەرویج و دانیمارك و ئایسلەندا.

---

(١) کە لە (قبرص) لەساڵی ١٩٩١ز دا چاپکراوە.

٣- هەروەها دەڵێ: لەنێو هیندییە سوورەکانی ئەمریکاشدا، دیموکراسیی وەك نێوەرۆك هەبووە و بە هەڵبژاردنی خەڵك، بەرپرسانی خۆیانیان داناوە، کەبە زمانی خۆیان، ئەو کەسەی کە هەڵیان بژاردوە (ساخیم)یان پێگوتوە[1].

٤- هەروەها دەڵێ: لە وڵاتی (میزۆپۆتامیا) (واتە: نێوان دوو ڕووبارەکانی: دیجلەو فورات) چوارهەزار و پێنج سەد (٤٥٠٠) ساڵ لەمەو پێش، ئەو سیستمە باو بووە، بەتایبەتی لە شاری (ئیبلا) کە دانیشتووانی سی هەزار (٣٠،٠٠٠) کەس بووە و، ئەو شارە دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) فەرمانبەری هەبووە، وڵاتەکەش بۆخۆی هەمووی دوو سەدو پەنجا هەزار (٢٥٠،٠٠٠) کەس بووە.

٥- هەروەها (ئیف شمیل) کە زانایەکی مێژووناسە، لە کتێبی: (السياسة في الشرق القديم)[2] و، ڕۆژهەڵاتناس و مێژوو نووس (ساموئیل نوح کریم) لە کتێبی: (تأريخ سومر)دا[3]، هەردووکیان دەڵێن: سێ هەزار (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایین و لەو ناوچانەدا (واتە: ناوچەی نێوان دوو ڕووبارەکە، میزۆپۆتامیا) کۆمەڵگایەکان دوو مەجلیس بەڕێوەیان بردوون، یەکەمیان: بۆ خەڵکی بەتەمەن، یەکێکیشیان: بۆ کەسانی جەنگاوەر، وەك چۆن ئێستا لە ئەمریکا: کۆنگرێس هەیەو، مەجلیسی پیران هەیە و، لە بەریتانیا کوڕی (لۆردات) هەیەو، پەرلەمانیشیان هەیە، ئاوا.

٦- هەروەها (مانگلابۆس) لەهەمان کتێبدا دەڵێ: لە (هیند)یش بەر لە شەش سەدە پێش زایین، دوازدە (١٢) کۆمار هەبوون، کە سەرۆکی یەکێك لەو کۆمارانە بابی (بووذا) بووە، (بووذا) ئەو فەیلەسووفەی کە هەندێك دەڵێن: پێغەمبەر بووە، هەر کام لەو سەرۆکانەش پێیان گوتراوە: (ڕاجا) و، بە هەڵبژاردن دانراون.

---

(١) ص١٣٣.

(٢) ص٤٢-٤٣.

(٣) ص ٦١.

٧- هەروەها لە شاری مەککەش پێش ئیسلام، هۆزی قورەیش (دار الندوة)یان هەبووە، وەك (إبن هشام) لە (السيرة النبوية)دا هێناویەتی[1]، کە (دار الندوة)ی ئەو کات، لە جێی پەرلەمان و ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئێستا بووە.

ئەمانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەصڵەن ئەو ڕایە ئەفسانەیە، کە دەڵێ: حوکمی خەڵك بەس لە یۆنان باو بووە! ڕۆژئاواییەکان یەك عادەتیان هەیە، پێیان خۆشە هەموو شتێك بەرنەوە بۆ لای خۆیان: مافی ئافرەت هەر لەوێ هەبووە، مافی مرۆڤ هەر لەوێ یە، دیموکڕاسیی و پرسکردن بە خەڵك و جەماوەر، ئەوە هەر دیارییەکی ڕۆژئاواییە! بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە هیچ ئەصڵ و ئەساسێکی نیە و، خوا کە عەقڵی دابەش کردوە، تەنیا بەشی خەڵکی ئەورووپای لێ نەداوە! هەموو عەقڵێکی سەلیم دەزانێ کە باشترە وڵات وا بەڕێوە ببردرێ: خەڵك پرسی پێ بکرێ و، ڕاوێژیان پێ بکرێ، وڵات ئاوا باشتر بەڕێوە دەچێ، خەڵکیش پرسی پێ بکرێ، وڵاتی خۆی خۆشتر دەوێ و، چاکتر دڵسۆزیی بۆ دەنوێنێ و بەتەنگیەوە دەبێ.



---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص ٢٤٩، دار ابن الهيثم، ط١/٢٠٠٦م.

باسی
سێیەم

## خاڵەکانی پێکگەیشتن و لەیەك جیابوونەوەی ڕاوێــژ و دیموکڕاسیی

ئایا لەکوێ ڕاوێژ لەگەڵ دیموکڕاسییدا پێك دەگاتەوە و، دیموکڕاسیی و ڕاوێژ، لە کوێ لێك جیا دەبنەوە؟! بە خولاصەیی و بە کورتیی: ئەگەر لەشەریعەتی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا، وردبینەوە، ئەم دە (١٠) بنەمایەمان دەکەونە بەرچاو، کە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییان لەسەر بەندە، وەك کتێبی دووەمی مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی}یم، بۆ توێژینەوەی ئەو دە (١٠) بنەمایە تەرخان کردوە:

١- سەروەریی باڵاو ڕەها هی خواو شەریعەتەکەیەتی.

٢- دەستەڵات هی خەڵکە.

٣- ملکەچیی هەموو لایەك بۆ دەستوورو یاسا.

٤- ڕاوێژ بنەمای هەموو کارەکانە.

٥- دادگەریی گشتگیر.

٦- یەکسانیی ڕەها.

٧- دابین کردنی ماف و ئازادییەکان بۆ هەموو تاکەکان.

٨- فەرمانبەریی لە سنووری پەسند (معروف)دا.

٩- چاودێریی کردنی کاربەدەستان و ڕاستکردنەوەو لێپرسینەوەیان.

١٠- پابەندیی هەموو لایەك بەڕەوشت و بەها بەرزەکانەوە، واتە: چ لەلایەن کۆمەڵگاو، چ لەلایەن بەرپرسانەوە.

ئنجا بە لەبەر چاو گرتنی ئەو دە (١٠) بنەمایەی کە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییان لەسەر بنیات دەنرێ، دەتوانین بەڕاشکاویی بڵێین: هەر چەندە هەندێك وردە جیاوازیی دیکەش هەن لەنێوان دیموکڕاسیی و شووڕادا، بۆ وێنە:

١- جیاوازیی لەنێوان ژینگەی ڕاوێژو دیموکڕاسییدا: ڕاوێژ لە ژینگەیەکی ئیسلامییدا بووە و، وەك بەهایەکی بەرز، کاری پێکراوە، بەڵام دیموکڕاسیی لە ژینگەیەکی دیکەدا بووە، لە وڵاتانی ڕۆژئاوا دا زیاتر، -لەم دوادواییەدا-.

٢- گشتگیریی ڕاوێژ، کە گشتگیرە و بواری سیاسیی، بواری کۆمەڵایەتیی، بواری فیکریی، هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام دیموکڕاسیی تایبەتە بەبواری حوکمڕانییەوە.

٣- لە ڕاوێژدا هەبوونی هەوێنی مەعنەویی و ڕەوشت و ئاکار هەیە، واتە: لەبواری حوکمڕانیی دا: ڕەوشت و ئاکار و لایەنی مەعنەویی و ڕووحیی و ئیمانیی، دەبێتە هەوێن، بەڵام لە دیموکڕاسییدا ئەوە بوونی نیە[1].

بەڵام جیاوازیی بنەڕەتیی لە نێوان ڕاوێژو دیموکڕاسییدا، ئەوەیە: کە لە دیموکڕاسییدا هیچ پەرژینێك نیە ویستی خەڵك، لە شوێنکەوتنی ئارەزوو (إتباع الهوى)و لادان بپارێزێ، بەڵام لە ڕاوێژدا، شەریعەت ئەو سنوورەیە کە پەرژین (سیاج)ێکە بە دەوری ئیرادەو ویستی خەڵکەوە، چ لەبواری یاسادانان، چ لەبواری جێبەجێ کردن، چ لە بواری دادوەریی دا، شەریعەت ئەو پەرژینەیە،

---

(١) بڕوانە: مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) کتێبی دووەم: ١٣٣-١٤٠.

کە ئەو دامەزراوانە و، ویستی مرۆڤەکان دەپارێزێ لە لادان، چونکە: شەریعەت لەبواری حەڵاڵ و حەرامە بنەڕەتییەکاندا، نوختەی خستۆتە سەر پیت بۆ وێنە: ڕیبا حەرامە، زینا حەرامە، زوڵم حەرامە، ئیدی بڕیویەتەوە و هەزار پەرلەمان کۆبێتەوە و دابنیشێ و مشت و مڕ بکەن، ئەگەر خۆیان بە مسوڵمان بزانن، ناتوانن قسە بکەن لەوبارەوەو ئەو گوناهانە، ڕەوا بکەن، هەروەها بۆ نموونە: ئیمان، نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، پەیوەندیی خزمایەتی (صلة الرحم)، ڕەوشتی بەرز، ئەوانە هەموویان فەرزن، بە پێچەوانەشەوە: کوفر، نیفاق، شیرك، قەتڵ، زینا، ڕێگریی، خراپەکاریی، زوڵم، ڕەوشت نزمیی، ئەوانە هەموویان قەدەغەن و، هیچکەس بۆی نیە دەستکارییان بکات.

ئنجا کاتێك ئینسان قەدری ئەو شتانە دەزانێ، دیارییکردنی ئەو حەڵاڵ و حەرامانە، کە تەماشای ژیانی ڕۆژئاواییەکان بکات، تەماشایان بکەن! بە چی گەیشتوون!! شتی وا دەکەن بەکەڵکی مەجلیسێ نایەت باسی بکەی! بەتایبەت لەبواری کۆمەڵایەتیی و خێزانیی و ڕەوشت دا! کە هەمووشی لە پەرلەمانەکانی خۆیان دا بڕیاری لەسەر دەدرێ، بۆ وێنە: خێزانی یەك ڕەگەزیی: دوو پیاو، دوو ئافرەت، ئنجا منداڵ کردن بەهی خۆ و شتی دیکەی سەیر سەیر و لادانێکی زۆر عەجیب لە فیترەت و سروشت! لەبەر ئەوەی: دیموکراسییەکەیان پەرژینی نیە و، وەك ئاژەڵی بەڵەسە بوو، هیچ شتێك نیە بیگرێتەوە!

بەڵام هەرگیز لەوڵاتی مسوڵماناندا کە خۆیان بە مسوڵمان بزانن، شتی وا ڕوو نادا، چونکە ڕاوێژ (شُوری) کەلە ئەسڵ دا ئیجتیهادو، تێفکرین و، ورد بوونەوەیە لە دەقەکانی شەریعەت، بۆ هەڵهێنجانی حوکمەکان، هەرگیز ڕێگا نادات لەحاڵێك دا حوکمێکی شەرعیی هەیە، لە بەرامبەریدا ئیجتیهاد بکرێ: (لا اجتهاد في معرض النص)، هەروەها ئەو شتانەی شەریعەت بڕاندوونیەوە، ڕاوێژیان تێدا ناکرێ، ئنجا ئەو شتانەش کە شەریعەت بڕاندوونیەوە: پەرژین و چوارچێوەیەك دادەنێن، کە دەستەڵات و کۆمەڵگا لە خلیسکان و لادان، دەپارێزێ.

## باسی چوارەم

## پوختەی ڕای بەندە لەبارەی ڕاوێژ و دیموکڕاسییەوە

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان: دیموکڕاسیی وەك هەر بیرۆکەیەکی زادەی بیرو هۆشی مرۆڤ، بێ کەموکوڕیی نیە، بەڵام باشترین شێوازە کە تاکو ئێستا مرۆڤ بەرهەمی هێناوە بۆ حوکمڕانیی و، دیموکڕاسیی (چاکی نێو خراپانە) و (لەچاو شلان پەیتە)[1] ئەوانەش کە بە ئینصافن لە ڕۆژئاواییەکان دەڵێن: دیموکڕاسیی باش نیە، بەڵام خراپەی لە هەموو سیستمەکانی دیکە کەمترە.

چونکە خۆیان دەبینن دیموکڕاسیی چی لێ هاتوە! کە لێرە بوارنیە باسی بکەم، بەڵام لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا بە تەفصیلْ باسم کردوە[2]، دیموکڕاسی چی لێهاتوە؟ دیموکڕاسیی ئێستا وای لێهاتوە، لە تێکڕای وڵاتانی دنیادا بەڕۆژئاواشەوە: کێ پارەی زیاتر بێ، ڕاگەیاندنی زیاتر بە دەستەوە بێ، زیاتر بتوانێ خەڵك چەواشە بکا، زیاتر بتوانێ کاریگەریی

---

(١) شتی (شل) ئەوە دیارە و (پەیت)یش یانی توند، وەك دەگوترێ: شۆربایەکە پەیتە، تۆزێك ئاوی تێبکە، با شل بێتەوە!

(٢) بڕوانە: چاپی شەشەمی ٢٠١٧ز، کەسەد (١٠٠) لاپەڕە زیاترمان بۆ تەرخانکردوە.

بۆ سەر خەڵك هەبێ، ئەوە زیاتر دەیباتەوە! هەروەها کێ زیاتر بە دوای هەواو ئارەزووی خەڵك بکەوێ، ئەوە دەنگی زیاتر دێنێ! کاتی خۆی (کلینتۆن) یەکێ لە بانگەشەکانی ئەوە بوو کە لە سوپاشدا ڕێگا بدرێ، کردەوەی بێناموسیی (نێربازیی ) بکرێ، کەتاکو ئەوکاتە قەدەغەبوو.

بەڵێ: دیموکڕاسیی لە چاو سیستمەکانی دیکەی حوکمڕانیی، لەهەموویان خراپەی کەمترە و، بە حەقیقەت دەتوانین بڵێین: لەنێو سیستمە بەشەرییەکان دا، باشترین شێوازە بۆ حوکمڕانیی، بەڵام بەمەرجێ لەگەڵ ئیسلامدا بەراورد نەکرێ.

ئنجا ئەم بنەمایانە:

١- خەڵك سەرچاوەی دەستەڵات بوون.

٢- هەڵبژاردن.

٣- جیایی سێ دەسەڵاتەکان( فصل السلطات الثلاث).

٤- سەروەریی یاسا.

٥- دابینکردنی ماف و ئازادییەکان بۆ هەموو لایەك بەبێ جیاوازیی.

٦- دەستاو دەست پێ کردنی ئاشتییانەی دەسەڵات.

٧- حوکم کردنی زۆرینەو پاراستنی مافی کەمینە.

ئەمانە کە بنەمایەکانی دیموکڕاسیین، هیچیان ناکۆك و دژ نین لەگەڵ شەریعەتدا، بەڵکو شەریعەت ئەوانە بە پێویستیش دەزانێ، چ بە دەقەکان، چ بە بنچینەکانی شەریعەت.

تەنیا گرفت و ئیشکالی بنەڕەتیی کە لە دیموکڕاسییدا هەیە، بە نسبەت ئەهلی ئیسلامەوە، ئەوەیە کە: مافی یاسادانان بە ڕەهایی دەداتە دەست خەڵك، لەحاڵێکدا کە یاسادانانی ڕەها، تەنیا هی خوایە:

﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ (یوسف: ٤٠).

بەڵام دیموکڕاسیی دەیداتە دەست خەڵك، ئنجا هەندێك لە زانایانی هاوچەرخ.

- بۆ نموونە: (د.یوسف القرضاوي) کە لە کتێبەکەی خۆم: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا، ڕەخنەم لێ گرتوە، هەرچەندە زانایەکی گەورەیە، بەڵام مانای وانیە کە لەهەموو شتێکدا دەپێکێ- بەڵێ هەندێك لەزانایان تاکو تۆمەتبار نەکرێن بەوەی دژی دیموکڕاسیین، چونکە دیموکڕاسیی هەیمەنەیەکی زۆری هەیە بەسەر هەستی خەڵکدا، دێنن هەندێك تەئویل و پینەو پەڕۆ دەکەن بۆ دیموکڕاسیی، بۆ وێنە:

١- دەڵێن: جەوهەری دیموکڕاسیی، بریتیە لەوەی خەڵك ئازاد بێ لە دانانی حوکمڕانانی خۆیاندا، بەڵام لەو کتێبەم دا کە ئاماژەم پێدا، باسم کردوە، کەئەوە جەوهەری دیموکڕاسیی نیە و، تەنیا میکانیزم (آلیة)ە، بەڵام جەوهەری دیموکڕاسیی ئەوەیە کە حەڵاڵ و حەڕام و، ئەمرو نەهی و، یاسادانان، دەداتە دەست خەڵك و، دەستیان کراوەیەو ئاوەڵایە، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی داخۆ حەڵاڵ چییە، حەڕام چییە! خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چییان فەرمووە؟!

٢- هەندێ لە زانایانی مسوڵمان دێنن ئەوەش بەبارێکی دیکەدا تەئویل دەکەن و دەڵێن: دیموکڕاسیی حوکمی گەلە و، گەلێکی مسوڵمانیش، هەرگیز ڕازی نابێ: حەڵاڵ حەڕام بکات و، حەڕام حەڵاڵ بکات، کەواتە: دیموکڕاسییش هەر لەگەڵ شووڕای ئیسلام تێك دەکاتەوە!

بەڵام وەك لە کتێبەکانی خۆمدا گوتوومە: ئەوکاتە دیموکڕاسیی پێی ناگوترێ: دیموکڕاسیی، چونکە ئەوە حوکمی گەل نیە، ئەوە حوکمی خوایە، چونکە خوا دەفەرموێ: ئەوە حەڵاڵەو، ئەوە حەڕامە، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ﴾ (النحل:١١٦).

واتە: هەر بەقسەی سەرزارەکییتان و بەزمانی بەدرۆتان مەڵێن: ئەوە حەڵاڵە و ئەمە حەڕامە.

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ (الشورى:٢١).

واتە: یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن، کە شتێکیان لەئایین بۆداناون، خوا مۆڵەتی نەداوە؟!

بۆیە پێم وایە دەبێ: هێڵێکی نێوەڕاست بگیرێ: دیموکراسیی وەك میکانیزمیی حوکمڕانیی، هەرچەندە کۆمەڵێك کەموکوڕیی هەن، بەڵام باشترین شتێکە کە تاکو ئێستا بەشەر بەرهەمی هێنا بێ، ئنجا کاتێك دیموکڕاسیی وای لێ دەکرێ: سەرپێچیی شەرع نەکات، پێی ناگوترێ: دیموکڕاسیی، یانی: ئەگەر پابەندت کرد بە چوارچێوەی شەریعەتەوە، ئەو کاتە پێی ناگوترێ: دیموکڕاسیی و، ڕۆژئاواییەکانیش ئەوە بە دیموکڕاسیی دانانێن و دەڵێن: تۆ دیموکڕاسییت لە جەوهەرەکەی خۆی خاڵیی کردۆتەوە و، ناهێڵی ناشەرعییەك بکا، ڕێی نادەی لەقسەی خوا عزوجل دەربچێ! ئەوە چ دیموکڕاسییەکە!! لەحەقیقەتدا ئەو کاتە دیموکڕاسیی پێ ناگوترێ، ئەگەرنا ئەگەر پێی بگوترێ: دیموکڕاسیی و سەرپێچیی شەرعیش نەکات، زۆر چاکە، بەڵام ئەوکاتە ڕۆژئاواییەکان دەڵێن: ئەوە دیموکڕاسیی نیە، دیموکڕاسیی ئەوەیە ئیرادەی خەڵك هیچ کۆت و بەندێکی لەسەر نەبێ، نابێ بڵێی: قورئان وای فەرمووە، سوننەت وای فەرمووە، قیامەت وایەو، ئەخلاق وایە! شتی وانیە، بەڵکو خەڵك چۆنی پێ خۆشە، بڕیار دەدات، ئائەوە دیموکڕاسییە، ئنجا کە ئەوەش دیموکڕاسیی بێ، عەیبەکەی ئەوەیە، کەئەوە:حەڵاڵ و حەڕام و، یاسا دانان، بەڕەهایی دانە دەست خەڵکە و، ئەوەش لەگەڵ ئیمان و عەقیدە و خوا بەیەکگرتن(توحید)دا تێك دەگیرێ، کەدەڵێن: دەبێ بەس خوا بپەرسترێ و، بەڕەهایی ملی بۆکەچ بکرێ، لەهەردووك بواری سەرەکیی دروشمەکان (شعائر) و یاسایەکان (شرائع)دا.

بەڵام کاتێك باسی ئەوە دەکەین: سەروەریی باڵاو ڕەهای یاسا دانان (السيادة العليا والمطلقة للتشريع) تەنیا هی خوایە، دەبێ لە دوو شتان بێ ئاگا نەبین:

**یەك:** سەروەریی باڵای سیاسیی (السيادة السياسية العُلْيا) (واتە: دەستەڵات) هی خەڵکە، لێتان تێك نەچێ! سەروەریی باڵای یاسادانان هی خوایە، بەڵام سەروەریی سیاسیی، کە خەڵك، بەرپرسەکانی خۆیان دابنێن، بێگومان خوای پەروەردگار مەلائیکەتان نانێرێ، بڵێن: برۆن فلان کەس بکەنە بەرپرس! ئەو دەستەڵاتە هی خەڵکە، بەڵام دانانی حەڵاڵ و حەرام، ئەوە تەنیا هی خوای پەروەردگار و کارزانە.

**دوو:** خەڵك و کۆمەڵگاش سەروەریی بەشیی یاسادانان (السيادة الجزئية للتشريع)یان هەیە، چونکە هەموو زانایان وشەی یاسادانان(التشريع) بەکاردێنن، بۆ وێنە: (خضري بگ)ی میسریی کە یەکێکە لە زانایان، کتێبێکی هەیە بەناوی: (تأريخ التشريع الإسلامي)، (التشريع) واتە: یاسا دانان، بەڵام یاسادانانێك کە لەئیسلامدا هەیە، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دایە، بۆیەش بە یاسادانانی ڕەها(مطلق) داناندرێ، تاکو لەگەڵ ئەو ئایەتەدا تێکبگیرێ کە دەفەرموێ:

﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ (شوری:٢١).

پوختەی قسان ئەوەیە کە جیاوازیی سەرەکیی نێوان (ڕاوێژو دیموکڕاسیی) ئەوەیە، کە دیموکڕاسیی پەرژینی نیە، لە لادان بیپارێزێ، بەڵام ڕاوێژ (شورى) بە شەریعەت پەرژین کراوە و پارێزراوە.

خواش عزو جل دەفەرموێ: ﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾ (المؤمنين:٧١).

واتە: ئەگەر حەق بەدوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەوێ، ئاسمانەکان و زەوی تێك دەچن و هەرچی تێیاندایە تێك دەچێ.

لەکۆتایی ئەم بەشەش دا دەڵێم:

براو خوشکانی بەڕێز!

ئێمە دەبێ ئەهلی ئینصاف بین، چونکە: (الإنصاف خير الأوصاف)، دیموکڕاسیی زۆر گەشەی کردوە و زەمینەیەکی بۆ ڕەخساوە، باش گەشە بکا، بەڵام شووڕای ئیسلام، ڕێگای پێ نەدراوە گەشە بکا، بەڵێ هەردووکیان میکانیزمی حوکمڕانیین، خوا فەرموویەتی: [وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ] (أمر) یانی: کاروباری سیاسیی، هەروەها فەرموویەتی: [وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ] (آل عمران: ١٥٩)، کەواتە: هەم کۆمەڵگا دەبێ کاری خۆی بە ڕاوێژ بەڕێوە بەرێ و، هەم دەبێ حوکمڕانانیش ڕاوێژ بە خەڵك بکەن، خوا بڕیویەتەوە، چونکە وشەی (أمر) یانی: کاروباری سیاسیی، بەپلەی یەکەم[1].

بەڵام بەداخەوە ڕێ نەدراوە شووڕای ئیسلام گەشە بکا، بۆیە تەنیا وەك بەهایەکی ڕووحیی و ئەخلاقیی مایەوە، بەڵام دیموکڕاسیی ڕۆژئاوا زۆر گەشەی کرد، کەپێشێ ئاوا نەبوو، بەڵام گەشەی کردو فراوان بوو، بێگومان کەم و کورێشیی زۆرن، بەڵێ بەداخەوە شوورا ڕێگای نەدراوە، کە وەك میکانیزمێکی حوکمڕانیی کە شەریعەت دایناوە، گەشە بکات و بەرەو پێشەوە بچێ، هەر لەو کاتەوە کە دانانی بەرپرسان لە ئیسلامدا لە ڕاوێژەوە بوو بە میراتیی (وراثي) و بنەماڵەیی (عائلي) لەسەردەمی (معاوية)وە، لەوکاتەوە شوورا پەکخرا، ئەمە حەقیقەتێکە دەبێ بیسەلمێنین، بەڵام کە شووڕاش پەکخرا، مانای وا نیە: حوکم بە شەریعەت، پەکخرا، ئەوەش ئینصافە و دەبێ بیڵێین، لەدەوڵەتی ئیسلامیی دا، چ لەسەردەمیی ئومەوییەکان و، چ عەبباسییەکان و، چ عوسمانییەکانیش دا، هەر حوکم بە شەریعەت کراوە، بەڵام حوکمڕانەکان، لادان و غەڵەت و پەڵەتیان هەبوو، بەتایبەتی لە دەستکاریی کردنی خەزێنەی دەوڵەت (بيت المال)و، لە خودی خۆیاندا، شوێنکەوتنی ئارەزوو و غەڵەت و پەڵەتیان هەبووە، بەڵام حوکم هەر بە شەریعەت دەکرا و، دادوەریی لە نێوان خەڵکدا، هەر بە شەریعەت دەکراو،

---

(١) المعجم الوسيط، ص ٢٦.

هیچ کەسیش نەبوو کە بتوانێ تەحەدداى شەریعەت بکا، بۆوێنە: خەلیفەو حوکمڕان، دادوەر (قاضي) لەگەڵ هەژارێك دا دەیهێنانە بەردەمی خۆی و، جاری وابووە حوکمیشی بەسەر حوکمڕان دا داوە و، حوکمڕانیش ملی داوە.

بەڵام بە تەئکید نەهێڵدرا شووڕا گەشە بکاو بەرەو پێشەوە بچێ و، ئێستا بە کەڵکی ئەوە بێ کە ڕوون و دیار بێ و، یەکسەر دەوڵەتی لەسەر دابنرێ، بۆیە ئێستا ناچارین سوود لە میکانیزمەکانی دیموکڕاسیی ببینین، کە وەك گوتمان: لەگەڵ شووڕای ئیسلامدا، تێك ناگیرێن، تەنیا ئەو جەوهەرو نێوەڕۆکەی نەبێ، کە یاسادانان بە ڕەهایی دەداتە دەست خەڵك و، هەندێ وردە شتی دیکە کە ئاماژەمان پێکردن.

## بــــەرایی

خوێنەری خۆشەویست!

ئەم بەشی حەوتەمەی ئەم تەوەری پێنجەم و کۆتاییەی بابەتی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع)دا، تەرخانکراوە بۆ قسەکردن لەبارەی (ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا)وە، خوا پشتیوان بێ لەژێر (١٠) ناوونیشان دا دەیخەینەڕوو، کە هەرکامیان هی باسێکی سەربەخۆیە، بەمجۆرەی خوارێ:

**باسی یەکەم:** جووتیەتیی (زوجیة) بنچینەی گشتیی دروستکراوەکانە.

**باسی دووەم:** پەیوەندیی ژن و مێرد لەئیسلام دا، بناغەکەی: ئۆخژن و خۆشەویستیی و بەزەیی یە.

**باسی سێیەم:** ماف و ئەرك لەنێوان ژن و مێرددا، بەرانبەر و دووسەرەن.

**باسی چوارەم:** ئەرك و مافە تایبەتییەکانی ژن و مێرد، بەپێی داخوازیی سروشتیان دانراون.

**باسی پێنجەم:** پیاوان و ئافرەتان لە ئەرك و مافە گشتییەکان دا، یەکسانن.

**باسی شەشەم:** نکوولّیی لە دواکەوتوویی مسوڵمانان ناکرێ، لەبواری مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەت دا.

**باسی حەوتەم:** بوونناسیی ڕۆژئاوایی، هەڵوێستی پێکەوە دژ و ناکۆك بوونی ژن و پیاوی، بەرهەم هێناوە.

**باسی هەشتەم:** بیرۆکەی: لەدرەختە قەدەغەکە خواردنی حەووا و دەرخوارددانی ئادەم: قسەی تەوراتی گۆڕراوە، نەك قورئان و ئیسلام.

**باسی نۆیەم:** لەپەراسووی چەپی ئادەم درووستبوونی حەوواش، قسەی تەوراتی گۆڕراوە، نەك قورئان و ئیسلام.

**باسی دەیەم:** مێینە بوونی ئافرەت، نوقصانیی نیە، تاکو بەلاساییکردنەوەی پیاو، یان دژایەتییکردنی، قەرەبووی بکاتەوە.

شایانی گوترانیشە کە هەرچی لێرەدا هاتوە، پوختە و گوشراویی بەشێك لەو توێژینەوانەیە کە لەکتێبی یازدەیەمی مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله}[1] و، مەوسووعەی: (ئافرەت و خێزان لەسایەی شەرعەت)دا، خستوومنە ڕوو.

دیارە بەدرێژایی مێژووش لەبواری پەیوەندیی نێوان ئافرەت و پیاو و، چۆنیەتی مامەڵە پێوەکردنیان دا، بەشەر گرفتاری تێپەڕاندن و بەزایەدان (إفراط و تفريط) بووە، مەگەر وەحیی بێ هەڵە و پەڵەی خوا دەستی گرتبێ و دەربازی کردبێ.

هیواداریشم ئەم برە توێژینەوەیە، وێنەیەك بێ، لەوحاڵەتی میانجێتیی (وسطية) و هاوسەنگیی (إتّزان)ەی، ئیسلامی بەرجەستە لەقورئان و سوننەت دا، بۆ مرۆڤی ویستوە.

---

(١) بەناوونیشانی: (تطبيق المجتمع للشريعة، أو معالم الدولة في الإسلام).

باسی
یەکەم

## جووتییەتیی (زوجية)
## بنچینەی گشتیی دروستکراوەکانە

ئەگەر تەماشای دروستکراوەکانی خوا بکەین، دەبینین هەموویان جووتن و یەك دروستکراویش نیە (تاکو ئێستا هیچم پێ شك نایەت) خوا، یەك مەخلووقیشی نیە، کە هاوتای نەبێت، هەمووی جووتە: ئاسمان و زەویی، زستان و هاوین، دنیاو دوارِۆژ، بەهەشت و دۆزەخ، نێرو مێ، رِەش و سپیی، تاریك و رِووناك، هەمووی جووتە.

١- خوا دەفەرمویٔ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: لە هەموو شتێك جووتێکمان دروست کردوە، بۆ ئەوەی کە بیر بکەنەوە، واتە: بیربکەنەوە کە ئەوکەسەی ئەو هەموو جووتانەی هێناونە دی، بۆخۆی جووت نیە و، تاکە، کە خوایە:

﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ الإخلاص. واتە: بلّێ خوا تاکە.

٢- هەروەهاخوا فەرمووەتی: ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ يس.

واتە: پاکیی بۆ ئەو (خوای)ەی کە هەموو جووتەکانی هێناونە دی، لەوەی کە زەوی سەوزی دەکات و، لەخۆیان و، لەوەش کە نایزانن.

ئەوەی کە نایزانن چییە؟ یەکیان ماددەی بێ ژیانە، ئێستا دەرکەوتوە، کە ئەویش بارگەی سارد: (ئەلیکترۆن) و گەرم (پرۆتۆن)ە، (نایترۆن)یش بێ بارگەیە.

٣- دیسان خوا فەرموویەتی: ﴿وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ۝٣﴾ الفجر، واتە: سوێند بەجووت و بەتاك.

٤- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ۝٢ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ۝٣ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ۝٤﴾ الليل.

واتە: سوێند بەشەوگار کە دادە پۆشێ و، سوێند بە ڕۆژگار کە ڕۆشن دەبێتەوە و، سوێند بەو کەسەی کە نێرو مێی دروستکردوون، هەوڵی ئێوە جۆراو جۆرە.

بەڕێزان! ئەوە بزانن کە پەیوەندیی نێوان ئەو جووتانە هەموویان، پەیوەندییەکی تەواوکاریی (تکاملي)یە، نەك ناکۆکیی و دوژمنکاریی، چ لە عالەمی بەشەردا: پیاوو ئافرەت، چ لە عالەمی ژیانداران دا، وەك دەبینن: ئاژەڵ، پەڕەور، دڕندە، هەموویان پێکەوە هاوکارن، ئایا بینیوتانە نێرو مێی هیچ ژیاندارێك، هەتا دڕندەکانیش، پێکەوە بەشەڕ بێن؟! شێر لە دارستاندا، عایدی پارێزگاریی لێ کردنی دارستان و دەرکردنی دوژمنانە و، (مێ)یەی شێر، عایدی ڕاووشکارە، هەروەها جووتەکان هەموویان پێکەوە هاوکارن.

سبحان الله! ئەو ئەوڕووپا و ڕۆژئاوایە چونکە بناغەی لەسەر ناکۆکیی دانراوە: بەشەڕ هاتن لەگەڵ خوادا، بەشەڕ هاتن لەگەڵ سروشت دا! بۆیە نێرو مێش دەبێ بەگژ یەکدا بکەن! ئنجا هەندێ لە کۆلکە ڕۆشنبیرەکانی ئێمەش: بانگەشە بۆ ژن سالاریی و، پیاو سالاریی دەکەن و، ژن و پیاو بەگژیەکدا دەکەن، داخۆ کامەیان ئازاترە؟!

باسی
دووەم

## پەیوەندیی ژن و مێرد لە ئیسلامدا، بناغەکەی ئۆخژن و خۆشەویستیی و بەزەییە

خوا تبارك و تعالی فەرموویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم.

واتە: لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە: کە لەخۆتان هاوسەری بۆ هێناونە دی [ئنجا ئەگەر دوێندراو(مخاطب)ەکان پیاوان بن، یانی: ئافرەتانی بۆ هێناونە دی و، ئەگەر دوێندراوەکان ئافرەت بن، یانی: پیاوانی بۆ هێناونە دی، چونکە ئەم ئایەتە مەفهوومەکەی دوو سەرەیە، یانی: هەم ژن بۆ پیاو دروستکراوە و، هەم پیاویش بۆ ژن دروستکراوە] بۆ ئەوەی کە بە هۆیەوە، ئۆخژن و ئارامییتان بۆ بێ و، لە نێوانتاندا خۆشەویستیی و بەزەیی داناوە.

هەروەها خواعزوجل فەرموویەتی: ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة.

واتە: (ئەی مێردینە!) ژنەکان بۆئێوە پۆشاکن و، ئێوەش پۆشاکی ئەوانن...

ئاشکراشە هیچ شتێك لەبەرگ و پۆشاك، لە مرۆڤ نیزیکتر نیە و، بۆیشی پێویستتر نیە، کەهەم عەیب و عار و عەورەتی و جەستەی دادەپۆشێ و، هەم لەسەرما و گەرم و زیان و ئازار دەیپارێزێ.

ئەمەش چاکترین وێناکردن (تصویر)ە، بۆڕۆڵ و کاریگەریی: هەرکام لەژن و مێرد، لەژیان و گوزەرانی یەکدیدا.

# باسی سێیەم

## ماف و ئەرك لە نێوان ژن و مێرددا، بەرامبەرو دووسەرەن

یانی: ماف و ئەرکەکان، هەم پێکەوە بەرامبەر(متقابل)ن، هەم دووسەرە(متبادل)ن، یانی: هەر مافێك بۆ پیاوە، مافێکیشە بۆ ئافرەت و، هەر ئەرکێك لەسەر پیاوە، ئەرکێکیشە لەسەر ئافرەت، بەڵام هەر کامیان بەپێی سروشتی خۆی، تەماشا بکەن:

١- خوا لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٨٧)دا دەفەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾.

واتە: ژنەکانتان پۆشاکن بۆ ئێوە و، ئێوەش (ئەی مێردەکان) پۆشاکن بۆ ژنەکان.

وەك یەك و بەیەکسانیی، بۆیەکدی ئاتاجن و پێویستییتان بەیەکدی هەیە.

٢- هەروەها خوا عزوجل فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ (البقرة:٢٢٨).

واتە: بۆ ئافرەتان ماف هەیە (لەسەرمێردیان) بەئەندازەی ئەوە کە ئەرکیان لەسەر شانە، بە شێوەیەکی بەپەسند زانراو، بەڵام پیاوان پلەیەکیان بەسەریانەوە هەیە.

کەپلەی سەرپەرشتییکردن و بڕیار بەدەست بوونە لە ماڵدا و، بێگومان هیچ دامەزراوەیەکیش بەبێ سەرپەرشتیار و بەڕێوەبەر، بەڕێوەناچێ، ئنجا شەریعەتی خوای کاربەجێ، پیاوی بەشایستەتر زانیوە بۆ بەڕێوەبردنی دامەزراوەی خێزان (مؤسسة الأسرة)، وك خوای کارزان فەرموویەتی:

﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴿٣٤﴾﴾ النساء.

واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە...

باسی
چوارەم

## ئەرك و مافە تایبەتییەکانی ژن و مێردان، بەپێی داخوازیی سروشتیان داندراون

بەڵێ ئەرك و مافە تایبەتییەکانی ژنان و پیاوان، بەپێی داخوازیی سروشتیان داندراون، با سەرنجی چەند شتێك بدەین:

١- خوا لە باسی بژیوی ژن و منداڵ دا، ئایا لەسەر کێیە؟ فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة: ٢٣٣).

واتە: ئەوەی کە منداڵەکە هی ئەوە، بژیوو پۆشاکی ژن و منداڵانی لەسەرە.

ئنجا هەرچەندە منداڵەکە هی هەردووکیانە، بەڵام نەسەب و ڕچەڵەك زیاتر بەباب دەچەسپێ و ئاسانتر دەزانرێ، چونکە ئەگەر پیاوێك دوو سێ هاوسەری هەبن، ئەگەر منداڵەکان پاڵبدرێنە لای بابیان، ڕەچەڵەکیان بەئاسانیی دەزانرێ و دەردەکەوێ، بەڵام ئەگەر پاڵبدرێنە لای دایکەکانیان، بڵاودەبن و دەپرژێن! خواش دەفەرموێ: ئەوەی کە منداڵەکە بەناوی ئەوەوەیە، بژێوو پۆشاکی ئافرەت و منداڵەکان لەسەر ئەوە، بەشێوەیەکی بەپەسەند زانراو.

٢- هەروەها خواعزوجل لەبارەی بەڕێوەبردنی خێزان (أسرة)ەوە، فەرموویەتی: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴾ (النساء:٣٤).

واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن، مشور خۆرن، بەسەر ئافرەتانەوە.

٣-هەروەها خوای کاربەجێ لەبارەی ئەرکی پەیداکردنی جێگاو ڕێگای تێدانیشتەجێ بوونی ژن و منداڵ و خێزانەوە، پیاوان(مێردەکان) دەدوێنێ و دەفەرموێ: ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ﴾ الطلاق.

واتە: خێزانەکانتان نیشتەجێ بکەن، بەپێی توانای خۆتان، لەو شوێنەدا کە خۆتان تێیدا نیشتەجێن.

کەواتە: ئەم سێ شتە:

**یەك:** سەرپەرشتیی کردنی ماڵ و خێزان.

**دوو:** نان و نەفەقەو بژیو پەیداکردن.

**سێ:** نیشتەجێ کردن.

ئەمانە هەموویان ئەرکن لە ئەستۆی پیاودا و، سروشتی پیاو و پێکهاتەی پیاو، لەڕووی جەستەیی و دەروونیی و عەقڵییەوە، شایستەیی ئەوەی هەیە کە ئەو ئەرکانەی بخرێنە ئەستۆ.

**ئەدی ئافرەت چ ئەرکێکی لەسەر شانە؟**

١- خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ (البقرة:٢٣٣).

واتە دایکان شیر دەدەن بە منداڵەکانیان، دوو ساڵی تەواو، بۆ هەر کەسێ ویستی ماوەی شیر پێدانەکەی تەواو بکا.

ئنجا ئایا تەنیا دایك ناتوانێ شیر بدات بە منداڵ؟! پیاو مەگەر شیری بۆ بگرێتەوە! ئەگەرنا چۆنی شیر بداتێ!

**٢و٣**- هەروەها خوا لەبارەی ئەرکەکانی ژنەوە، بەرامبەر بەماڵ و مێردی، فەرموویەتی:

﴿ فَٱلصَّـٰلِحَـٰتُ قَـٰنِتَـٰتٌ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴿٣٤﴾ ﴾ النساء.

واتە: ژنانی باش ئەوانەن کە: بەقسەی مێردی خۆیان بکەن و، ئەوانە کە پارێزەرن بۆ ماڵی مێردیان و، بۆسومعەی خۆشیان و مێردیشیان، بەپەنامەکیی، وەك چۆن خوا مافی ئەوانی پاراستوە.

بەڵام خوا کەبە ئافرەتان دەفەرموێ: بەقسەی مێردەکانتان بکەن، بەشێوەیەکی ڕێك، بە پیاوانیش دەفەرموێ: بەشێوەیەکی پەسند و باش هەڵس و کەوت لەگەڵ ئافرەتەکانتاندا بکەن:

﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴿١٩﴾ ﴾ النساء.

کەواتە: ئەرکەکانی ژنیش سێ شتی سەرەکیین:

١- شیر پێدان و بەخێوکردنی کۆرپە.

٢- فەرمانبەریی کردنی مێردو بەقسەکردنی -لە سنووری شەرعداو بە پێی توانا-.

٣- پاراستنی سومعەو سامانی ماڵ و مێردی.

هەڵبەتە ئەگەر لێیان وردبییەوە، هەر کام لەو ئەرکانە، پڕ بەپێستی سروشتی هەرکام لە پیاوان و ژنانن.

باسی
پێنجەم

## پیاوان و ئافرەتان
## لەئەرك و مافەگشتییەکان دا یەکسانن

بالەو بارەوە چەند ئایەتێکی قورئانی مەزن بەنموونە بهێنینەوە:

١- خواعز وجل لەئایەتی ژمارە (٧١)ی سوورەتی (التوبە)دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾

واتە: پیاوانی براوادار و ئافرەتی بڕوادار، هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن: فەرمان بەپەسندەکان دەکەن و، ڕێگریی لەناپەسندەکان دەکەن و، نوێژ بەرپادەکەن و، زەکات دەدەن و، فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن..

وەك دەبینین: خوا پیاوان و ئافرەتانی بڕواداری وەك دۆست و پشتیوانی یەکدی، لەجێبەجێکردنی شەش(٦) ئەرکان دا یەکسان کردوون.

٢- لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ

وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (٣٥) ﴾

لێرەش دا خوای دادگەر و کارزان پیاوان و ئافرەتانی بڕواداری بە دە(١٠) خەسڵەتی بەرز و پەسندی بنەڕەتیی بەشێوەیەکی یەکسان، پێناسەکردوون کە بریتین لە:

١- ئیسلام.

٢- ئیمان.

٣- فەرمانبەریی بۆ خوا.

٤- ڕاستگۆیی.

٥- خۆڕاگریی.

٦- ملکەچیی بۆخوا لەناخەوە.

٧- ماڵ و سامان بەخشین.

٨- ڕۆژووگرتن.

٩- داوێنی خۆپاراستن.

١٠- زۆر یادی خوا کردن.

دواییش بۆ هەردووکیان وەك یەك، لێبوردن و پاداشتێکی مەزنی داناوە.

٣- هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ .. ﴾ النساء.

واتە: پیاوان پشکیان هەیە، لەوەی دایك و باب و خزمان بەجێی دەهێڵن و، ئافرەتانیش پشك و بەشیان هەیە، لەوەی دایك و باب و خزمان بەجێی دەهێڵن وەك میرات.

٤- هەروەها هەر لە سوورەتی (النساء)دا خوا فەرموویەتی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ﴾ (النساء:٣٢).

واتە: پیاوان لەوەی وەدەستی دێنن، خاوەنی بەرهەمی خۆیانن و، ئافرەتانیش لەوەی وەدەستی دێنن، خاوەنی بەرهەمی خۆیانن.

یانی: موڵکییەتیی تاك بۆ هەردووکیان وەك یەکە.

# باسی شەشەم

## نکووڵیی لەدوا کەوتوویی مسوڵمانان ناکرێ، لە بواری مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەتدا

دواکەوتوویێتیی مسوڵمانان بەگشتیی -نەك تاك تاکیان- لە مامەڵە و هەڵس و کەوتیان لەگەڵ ئافرەتدا، ڕاستییەکی تاڵە و دەبێ دانی پێدا بێنین، بەڵام کە مسوڵمانان دواکەوتوون، لە ئیسلام دواکەوتوون، نەك لە ڕۆژگارو سەردەم و، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، دواکەوتبن، چونکە ئەوەی کە لە ئیسلامدا هەیە بۆ ئافرەتان، لە ڕێزو حورمەت و ماف دابین کردن و، ئازادیی، بەدڵنیاییی نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژئاوادا هەیە، بەڵام زۆربەی مسوڵمانان لە دینەکەی خۆیان دواکەوتوون، لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئافرەتاندا، هەروەك لە زۆربەی بوارەکانی دیکەی دینداریی دا، بەجێماو و دواکەوتوون، بەڵام لەسۆنگەی دوورکەوتنەوەیانەوە لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خوا، لە هەردووك بواری: تێگەیشتن و پابەندیی (الفهم الإلتزام)دا.

ئەگەرنا بەڵگە لەسەر ئەوە، کە پێویستە ئافرەتانیش وەك پیاوان تەماشابکرێن، لەڕووی دینداریی و دنیادارییەوە، زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە تەنیا ئاماژەیەکی کورت بەدووانیان دەکەین:

١- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ} أخرجه أحمد برقم (٢٦٢٣٨)، والترمذي برقم (١١٣)، قال الألباني: صحيح.

واتە: بێگومان ئافرەتان لەتکی پیاوانن، یانی: وەك سێوێك بیکەی بە دوو کەرتەوە، ڕاست و چەپ، وەك یەکن و یەکسانن..

٢- زانایانی (أصول الفقه) بۆ وێنە: (عبدالكريم زيدان) لە (الوجيز في أصول الفقه)[1] و، (عبدالله بن يوسف الجديع) لە (تيسير أصول الفقه)دا،دەڵێن[2]: {خطابات الشرع موجهةٌ للجميع إلاّ ما خَصّه الدليل بأَحدهما دون الآخر}. واتە: هەموو دواندنەکانی شەرع، ڕوویان لەهەمووکەسە (لەپیاوان و ئافرەتان) مەگەر شتێك بەبەڵگەیەك تایبەت کرابێ بە یەکێکیانەوە.

ئەگەرنا بۆ وێنە: [يا أيها الذين آمنوا] یانی: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە پیاوو ئافرەتەوە، بە نێرو مێوە، هەروەها (ياأيها الناس) و (يابني آدم) و (ياأيها الإنسان) بەهەما شێوە.

بەڵام بەداخەوە مسوڵمانان لە دینەکەی خۆیان دواکەوتوون، بۆیە لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا، هەروەك لە مامەڵە کردن لەگەڵ منداڵدا، هەروەها مامەڵەکردنی حوکمڕانان لەگەڵ کۆمەڵگادا، دیسان مامەڵە کردنی کۆمەڵگا هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا، هەروەها خزم لەگەڵ خزم و، دراوسێ لەگەڵ دراوسێ و ...هتد!

ناشەرعیی و غەڵەت و پەڵەتی زۆر هەن و، کەسێك نەزان یان بێویژدان نەبێ، تێکڕای ئەو غەڵەت و پەڵەت و دواکەوتووییانە، دەگێڕێتەوە بۆخودی مسوڵمانان - واتە: مسوڵمانانی خاوەن هەڵەوپەڵە و دواکەوتوو- کەم و زۆر ڕووی ڕەخنە و گلەیی ناکاتە ئیسلامی بەرجەستە لەفەرمایشتی بێ هاوتای خوای تاك و پاك و، ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوادا (صلی الله علیه وسلم)، کەلەهەموو ڕووێکەوە:هەق و دادگەریی ڕەهایان گرتۆتە خۆیان.

---

(١) ص ٣٠٨.
(٢) ص ٢٥٥.

باسی
حەوتەم

## بووناسیی ڕۆژئاوا، هەڵوێستی پێکەوە دژ و ناکۆك بوونی ژن و پیاوی بەرهەم هێناوە:

ئەوە کە ئێستا لە دنیادا زۆر باوە، بەتایبەت جووڵانەوەکانی (فیمینیزم) (fiminism)، دەڵێن: دەبێ (ژن سالاریی) بێ، چونکە بە درێژایی مێژوو (پیاو سالاریی) بووە، با ئەوجارە ببێتە ژن سالاریی، ئنجا پیاویش دەڵێ نەخێر: دەبێ هەر پیاو سالاریی بێ، چونکە جارێ نەبۆتە ژنسالاریی، پیاوان مەزڵوومن، ئەدی ئەگەر ژنسالاریی بێ، چیمان بەسەردێ!!

ماوەیەك پێش ئێستا لە یەکێ لە کەناڵەکان بینیم پیاوێك دەیگوت: ئێمە ڕێکخراوێکی پیاوانمان دروست کردوە، چونکە ئێمە مەزڵوومین، ژنان لە پیاوان دەدەن!! ئنجا ئایا ئەمە لەکوێوە هاتوە؟! دەڵێین: بێگومان ئەمە هەمووی لە ڕۆژئاواوە هاتوە، بەڵێ کاتێك مسوڵمانان لەدینەکەی خۆیان دوا دەکەون، لە قورئان باش تێ ناگەن و، گوێ بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناگرن، ئنجا چ کە ژن حەقی مێردی خۆی نادات و، مامەڵەی باشی لەگەڵ ناکات، چ کە پیاو لەگەڵ ژنی خۆی دا خراپ دەبێ، هەروەها خراپیی دایك و باب لەگەڵ منداڵەکانیان و، خراپیی منداڵ لەگەڵ دایك و بابییان، هۆکاری هەمووی: لادانە لە شەریعەت، بەڵام ئەوە کە ئافرەت و پیاو بەگژ یەکدا بکرێن، ئەوە لە ڕۆژئاواوە هاتوە، بووناسیی ڕۆژئاوا، کەکاتی خۆی یۆنانییەکان و

گریکەکان و ڕۆمانییەکان تەبەننییان کردوە، لەسەر ئەوە بنیاتنراوە، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: (مرۆڤ دژی خوایە و، خوا دژی مرۆڤە)!! ئنجا تۆ لە کتێبە دینییەکەتدا بڵێی: خوا دژی مرۆڤەو، پێی خۆشە نەزان بێ و، بێ ئاگا بێ! بێگومان ئەوبیرۆکەیە لەئەودیو هەست(لاشعور)ی مرۆڤ دا، هەستێك لەلای خەڵك دروست دەکا، کە ئەویش دژی خوا بێ!!

بەڵێ بەڕێزان! بیرۆکەی چەوتی: بەماددیی تەماشاکردنی ژیان و، بەئاژەڵ دانانی مرۆڤ، کە کرۆك و جەوهەری زۆربەی ڕەوت و تەوژمە فیکریی و فەلسەفییەکانی ڕۆژئاوایە، هەر لە ڕۆژگاری گریگ و یۆنانییەکانەوە، تاکو ئێستا و هەمیشە بەچاوی ناحەز و نەیار و دژ تەماشای شتەکان دەکات.

بۆوێنە: لەمامەڵە لەگەڵ گەردوون و سروشت دا، لەجیاتی ئەوەی بڵێ: باسروشت بناسین و پێی ئاشنابین و یاسایەکانی بدۆزینەوە و پەی بەنهێنییەکانی ببەین، دەڵێ: با بەسەر سروشت دا زاڵ بین!

هەروەها لەبواری مامەڵەپێکەوەکردنی ژن و پیاویش دا، بەهەمان شێوە: یان پیاو سالاریی، یان ژن سالاریی! واتە: هەردەبێ یەکیان مل بەوی دیکە کەچ بکات و تەسلیمی بێ! لەجیاتی ئەوەی پێکەوە تەبا و هاوکاربن.

بەڵێ فەلسەفەی: پێکەوە دژ و ناکۆك بوونی شتەکان: خوا و مرۆڤ، مرۆڤ و سروشت، نێرومێ، لە ڕۆژئاواوە هاتوە، کە بێگومان فەلسەفەیەکی فاشیلە و، پێچەوانەی سروشتیشە، پێچەوانەی ئەم واقیعە سروشتییەیە کە خوا خوڵقاندوویەتی.

چونکە: ئێمە دەبینین مانگ و خۆر، دارو بەرد، ئایا لە خزمەت مرۆڤدان، یان دژی مرۆڤن؟ بێگومان لە خزمەت مرۆڤدان، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية، واتە: خوا لەلایەن خۆیەوە هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دایە، بۆی دەستەمۆ و ملکەچ کردوون.

ئنجا ئافرەت و پیاو، ئایا وا بەرژەوەندییان باشترە، پێکەوە هاوکاربن، یان پێکەوە دژ بن؟ ئەگەر پێکەوە هاوکار نەبن، نە منداڵیان پەیدا دەبێت و، نە منداڵیان بۆ بەخێو دەکرێ و، نە ماڵیان بۆ بەڕێوە دەچێ و، ژیانیشیان دەبێتە دۆزەخ.

باسی
هەشتەم

## بیرۆکەی: خواردنی حەووا لەدرەختە قەدەغەکە و، دەرخواردانی ئادەم، لەپەیمانی کۆنەوە هاتوە و، قورئان و ئیسلام لێی بەریین

زۆربەی عەلمانییەکانی ئەم وڵاتەی ئێمە، لەبەر نەشارەزاییان هەندێك شت پاڵ دەدەنە لای ئیسلام، کە ئیسلام لێی دوور و بەرییە، بۆ وێنە: دەڵێن: ئیسلام دەڵێ: (حەووا) لە درەختە قەدەغەکەی خوارد و، ئادەمیشی تووش کرد! ئنجا دواییش ئەو تۆمەت و گومانە دەکەنە بەڵگەی ئەوە، کە ئیسلام بەکەم تەماشای ئافرەت دەکات و، بەهۆکاری گوناهی یەکەمی دەزانێ!! بەڵام با بۆتان بخوێنمەوە، ئەمە دەقی قسەی پەیمانی کۆنە، واتە: (تەورات)، کەباسی ئەوە دەکات چۆن ئادەم و حەووا لەبەهەشت دەرکران:

{وكانت الحيّة أمكر وحوش البريّة التي صنعها الربُّ الإله، فَسَألتِ المَرأةَ: أَحَقّاً أَمَرَكُما اللهُ ألاّ تأْكلا مِن جَميع شجر الجنّة؟ فَأَجابتِ المَرأةُ: يُمكننا أن نَأكلَ مِن ثَمر الجَنّة كُلِّها، ما عَدا ثَمر الشّجرة الّتي في وَسَطِها، فقد قال الله: لا تأكلا مِنه، ولا تَلمساهُ، لِكَي لا تَموتا، فَقالتِ الحيّة لِلمرأة: لَن تَموتا! بلِ الله يَعرفُ أنّه حينَ تأكلان مِن ثَمر هذهِ الشَّجرة، تنفتِحُ أَعكيُنكُما، فَتَصيرانِ مِثلَهُ، قادرَين على التّمييز بين الخير والشر، وعندما شاهَدت

المَرأةُ، أنَّ الشّجرة لذيذةٌ لِلمأكل وشَهيَّةٌ للعيون، ومُثيرةٌ لِلنَّاظر، قَطَفت مِنْ ثمرها وَأَكَلت ثم أَعطت زَوجها أَيضاً، فأكل مِنها}.(١)

[شایانی باسە: لە قورئاندا باسی (مار) هەر نەهاتوە کە چووبێ حەووای هەڵخەڵەتاندبێ] واتە: مار فێڵبازترین دڕندەی دەشتێ بوو، کە پەروەردگاری پەرستراو دروستیکردبوون، مار لە ئافرەتەکەی پرسی: [ناوی نەهێناوە، واتە: حەووا] ئایا ڕاستە خوا فەرمانی پێ کردوون کە لەهەموو میوەی درەختەکانی بەهەشت بخۆن؟ ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە بەڵێ: بۆمان هەیە لەهەمووی بخۆین، جگە لە میوەی ئەو درەختەی کە لە نێوەڕاستی بەهەشتێیە، خوا فەرمووی: لێی مەخۆن و، دەستی لێ مەدەن، بۆ ئەوەی نەمرن، مارەکە بە ئافرەتەکەی گوت: نامرن، بەڵکو خوا دەزانێ: ئەگەر ئێوە لە بەری ئەو درەختە بخۆن، چاوتان دەکرێتەوە و، وەك خوا توانای ئەوەتان دەبێ: چاکەو خراپە لێك جیابکەنەوە [یانی: بۆ ئەوەی وەك ئەوتان لێ نەیەت، بۆیە فەرموویەتی: لێی مەخۆن!](٢) ئنجا کاتێك کە ئافرەتەکە درەختەکەی بینی، تەماشای کرد: میوەکەی بۆخواردنێ زۆر خۆشە و، زۆر سەرنج ڕاکێشە بۆ چاو، ئیدی لەمیوەکەی چنی و، لێی خوارد و، دای بە مێردەکەی و ئەویش لەگەڵی خوارد.

دوایی لە تەفصیلەکەی دا دەڵێ: خوای پەروەردگار فەرمووی: لە بەهەشتێ بچنە دەرێ!

بەڵام ئایا خوای کاربەجێ لە قورئاندا چی فەرمووە لەوبارەوە؟! با سەرنج بدەین:

﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ﴾ طه.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح ٣، ص ١٢،١٣، سقوط الإنسان.

(٢) نێوان کەوانەکان { } زیادەی خۆمە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

واتە: (ئادەم و حەووا) پێکەوە لێیان خوارد و، عەیب عاری خۆیانیان بۆ دەرکەوت، ئنجا لە گەڵای درەخت لێیان کردەوە، بۆ ئەوەی خۆیانی پێ داپۆشن و، (ئادەم) سەرپێچیی لە فەرمانی پەروەردگاری کرد و، تووشی بێ مرادیی و نارِەحەتیی بوو.

چونکە ژیاندنی حەوواش وەك شتێکی سروشتیی، هەر لەسەر ئادەمە، کە دەبێ کەسابەتی بۆ بکاو، ژیانی بۆ دابین بکا، بۆیە دەفەرموێ:

﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ١٢١﴾ طه.

ئادەم تووشی بەدبەختیی بوو، تووشی ژیان تاڵیی بوو، دەبوو لەوەودوا: بە رِەنجی شانی خۆی، خۆیشی و حەوواش بژیەنێ.

باسی
نۆیەم

## پەیمانی کۆن گوتوویەتی: حەووا لە پەراسووی چەپی ئادەم دروست بووە، نەك قورئان و ئیسلام

ئەم بیرۆکەیەش هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نیە، هەرچەندە بەداخەوە ئێستاش زۆرێك لە زانایانی ئیسلام هەردەڵێن: حەووا لەپەراسووی چەپی ئادەم دروست بووە، ئاخر ئەوە لەکوێ دایە؟ ئەوەش هەر لە تەوراتدایە[١] و، نە لەقورئاندا شتی وا هەیە و، نە لە سوننەتیشدا!.

ئەمەش دەقی تەوراتە لەوبارەوە:

{فأوقع الربُّ الإلهُ آدَمَ في نومٍ عميقٍ، ثم تناول ضِلْعاً مِن أضْلاعه، وَسَدَّ مَكانها باللّحم، وعَمِلَ من هذه الضلْعِ آمرأةً أَحْضَرها إلى آدم}.[٢]

واتە: پەروەردگاری پەرستراو ئادەمی خستە خەوێکی قووڵەوە، دوایی یەکێك لە پەراسووەکانی دەرهێنا و، شوێنەکەی بە گۆشت داخستەوە و، لەو پەراسووە ئافرەتێکی لێ دروستکرد و، بۆ ئادەمی ئامادە کرد.

---

(١) واتە: تەوراتی گۆڕراو و دەستکاریی کراو، نەك ئەوەی خوا عزوجل بۆ مووسا (علیه السلام)ی ناردوە.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح ٢، ص

دیارە هەندێك لە زانایان و مامۆستایان، نەك تەنیا هی کوردستان دا، بەڵکو هی شوێنانی دیکەش و لە تەفسیرەکانیشدا زۆر هاتوە، کە دەڵێن: حەووا لەئادەم دروست بووە، پێیان وایە ئەم ئایەتە بەڵگەیە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ﴾ (النساء:١).

واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن، کە لە یەك نەفس دروستی کردوون، دوایی هەر لە خۆیشی هاوسەرەکەی دروست کردوە.

بەڵام بێگومان ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ، چونکە ئەگەر ئەم ئایەتە بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی حەووا لە ئادەم دروست بووە، دەبێ ئایەتی ژمارە (٢١) لە سوورەتی (الروم)یش، بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی، هەموو ژنەکان، لە پیاوەکانی خۆیان دروست بوون! چونکە لەوێش خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا .... ﴾ الروم: ٢١.

واتە: لە نیشانەکانی (خوا) ئەوەیە کە: لە خۆتان ژنەکانتانی دروست کردوون.

دیارە وشەی لە خۆتان (من أنفسكم) هەروەك ئایەتی ژمارە (١)ی سوورەتی (النساء)ە، (منها) کەمانای ڕاستەقینەی ئەوەیە: لە شێوەی خۆتان و لە هەمان چییەت و جەوهەر، ئنجا بۆچی خوا وای فەرمووە؟!

ئینسان ئەگەر شارەزای فیکر و مێژووی مرۆڤ و فەلسەفەکانی پێشی نەبێ، نازانێ خوای پەروەردگار هەندێ شتی بۆچی فەرمووە!! هەتا ئەو دوا دواییانەش هەر لە (ڕۆم) لەو ئەورووپایەی ئێستا، موناقەشە بووە لەسەر ئەوە کە: ئایا ژن، وەك پیاو نەفس و ڕووحی هەیە، یان نا؟ هەندێك گوتوویانە: نەخێر ئافرەت وەك پیاو ڕووحی نیە، دوایی هاتوونە سەر ئەوە کە ئافرەتیش ڕووحی هەیە، بەڵام ڕووحێکی ئاژەڵیی هەیە!! ئنجا لێرە خوای پەروەردگار ئەوانە بە درۆ دەخاتەوە کە دەفەرموێ: [خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ]، واتە: ئەی پیاوینە! ژنانیش لە خۆتانن و، هەر لە هەمان نەفسن و، هیچیان لە ئێوە کەمتر نیە!

ئنجا هەندێ فەرمووودەش لەوبارەوە هەن، بۆوێنە:{وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا} أخرجه البخاري برقم (٣١٥٣)، ومسلم برقم (١٤٦٨)، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (٩١٤٠).

واتە: ئامۆژگارییتان دەکەم دەربارەی ئافرەتان: بەچاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، چونکە لە پەراسوو دروست بوون[1]و، خوارترین بەشی پەراسووش لای سەرێیەتی، ئەگەر ویستت ڕاستی بکەیەوە، دەیشکێنی، [ئایا پەراسوو ئەگەر ڕاستی بکەیەوە ناشکێ؟!] بەڵام ئەگەر لێی گەڕێی، خوارییەکەی هەر دەمێنێ و (ئیستیفادەی لێ دەکەی) ئاگاتان لە ئافرەتان بێ!

**ئایا مەبەست ئەوەیە کە ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە؟**

با تەماشای ئەو فەرموودەیەی دیکە بکەین کە دەفەرموێ: {الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا، اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ} وفي روايةٍ: فَكَسْرهُا طلاقُها، أخرجه البخاري: (٤٨٨٩) ومسلم: (١٤٦٨).

واتە: ئافرەت وەك پەراسوو وایە، ئەگەر ڕاستی بکەیەوە دەیشکێنی، ئەگەر لێشی گەڕێی، بەلاریی لێی بەهرەمەند دەبی، لە ڕیوایەتەکەی دیکەدا فەرموویەتی: کە شکاندنەکەشی مەبەست پێی تەڵاق دانیەتی.

ئنجا با بۆتان شی بکەمەوە:

یانی چی ئافرەت لە شێوەی پەراسوودا دروست بووە؟ دەڵێین: پەراسووەکان قەفەسی سینگیان دروست کردوە، ئینسان چەند پەراسووی هەن؟ بیست و چوار (٢٤) پەراسووی هەیە، هەر لایەی دوازدە (١٢)ەن، ئنجا ئەو پەراسووانە، چییان دروست کردوە؟ قەفەس، ئەو قەفەسەی سینگە چی تێدایە؟ جگەر، دڵ، سییەکان، پەنکریاس، زۆر شتی تێدایە، هەناوی ئینسان لەنێو ئەو قەفەسە دایە، ئنجا کە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئافرەت وەك پەراسوو

---

(١) لە پەراسوو دروست بوون (خُلِقْنَ من ضِلَعٍ) یانی: سیفەتی پەراسوویان هەیەکە: خواریی (تَقَوُس)ە، ئەمە وەك ئایەتی: (خلق الإنسان من عَجَلٍ..) -الأنبياء: ٣٧-ە، یانی مرۆڤ سیفەتی پەلە کردن (عجلة)ی هەیە!

وایە، ئایا پەراسوو ئەگەر لار نەبووایە، دەیتوانی قەفەس دروست بكا؟ ئەگەر وا نەبووایە لە جەستە هەڵدەچەقی! هی وا هەیە پەراسووی دەشكێ، تاكو چاك نەبێتەوە، یان تاكو نەشتەرگەریی بۆ نەكرێ، حاڵی نامێنێ، كەواتە: پەراسوو بەو لارییەی توانیویەتی قەفەس دروست بكات، ئافرەتیش بەو سروشتەی كە خوا بەشێوەیەك خوڵقاندوویەتی، لەچاوی پیاودا - كەعەقڵی بەسەر سۆز (عاطفة)ی دا زاڵە - لار و خوارە، وەك چۆن پەراسووەكان قەفەسیان دروست كردوە، پارێزگاریی دەكەن لە دڵ و سییەكان و جگەرو هەناوی ئینسان، ئافرەتیش بەو لارییەی كە هەیەتی، شایستەیی ئەوەی پەیدابووە كە ئەركی دایكایەتیی ئەنجام بدات، بەڵێ ژن وەك پیاو نیە، وەك پیاو بیر ناكاتەوەو ئەو لارییەی بە نسبەت پیاوەوەیە، ئافرەت كە عاتیفەو سۆز بەسەریدا زاڵە، پیاو بە لاریی دەبینێ، كە ڕەنگە ئافرەتیش پیاو بە(لار) ببینێ، ئافرەتیش دەڵێ: ئەو پیاوە زۆر دڵڕەقە، زۆر لارە، پیاویش كە تەماشای ئافرەت دەكا، دەڵێ: تۆ وەك من بیر ناكەیەوە! زۆر جار ژن و مێرد بۆچی تێك ناگەن، پیاوەكە دەیەوێ ژنەكە وەك ئەو بیر بكاتەوە و، ژنەكەش دەیەوێ پیاوەكە وەك ئەو بیر بكاتەوە، بەڵام ئەگەر هەر كامێكیان ئیشی خۆی بكاو، تەقدیری ئەوی دیكە بكات و، تایبەتمەندییەكانی لەبەرچاو بگرێ، زۆر لە گرفتەكانیان حەل دەبن.

كەواتە: ئایەتەكان ئەوە ناگەیەنن كە هەندێ لەزانایان لەژێر كاریگەریی قسەی پەیمانی كۆن دا، لێیان فامیونەوەو، فەرمایشتەكەش مەبەست پێی ئەوەیە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئافرەت تەشبیە دەكا بە پەراسووەوە، كە وەك چۆن پەراسووەكان قەفەسی سینگن و، هەناوی ئینسان دەپارێزن، ئافرەتیش بەو سۆز و بەزەیی و هەست و جەستەی ناسكی، ژینگەیەكی وا پێك دێنێ، كە ڕۆڵەی ئینسان دەپارێزێ و، جگەرگۆشەكانی پێ دەگەیەنێ.

ئنجا خوای پەروەردگار كۆمەڵێك تایبەتمەندیی داون بەئافرەت، كە پیاو بەهۆیانەوە (لار)ی دەبینێ، تەماشای سۆزی بكە! زوو هەڵدەچێ، سەرنج بدە خۆشەویستیی بۆ منداڵەكەی! زۆر جار بیر دەكەمەوە: ئەوەی بە ئافرەت دەكرێ، كەی بە پیاو دەكرێ؟! هەر منداڵەكەی بگری، باوەشی لێ دەدا، دەیشواتەوە، پاك و خاوێنی دەكا! بەڵێ ئەوەی بە ئافرەت دەكرێ، بە پیاو ناكرێ، وەك چۆن ئەوەی، بە پیاویش دەكرێ، بە ئافرەت ناكرێ.

# باسی دەیەم

## مێیینەبوونی ئافرەت نوقسانیی نیە، تاکو بە لاساییکردنەوەی پیاو، یان بە دژایەتیی کردنی، قەرەبووی بکاتەوە

مێیینە بوونی ئافرەت: نە فەزیڵەتە، نە نەقوسانییە، هەروەك چۆن: نێرینە بوونی پیاویش، نە فەزیڵەتە، نە نەقوسانییشە بۆی، چونکە پیاوەکان بۆخۆیان خۆیان نێر نەکردوە و، ئافرەتەکانیش بۆخۆیان خۆیان نەکردوە بە مێ، کەواتە: فەزیڵەت و نوقسانیی، پەیوەست نین، بە نێرایەتیی و مێیایەتییەوە، بەڵکو وەك خوای کاربەجێ و دادگەر فەرموویەتی، پارێزکاریی (تقوى) سەنگی مەحەکە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ الحجرات.

(إن أكرمكم عندالله أتقاكم) بەڕێزترتان لەلای خوا پارێکارترتانە، نەیفەرمووە: ئەوەی پیاوتر بێ، یان ئەوەی ژنتر بێ! براو خوشکانی بەڕێز! ئیسلام بەرنامەیەکی ڕاست و هاوسەنگە، خوا بۆ مرۆڤی داناوە، خواش ڕەگەز (جنس)ی نیە، تاکو بەلایەکدا دایشکێنێ: ﴿إِذَا قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾ الإخلاص، (أي: واحدٌ لا ثاني له) یەکە و دووەمی نیە (أحد لامِثْل لَهُ) تاکە و وێنەی نیە.

هەندێك دەڵێن: ئەدی بۆچی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾، بە ڕاناوی (هو)ی ڕەگەزی نێر؟ دەڵێین: لەزمانی عەرەبییدا هەموو شتێك، یان (مذکّر)ی (مجازي) یان (مؤنّث)ی (مجازي)، هەموو شتێك وایە، بۆ وێنە: هەموو ئەو ئەندامانەی لەجەستەی مرۆڤدان، ئەگەر تاك بن، بە (مذكّر) ناو دەبرێن و، ئەگەر جووت بن، بە (مؤنث) ناودەبرێن، بۆ وێنە لووت، دەڵێ: (هذا أنفٌ)، بەڵام بۆ چاو دەڵێ: (هذه عَينٌ)، (هذه يدٌ)، (هذهِ أُذنٌ)، (هذا رأسٌ)، (هذا بَطنٌ)، یانی: هەرچی تاکە لە جەستەدا، بە (مذکر)ی (مجازي) دادەنرێ و، هەرچی جووتە، بە (مؤنث)ی (مجازي) دادەنرێ، زمانی عەرەبیی وایە و پەیوەندیی بەوەوە نیە کە خوای بێ وێنە نێربێ، یان مێ بێ، خوا هیچ ڕەگەزێکی نیە و، ئەصڵەن بنچینەی: جووتیی (زوجية) خوا، لەنێو دروستکراوەکانیدا دایناوە.

هەر بۆیەش [ئەمە بۆ هەمووانە، بەڵام زیاتر خوشکان دەگرێتەوە] ئەو ئافرەتانەی کە بەتەمان لەسروشتی خۆیان هەڵگەڕێنەوە، لە مێیینە بوونی خۆیان هەڵگەڕێنەوە، لەبەر ئەوەیە کە ئافرەت بوون، بە نوقسانیی دەزانن، بەڵام لە ئیسلامدا، ئافرەت بوون، نوقسانیی نیە، مێینە بوون، نوقسانیی نیە، هەروەك پیاو بوون و نێر بوونیش، فەزیڵەت نیە، چونکە: خوا وای داناوە و نێر چەند پێویستە بۆ ژیان، مێش هێندە پێویستە، سیفەتەکانی پیاوان چەند پێویستن بۆ کۆمەڵگا، سیفەتەکانی ئافرەتانیش هێندە پێویستن و، پەیوەندیی تەواوکارییان پێکەوە هەیە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەفرینی لەو جۆرە پیاوو ئافرەتانە کردوە کە لاسایی یەکدی دەکەنەوە: {لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنْ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ} أخرجه البخاري برقم (٥٥٤٦).

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی کردوە لەو پیاوانەی کە خۆیان وەك ژنان لێ دەکەن و، لەو ژنانەی خۆیان وەك پیاوان لێ دەکەن.

چونکە: ئەگەر پیاوێك خۆی وەك ژنان لێ بکات، لەڕووی دیمەن و پۆشاکی و هەڵسوکەوتی و ڕەفتارییەوە، مانای وایە لەو سروشتەی خۆی ڕازی نیە، هەروەها ئەگەر ژنێك خۆی وەك پیاو لێ بکا، دیارە ئەویش لە سروشتەکەی

خۆی ڕازی نیە، ئەوەی کە خوا پێی داوە، بۆیە لەعنەتیان لێ کراوە! دیارە ئەو حاڵەتەش ئێستا لەڕۆژئاوا بەزەقیی دەیبینین: ئافرەت هەیە نەشتەرگەریی دەکات، خۆی بکاتە پیاو، پیاویش هەیە، نەشتەرگەریی دەکات خۆی بکاتە ژن! ئا ئەوەیە هەڵگەڕانەوە لە فیترەت و خوارسك!

هەروەها پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمویٚ: {لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ، وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ} أخرجه أبو داود برقم (٤٠٩٨)، والحاكم برقم (٧٤١٥)، وقال: صحيح على شرط مسلم، قال الألباني: صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی کردوە لە پیاوێك کە بەرگی ژنان لەبەر دەکا و، لە ژنێك کە بەرگی پیاوان لەبەر دەکا.

کۆتایی ئەم بابەتەش بەوە دێنم: کەئەو ئەرکانەی داندراون بۆ پیاوان و ئافرەتان، ئەگەر تەماشایان بکەی، دوور لە کارتێکردنی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات و، بە دوور لە کارتێکراویی بە (فیمینیزم)و پیاو سالاریی و ژن سالاریی، دەبینی: ئەوەی کە خوا دایناوە لە شەریعەتدا، لە واقیعیشدا هەروا هاتۆتە دی، بۆوێنە: لە شەریعەتی ئیسلامییدا، ئەرکی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، بۆ پیاوان دانراوە، چونکە: لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئافرەت لەوبوارەدا، هەر باس نەکراوە، هەروەها لەسەردەمی هەموو پێغەمبەران دا، ئافرەت بۆ ئەوکارە، باس نەکراوە، پێغەمبەران (عليهم السلام) هەموویان پیاو بوون.

ئنجا تەماشای واقیعیش بکە: لەو هەموو سەرۆك دەوڵەتانەی دنیا، چەند ئافرەتێکی کەم دەبینیی، وەك مێژووش تەماشا بکە، شاژنی (سەبەء) دەبینی! یانی: ئەو ئافرەتانەی پۆستی سەرۆکایەتییان وەرگرتوە: بە ژمارەی پەنجەکان دەژمێردرێن، چ هی پێشێ و، چ هی ئێستا، ئنجا ئەگەر لێرە، لە وڵاتانی مسوڵمانان دا، شەریعەت ڕێگر بێ لە ژنان، ببنە سەرۆك [هەرچەندە حیزبە عەلمانییەکان کەمتر لە لایەنە ئیسلامییەکان، بوار بەئافرەت، دەدەن، یانی: ئافرەت ئێستا لە لایەنە ئیسلامییەکاندا زیاتر هەڵکشیوەو، دەوری هەیەو، ڕۆڵی

بینوه] بەڵام ئەگەر بگوترێ: لەنێو مسوڵماناندا خەتای کلتووری مسوڵمانانە، بێگومان لە دەوڵەتی ئەمریکا، کلتووری مسوڵمانان پەرچ و ڕێگر نیە، هەروەها لە هیندستان و لە چین و لەکوێ و کوێ! کەواتە: ئەوەی کە شەریعەت دایناوە، فیترەتیش هەر ئەوە دەخوازێ و، واقیعەکەش هەروایە.

## قسەیەك لەسەر (جەندەر) (Gender):

دوا قسەم لەم بەشەدا، ویستم قسەیەك لەسەر (جەندەر) (Gender) بکەم،کە لە عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (نوع) جۆر، براو خوشکانی بەڕێز! ئەم وشەیە وشەیەکی زۆر هەڵخەڵەتێنەرە، بەکار دەهێنرێ، کەبەداخەوە لە هەندێك لە خوشکی ئیسلامییشم بیستوە، بەکاری دەهێنن و، پێیان وایە: (جەندەر) یانی: نەهێشتنی جیاوازیی و ستەم لەنێوان پیاوو ئافرەت دا! کە تەبعەن ئەوە هیچ ئەصڵ و حەقیقەتی نیە، نەهێشتنی جیاوازیی لەنێوان پیاوو ئافرەت دا، ئەوەیە کە شەریعەت هێناویەتی: هەردووکیان مرۆڤن، هەردووکیان ئەرکیان لەسەر شانە، دەبێ پێکەوە بەڕێز بن، هاوکار بن، بەرامبەر بە کۆمەڵگا، بەرامبەر بە دین و بە ژین، بەرپرسیارن، کامەیان بەتەقوا تربێ، لەلای خوا بەڕێزترە.

بەڵام (جەندەر) شتێکی دیکەیە، وەك لە سەرچاوەکاندا باس کراوە، منیش ئەم پێناسەیەم هێناوە: {مفهوم الجندر له جذورٌ فلسفيّةٌ، تفترِضُ أنه لا توجد خواص مُعيّنةٌ للرجال وخواص أخرى للنساء، لا من حيث الطبيعة ولا النفسية، ومن ثُمّ فلا يوجد تمايُزٌ بين أيّ من الجنسين إلاّ في إطارٍ ضيّقٍ يعترف به النِّسويّون، فالجندر مفهومٌ يوحِّد بين نوعي الإنسان الذكر والأنثى، ليكونا بِلا أيِّ فروقٍ نفسيّةٍ أو عقليّةٍ أو حتى بيولوجية}[1].

واتە: چەمکی جەندەر چەند ڕەگ و ڕیشەیەکی فەلسەفیی هەن، کە گریمانەی ئەوە دادەنێن: هیچ تایبەتمەندییەك نیە بۆ پیاوان و ئافرەتان، لێکیان جیا بکاتەوە، نە لە ڕووی سروشتیانەوە، نە لە ڕووی دەروونیانەوە، [واتە: نە

---

(١) معركة الثوابت بين الإسلام والليبرالية، د.عبدالعزيز مصطفى كامل، ص١٢٨.

لەڕووی ڕواڵەتیان، نە لە ڕووی دەروونیانەوە] بۆیە: نابێ هیچ جیاوازییەکیان لە بەیندا هەبێ، مەگەر لە پەڕاوێزێکی زۆر تەسکدا، بۆیە جەندەر دەیەوێ: نێرو مێ وەك یەك لێ بکا، بە شێوەیەك کە نە جیاوازیی دەروونییان بمێنێ، نە جیاوازیی عەقڵیی، نە جیاوازیی بیولۆژیی [واتە: جیاوازیی جەستەیی].

کەبێگومان ئەوەش پێچەوانەی واقیعە، چونکە: جیاوازیی هەیە لەڕووی جەستەوە، وەك دەبینین، بەڵکو (ئەلکسیس کاریل) لە کتێبی: (الإنسان ذلك المجهول) دا دەڵێ: هەموو خانەکانی جەستەی ئافرەت تەبع دەکرێن بە هۆڕمۆنێ کە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، هەموو خانەکانی جەستەی پیاویش تەبع دەکرێن بەهۆڕمۆنی پیاوانە، بگرە، هەر لە نوتفەیانەوە جیاوازییەکەیان پەیدا دەبێ، ئنجا لە ڕووی قەبارەی ئێسقانیان، لە ڕووی قەبارەی کەللەسەر و مێشك و، لەڕووی هەڵکەوتەی سروشتیانەوە و، لە ڕووی ئەوەوە، کە چییان پێ خۆشەو چییان پێ ناخۆشە، هەروەها لەڕووی شێوەی بیرکردنەوەیانەوە و...هتد.

لە هەموو ڕوویەکەوە: خوای پەروەردگار وای داناوە، کە لێك جیا بن، بەڵام لێك جیابن، نەك دوژمنی یەك بن، بەڵکو تەواوکاری یەکدی بن، چونکە کۆمەڵگای بەشەر پێویستیی بە هەردووکیان هەیە، هەم بۆ ئەوەی مرۆڤ دروست بێ و، هەم بۆ ئەوەی بەشەر بەخێو بکرێ و، پەروەردە بێت و ژیانی بەڕێوە بچێ.

## بـــەرایی

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشی هەشتەمەی ئەم تەوەری پێنجەم و کۆتاییە لەبابەتی فراوانی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع دا) تەرخانکراوە بۆ توێژینەوە لەبارەی (تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەخەکان)ەوە و، فراوانترین بەشی ئەم تەوەرەیە.

دیارە کاتی خۆی لەتەوەری دووەمی ئەم بابەتە:(بیرکردنەوەی ئیسلامیی...)دا لەبیست (٢٠) بەشدا، باسی تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانانمان کرد و، هەر ئەوکاتیش گفتمان دا کە لەم تەوەری پێنجەدا، لەبەشێکی سەربەخۆ دا، لەبارەی (تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان)ەوە بدوێین.

ئنجا ئێمە لەدوو باس (مبحث)دا تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان دەخەینە ڕوو، بەم شێوەیەی خوارێ و لەژێر ئەم ناوونیشانانەدا:

**باسی یەکەم:** تەوژمە ئیسلامییە هاوچەرخەکان:

**١-** تەوژمی صۆفییگەریی (تيار التصوُّف).

**٢-** تەوژمی سەلەفیی (التيار السّلفي).

**٣-** کۆمەڵی تەبلیغ (جماعة التبليغ).

**٤-** کۆمەڵی نوور (جماعة النور - الجماعة النورسية).

**باسی دووەم: لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان:**

١- برایانی مسوڵمان (الإخوان المسلمون).

٢- کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان (الجماعه الإسلامية الپاکستانية).

٣- حیزبی تەحریر (حزب التحرير).

٤- کۆمەڵە جیهادییەکان (الجماعات الجهادية)

ئاشکراشە کە ئێمە ئامانجمان ئەوەنیە لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل، لەبارەی ئەو تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخانەوە بکەین و، بچینە نێو وردەکارییەکانیانەوە، بەڵکو زیاتر مەبەستمان پێناسەکردنیانە، وێڕای سووکە هەڵسەنگاندنی ئەوەی کە پێویستە بیزانین، لە بیروڕاو هەڵوێستەکانیان.

بۆیەش هەتا بگونجێ شێوازی گوشین و پوختکردنەوە بەکاردێنین و، بەهۆی ئاماژەکردن بەسەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکەشمانەوە، ڕێی بەدوادا چوون و توێژینەوەی ورد و قووڵ، بۆ خوێنەرانی بەڕێز تەخت و ئاچووخ دەکەین.

باسی
یەکەم

## تەوژمە ئیسلامییە هاوچەرخەکان

### یەکەم: تەوژمی صۆفییگەریی (تیار التصوف):

ئێمە لەتەوەری سێیەم دا، لەبەشێکی تایبەت دا باسی تەصەووف و ڕێبازەکانی و (تەزکیەی نەفس) مان کرد، بۆیە لێرەدا بەکورتیی و لە حەوت (٧) خاڵان دا، ئەوەی کە بەڕاستی دەزانین و، بە پێویستی دەزانین، لەو بارەوە دەیخەینە ڕوو:

**یەك:** براو خوشکانی بەڕێز! تەزکیەی نەفس، وەك پێشتریش باسمان کردوە: لایەنێکی بنەڕەتیی و گرنگیی مسوڵمانەتییە، تەزکیەی نەفس واتە: خۆ پاك و چاککردن، خۆ بژارکردن لە سیفەتە پەستەکان و، خۆ ڕازاندنەوە بەسیفەتە پەسندەکان.

دیارە هەوڵدان بۆ خۆ پاك و چاککردن (تزکیة) خاڵی هاوبەشی سەرجەم مسوڵمانانە و، لەسەر هیچ کەس تاپۆ نەکراوە، ئەوە زۆر گرنگە بیزانین، تەزکیەی نەفس تایبەت نیە بە هیچ کەسەوە و، لەسەر کەس تاپۆ نەکراوە و، هەموو مسوڵمانان هەر کەسێ ئیمانی هەبێ و تەقوای هەبێ، کەم و زۆر پشك و بەشی هەیە لە تەزکیەی نەفسدا، لە پاك و چاك بووندا.

**دوو:** وەك چۆن {مسوڵمان بوون} و {شوێنکەوتنی پێشینی چاك}، بەناو لە خۆنان و بە دروشم بەرزکردنەوەی ڕووت، نایەنە دی، کەسێك هەر لەخۆوە بڵێ: مسوڵمانم، ئایا لەلای خوا بەمسوڵمان لەقەڵەم دەدرێ؟! یان کەسێك هەر بە بانگەشە بڵێ: من شوێن پێشینی چاك دەکەوم، ئایا وا دادەنرێ؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر، ئنجا تەزکیەی نەفس و، ساغ و ساف بوونەوەش بۆ خوا، بەهەمان شێوە، بە قسەی ڕووت و بە بانگەشە نابێ، شتێکە دەبێ بە کردەوە لە خۆتیدا بیهێنیەدی.

هەر بۆیەش خوا سبحانە و تعالى سەرفرازیی (فلاح)ی بەستۆتەوە بە تەزکیەی نەفسەوە: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾ الأعلى.

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ ﴾ الشمس،

یانی: بەکردەوە هەر کەسێك خۆی تەزکیە بکات سەرفرازە، بەڵام بە پێچەوانەوە: هەر کەسێ بەقسە، خۆی پێ چاك بێ، خوای کارزان ئەوەی بە قەدەغە داناوە:

﴿ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ ﴾ النجم، واتە: بەقسە خۆتان پێ پاك و چاك نەبێ، خوا زاناترە بەوکەسەی پارێزکارترە.

هەروەها خوا دەربارەی جوولەکەکان، دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ﴾ النساء (٤٩).

واتە: ئایا تەماشای ئەوانە ناکەی، کە خۆیان پێ چاکە! کەواتە: خۆ پێ چاك بوون و، ئیددیعای چاکیی کردن، خراپە، بەڵام بەکردەوە خۆت چاك و ڕاست بکەی، ئا ئەوە پەسەندو پێویستە.

**سێ:** قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفیسش وەك مەزهەبە فیقهییەکان و، زانستی ئیمان و عەقیدە، بۆچوون و ئەزموونی زانایان و پسپۆڕانی ئەو بوارەن، یانی: وەك چۆن مەزهەبە فیقهییەکان و، قوتابخانەکانی عەقیدەو ئیمان و عیلمی کەلام هەن و، ئەو زانایانەی کە لەو بوارانەدا پسپۆڕن، خەڵك لە مەسەلەکانی فیقهدا دەگەڕێتەوە بۆ لای شەرعزانان و، لە مەسەلەکانی ئیمان و عەقیدەدا، دەگەڕێتەوە بۆ لای شارەزایانی ئەو بوارە، بە هەمان شێوەش: کۆمەڵێك لە

زانایان و پێشەوایانیش، کە پسپۆڕ بوون لەبواری: ڕەوشت و ئاکارو، بۆ خوا صوڵحان و، تەقوا لەخۆدا هێنانە دی و، خۆ پاك و چاككردن دا، پێویستە لەبواری پسپۆڕیی خۆیان بەهرەیان لێوەربگیرێ.

ئنجا وەك چۆن کەلەپوورو بەرهەمی زانایانی ئیمان و عەقیدە و، زانایانی فیقە و، زانایانی ئوصووڵ و، زانایانی مێژوو...هتد. کەم و کوڕیی تێ دەکەوێ و، کرچ و کاڵیی تێ دەکەوێ، بەتەئکید هی تەزکیە و تەصەووفیش هەر وایە، بەڵکو زیاتریشی تێ دەکەوێ، لەبەر ئەوەی پەیوەستە بە لایەنی عاتیفەو، هەست و نەست و، مامەڵە کردن لەگەڵ لایەنی ڕووحیی دا، کەنادیارە.

**چوار:** ڕێبازەکانی تەزکییە و، قوتابخانەو ئەزموونەکانی، لەگەڵ [تەزکیەی نەفس]دا، هەمیشە پێکەوە گرێ دراوو پێکەوە پەیوەست نین، واتە: مەرج نیە هەر کەسێ شوێنکەوتووی یەکێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف بوو و، سەر بەیەکێ لە قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفس بوو، خاوەنی نەفسێکی تەزکیە کراویش بێ، هەروەك مەرجیش نیە: هەر کەسێ سەر بە یەکێك لەو ڕێبازانە نەبوو، سەر بە یەکێ لەو قوتابخانانە نەبوو، ناوی یەکێك لەو قوتابخانانەی لەسەر نەبوو، وەك (نەقشبەندیی، قادریی، سوهرەوەردیی، ریفاعیی، غەززالیی، سەمنانیی)کە کاتی خۆی باسمان کردن، مەرج نیە هەر کەسێك ناوی یەکێ لەوانەی لەسەر نەبوو، دەستی خاڵیی بێ و بێبەش بێ، لە تەزکیەی نەفس! بەڵکو دەگونجێ کەسێك نەك هەر ناوی یەکێك لەو ڕێبازانەی لەسەر بێ، بەڵکو خۆی بە پێشەوای یەکێك لەو ڕێبازانەش بزانێ، کەچی پڕیش بێ لە خڵتە، لە جیاتی ئەوەی دڵ و دەروونی خۆی ساف و ساغ کردبێتەوە، پڕ بێ لە خڵتەو خاڵ، لەبەر ئەوەی لە پەنای ئەو تەریقەت و تەصەووف و قوتابخانەیەدا، کە کاتی خۆی ڕەنگە پێشینەکانی زۆر خزمەتیان کردبێ، ئەو دووکانی داناوەو خۆی دەژیەنێ!

**پێنج:** وشەی (تزكية)، وێڕای گەشەکردن و پاکبوونەوەو چاکبوون، لەسەر ئاستی تاك، واتای پاکسازیی و چاکسازیی گشتیی و هەمەلایەنەی کۆمەڵگاش

دەگەیەنێ، چونکە وشەی (تزکية)[1] کە لە قورئاندا بەکارهاتوە، هەرچەندە زیاتر تایبەتە بەتاکەوە، بەڵام وێڕای ئەو چەمکە تاکییە، چەمکێکی گشتیی کۆمەڵایەتییشی هەیە و، ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین، زۆر جوان دیارە، کە بە داخەوە ئەم لایەنە لە تەزکیەی نەفس و لە تەصەووف دا، نادیدە گیراوە، واتە: ئەوە کە تەزکیە بوون، تایبەت نیە بە تاکەوە، بەڵکو کۆمەڵگاش دەگرێتەوە، با تەماشا بکەن:

١- لە سوورەتی (فاطر) ئایەتی (١٨)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾

واتە: بێگومان تۆ هەر ئەوانە دەترسێنی کە لە پەروەردگاریان دەترسێن بە پەنامەکیی و، نوێژیان بەرپا کردوە، هەر کەسێك خۆی پاك و چاك بکا، خۆ پاك و چاك کردنەکەی قازانجەکەی بۆ خۆیەتی و، سەرەنجام بۆ لای خوایە.

وەك دەبینین بەشێوەی کۆ باسی کردوون (الذين يخشون ربهم...).

٢- لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٢١)دا، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەشوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەسێك شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ، بێگومان شەیتان فەرمان دەکا بەشتی ناقۆلا و، بەکردەوە قسەی خراپ و، ئەگەر بەخششی خواو، بەزەیی

---

(١) وشەی (زکی) لەزمانی عەرەبییدا، سێ مانای هەن: (نما، صَلَح، طَهر)، واتە: گەشەی کرد، چاکبوو، پاك بوو، هەر سێ واتاکە دەگرێتەوە، کەواتە: تەزکیەی نەفس ئینسان وا بکات کە نەفسەکەی پاك بێ و گەشە بکاو چاك بێ. بڕوانە (المعجم الوسيط) ص:٣٩٦.

خوا لەسەر ئێوە نەبووایە، خوا هیچ کام لە ئێوەی پاك و چاك نەدەكرد، بەڵام خوا هەر کەسێك کە بیەوێ پاك و چاكی دەكا و، خوا بیسەری زانایە.

لێرەش دیسان، خوا (عزوجل) بە کۆ ڕووی لە مسوڵمانان کردوە، کەواتە: دەگونجێ کۆمەڵگایەك تەزکیە ببێ، پاك بێ و، چاك بێ و، گەشە بکا، هەروەك دەشگونجێ حاڵەتێکی پێچەوانەی ئەوەی هەبێ.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ:

أ- ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴾، لە زمانی عەرەبییدا (مَنْ) هەم بۆ تاك، هەم بۆ دووان، هەم بۆ کۆ بەکاردێ.

ب- هەروەها: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴾، هەم تاك دەگرێتەوە، هەم کۆمەڵگاش دەگرێتەوە.

مەبەستم ئەوەیە کە ئەرکی سەرشانی پسپۆڕان و شارەزایانی بواری تەزکیەیە کە: وەك چۆن خەم لە تاك تاك، دەخۆن خەم بخۆن لە کۆمەڵگاش.

ج- پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) یەکێ لە ئەرکەکانی تەزکیەکردنی کۆمەڵگایە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾ (الجمعه:٢).

واتە: (خوا) ئەوکەسەیە کە لەنێو نەشارەزایان دا لەخۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، ئایەتەکانی (خوا)یان بەسەردا دەخوێنێتەوە و تەزکیەیان دەکات.

بەڵێ: کۆمەڵگاش دەبێ خەمی لێ بخورێ، بۆیەش ئیسلام پێی خۆشە، مسوڵمانان دەستەڵاتیان هەبێ و، خاوەنی سایەو سێبەرو قەوارەی خۆیان بن، چونکە ئەوکاتە ئاسانتر کەشێك دەڕەخسێنن، کە نەفسەکان تێیدا گەشە بکەن، پاك بن، چاك بن، ئەگەرنا وەك شاعیرێکی عەرەب دەڵێ:

متى يبلغ البنيان يوماً تمامه ... إذا أنت تبنيه وغيرك يَهْدِمُ

واتە: ئەو بینایە کەی تەواو دەبێ، کە هەر تۆ دروستی بکەی و، غەیری تۆ بیڕووخێنێ؟!

بۆیە هەر لایەنێکی ئیسلامیی، هەر جموجۆڵێك، هەر کۆمەڵێك، هەر تەوژمێکی ئیسلامیی، خەم لە لایەنی کۆمەڵایەتیی نەخوات، خەم لە گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی نەخوات و، هەر خەریکی تاکەکان بێ، بزانن کە باش لە قورئان حاڵی نەبووە و، چاك ڕێبازی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) نەناسیوە.

**شەش:** وەك چۆن مەرج نیە هەر کەس ناوی بە (مُفَسِّر) و (مُحَدِّث) و (فقیه) نەڕۆیشتبێ، شارەزای تەفسیرو حەدیس و فیقه نەبێ، مەرجیش نیە هەر کەس ناوی بەئەهلی تەصەووف نەڕۆیشتبێ، پشك و بەشی لە تەزکیەی نەفسدا نەبێ، وەك پێشتریش باسمان کرد، کە بێگومان ئەوەش زۆر گرنگە، بەڵام زیاتر بۆ ئەهلی تەصەووف گرنگە، کە ڕەنگە هەندێکیان زۆر بەزەییان بە خەڵکی دیکەدا بێتەوە و، پێیان وابێ: هەرچی سەر بەو شێخەی وان نەبێ و، سەر بەو تەریقەتەی وان نەبێ، پشك و بەشی نیە لە تەزکیە بوونی نەفسدا! بێ خەبەر لەوە کە: {إنما العبرة بالمحتويات والمضامين، وليست بالأسماء والعناوين} واتە: عیبرەت بە نێوەڕۆك و کاکڵەکانە، نەك بە ناوونیشان و ڕواڵەتەکان.

**حەوت:** هیچ خاوەن ئینصافێك نکوولیی لەوە ناکا کە: پسپۆڕو سوارچاکانی مەیدانی تەزکیەو ئەخلاق، لە زۆر بواردا، خزمەتی گەورە گەورەیان بە ئیسلام و مسوڵمانان کردوە، بە تایبەت لەبواری بڵاوکردنەوەی ئیسلام و، پەروەردەکردنی مسوڵمانان و، پاکسازیی و چاکسازیی کۆمەڵگادا، بەڵکو لەبواری جەنگ و جیهادیش دا، بۆوێنە:

شێخ شامیلی نەقشبەندیی کاتی خۆی لە شیشان، شێخ عبدالقادری جەزائیریی و، زۆر لە گەورە پیاوانی دیکە، چ هی تازە، چ هی کۆن، بۆنموونە: لە پیاوانی گەورەی تەصەووف (شێخ سەعیدی پیران) و، (شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری) کە نەقشبەندیی بوون، ڕابەرایەتیی شۆڕش و ڕاپەڕینی گەورەیان کردوە، هەروەها شێخ مەحموودی حەفید، نەوەی کاك ئەحمەدی شێخ کە سەر بەطەریقەتی شێخ عبدالقادری گەیلانیی بوون، مەبەستم ئەوەیە کە پیاوانی ڕەسەنی پەروەردەکراو، لە قوتابخانەکانی تەزکیەو تەصەووفدا، لەزۆر بواردا دەوریان بینیوە و، خزمەتیان کردوە بەکۆمەڵگا، پێویستە چاکەکانیان وەك خۆیان ببینرێن و، نوقسانیی و کەم و کوڕییەکانیشیان وەك خۆیان ببینرێن.

## دووەم: تەوژمی سەلەفیی:

پێناسە:

وشەی (سَلَفْ) یانی: پێشین، خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ ۝٩٥﴾ المائدة، واتە: خوا لەوە بوردوە کە ڕابردوە.

(سَلَفَ) یانی: تێپەڕیوە، (سَلَفي) یانی: کەسێك کە بەدوای کەسێك دەکەوێ کە لە پێشدا بووە.

هەڵبەتە(سَلَفْ) چەمکێکی ڕێژەیی (نسبي) هەیە، جیلی پێش ئێمە بۆ ئێمە (سَلَف)ن، ئێمە بۆ دوای خۆمان دەبینە (سلف)، ئێمە بە نسبەت ئەوەی پێش خۆمان بە پاشین(خَلَفْ) ناودەبرێین، ئەوانەی پێش ئێمە بۆ ئەوانەی پێش خۆیان بە (خَلَفْ) ناوبراون، بەڵام بەزۆریی ئەو وشەیە کە بەکار دەهێندرێ، وەك زاراوەیەك، مەبەست پێی سێ جیلەکانە، ئەوانەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەیانەوە دەفەرموێ: {خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ، يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٣٢٤٠٧)، وأحمد برقم (٤١٣٠)، والبخاري برقم (٢٥٠٩)، ومسلم برقم (٢٥٣٣)، والترمذي برقم (٣٨٥٩) وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٢٣٦٢).

واتە: باشترین جیلەکان، باشترین سەدەکان، سەدەی منە، ئنجا ئەوەی دوای ئەوان، ئنجا ئەوەی دوای ئەوان، (أصحاب و تابعين و تابعي التابعين): (هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان)، مەبەست زیاتر پێی ئەوەیە وەك چەمکێکی باو.

دە (١٠) هەڵوەستە لەبەرانبەر تەوژمی سەلەفیی دا:

**یـــەك:** شوێنکەوتنی پێشینی چاك (إتباع السلف الصالح)، خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانەو، هیچ کەس بۆی نیە بەناو لەخۆنان و، بە دروشم بەرزکردنەوە، بۆ خۆی قۆرخی بکا، هەروەك چۆن بەناوی (صۆفیی) لەخۆنان هیچ کەس بۆی نیە(تەزکیەی نەفس) لەسەرخۆی تاپۆ بکات و خەڵکی دیکە لێ بێبەش بکات! ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە هەموومان بیزانین، بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە: ئەوانەی ناویان لە خۆیان ناوە (سەلەفیی) بیزانن، کە بەڕێز گیان! بەناوەکەت فریو مەخۆ، ئەگەر بەکردەوە بەدوای پێشینی چاك نەکەوی، بەناو لەخۆنان، هیچ بۆخۆت دەستەبەر ناکەی، نە بۆ دنیات نە بۆ قیامەتت!!

**دوو:** سەنگی مەحەك، شوێنکەوتنی کردەیی پێشینی چاکە، نەك ناوی (سەلەفیی) لەخۆنان، ئنجا هەر کەس کاکڵ و نێوەڕۆکی (شوێنکەوتنی پێشینی چاك)ی لەلابێ، ناو لەخۆ نەنان زیانی لێ نادات، هەروەها هەر کەسێك نێوەڕۆکی (شوێنکەوتنی پێشینی چاك)ی لەلا نەبێ، ناو لەخۆنان هیچ دادی نادات، کەئەوە زۆر ڕوونە، بەڵام وەرە تەماشا بکە! زۆر کەس هەر بەو ناو لەخۆ نانە (وەك دوایی باسی دەکەین)[1] نەك هەر ئیکتیفای کردوە، بەڵکو هەر زۆریش خۆی لێ بایی بووە و لە کەوڵی خۆی دەرچووە!!.

**ســێ:** مەبەست لە پێشینی چاك (السلف الصالح) بە پلەی یەکەم -وەك پێشتر باسمان کرد-: سێ سەدەکانی سەرەتای ئیسلامن، مەبەستیش لە شوێنکەوتنی پێشینی چاك، شوێنکەوتنی ڕێبازو میتۆد (منهج)ی مامەڵەکردنی ئەو پێشینە چاکەیە، لەگەڵ دین و ژیندا، نەك پێوە پابەند بوونی بۆچوون و فەتوایەکانیان، کە ئەوەش دیسان یەکێکە لەو وەهمە بێ بنەماو بڵاوانەی، کە زۆر لەوانەی کە ئەو ناوەیان لەخۆیان ناوە، گیرۆدەی بوون، نەك خەڵکێکی گەنج و کەم تەمەن، بەڵکو هی وایە ڕیشی تێدا سپی کردوە، ئێستاش لەوە حاڵی نەبووە، کە

---

(١) لە تەوەری دووەمیش دا لەو بارەوە دواوین.

شوێنکەوتنی پێشینی چاك، ئەوە نیە تۆ قسەکانی وان بێنی و وەك تووتیی (ببغاء) دووبارەیان بکەیەوە! چونکە ئەوان بۆ ڕۆژگاری خۆیان قسەیان کردوە، کە بەدڵنیاییی مەبەستم پێی ئەو شتانەن کە لە بواری گۆڕاوەکان (متغیرات) دان، ئەو بیرو بۆچوون و فەتوایانەی کە پەیوەستن بە عورف و عادەت و هەل و مەرج و ژینگەوە، کە زانایان دەڵێن: هەموو ئەو حوکم و فەتوایانەی، کە پەیوەستن بە وەختێ کات و شوێن و عادەت و نەریتەوە، هەرکات، کات و شوێن و کەسەکان گۆڕان، فەتواو حوکمەکانیش دەبێ بگۆڕێن، ئەگەرنا وەك (القرافي) گوتوویەتی: (ئەوە پێچەوانەی ئیجماعە و، نیشانەی تێ نەگەیشتنە لە دین)[1]

ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەوبارەوە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە هەر کام لە زانایان و پێشەوایان بگرە، خۆیان بەعەقڵ و تێگەیشتنی خۆیان هەوڵیان داوە لەقورئان و سوننەت تێبگەن و، هیچ کامیان لاسایی ئەوانەی پێش خۆی نەکردۆتەوە، هەرچەندە ڕێز و حورمەتی زۆریشیان لەیەکدی گرتوە، بۆوێنە: تەماشا بکەن! (شافعي) قوتابی (مالك) بووە و مامۆستای (أحمد) بووە، ئنجا (مالك) لەگەڵ (أبو حنيفة)دا هاوچەرخ بوون و، ئەو ڕۆژەی (أبو حنيفة) وەفاتی کردوە، ئەوساڵەش (شافعي) لە دایك بووە، لە ساڵی(١٥٠)ی کۆچیی دا، واتە:(شافعي) لەلایەکەوە مامۆستای (أحمد)ەو، لەلایەکەوە قوتابی (مالك)ە، (مالك) زانایەکی زۆر گەورەو موعتەبەر بووە، بەڵام (شافعي) کە تەماشای قورئان و سوننەت دەکات و لە شەریعەت ورد دەبێتەوە، ناتوانێ لە هەموو شتێکدا پابەند بێت بەوەی (مالك) گوتوویەتی، بەڵێ قوتابی (مالك)ە و زۆر ڕێزی لێ گرتوەو (مالك) خۆی پەروەردەی کردوە، بەڵام (شافعي) بۆخۆی قوتابخانەی سەربەخۆی فیقهی دادەنێ!

هەروەها (أحمد) قوتابی (شافعي) بووە و، گێڕراوەتەوە کە (شافعي) دەچێ بۆ میسر (أحمد) ئاوزینگی بۆ دەگرێ، -ئاوزینگ ئەوەیە کە پێیان تێ خستوە بۆ چوونە سەر پشتی وڵاخ- (عبدالله)ی کوڕی دەڵێ: بابە! ئەوە کێیە ئاوای

---

(١) إلإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام، وتصرّفات القاضي والإحكام، ص٣١٨ ، ٣١٩، پێشتر لە بەشی دووەمدا دەقی قسەکەیمان بە تەواویی هێنا.

بۆ دەکەی؟ (أحمد) دەڵێ: ڕۆڵە! ئەوە شافیعییەو وەك خۆر وایە بۆ وڵاتان، وەك لەش ساغیی وایە بۆ جەستەکان، بەڵام ئەحمەد ناچێ شافیعیی چی گوتوە، کت و مت ئەوە دووبارە بکاتەوە!!

پێشینی ئێمە ئاوا بوون، ئائەوانە پێشەوایەکانمانن[1]، ئەوانە شوێنکەوتووانی پێشینی چاکن، کە وەك تووتیی قسەی یەکدییان دووبارە نەکردۆتەوە، بەڵکو هەر کامیان قسەی کردوە بۆ ڕۆژگاری خۆی و، وەڵامی پرسیارەکانی سەردەمی خۆی داوەتەوە، ڕێزیشی گرتوە لەوەی پێشێ، بەڵام نەچووە بەشێوەی لاسایی کردنەوەی کوێرانە، هی پێشێ چی گوتوە، ئەوە دووبارە بکاتەوە!! چونکە ئەوە لادانە لە ڕێبازی پێشینی چاك، باکەسێك هەزار ناوی (سەلەفیی) لەخۆی بنێ، بەڵام ئەگەر هەرچوو مێژوو و کەلەپووری هەڵکۆڵی و گوتی: فلان شتە وا گوتراوە و لە فلان کتێبەدا وا هاتوە! باشە وا گوتراوە، بەڵام بۆ کاتی خۆی وا گوتراوە، ئەدی تۆ ئێستا چی دەڵێی؟ ئەگەر لە قورئان و سوننەت تێناگەی و توانات نیەو، شارەزاییت نیە، بڵێ: نازانم، بەڵام مەچۆ بەبیانووی شوێنکەوتنی سەلەفەوە، چی گوتراوە، دووبارەی بکەیەوە و پێشت وابێ: ئەوە وەڵامی ئیسلامە!!

بەڕاستیی زۆر خەفەت لەوە دەخۆم کە کەسێك دەبینم: هەر قسەی زانایان دووبارە دەکاتەوە و، قسەی کتێبان دووبارە دەکاتەوە! باشە دووبارەیان بکەوە، ڕێزو حورمەتمان بۆیان هەیە، بەڵام ئەو قسەیە، ئەو فەتوایە، هی زانایەکە، کە ئەوخۆی بیری کردۆتەوە و، قسەی ئەوانەی پێش خۆی دووبارە نەکردۆتەوە، ئەدی تۆ بۆچی هی وان دووبارە دەکەیەوە! ئەگەر تۆش شارەزای و بانگەشەی تێگەیشتن لە دین دەکەی؟!

بۆ وێنە: (إبن تیمیة) شوێنکەوتووی مەزهەبی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەو (مجموع الفتاوای)یەکەشی سی و پێنج (٣٥) بەرگە، - هەڵبەتە (مجموع فتاوی)ی بۆخۆی داینەناوە و، کۆ کراوەتەوە لەدوای خۆی-، هەروەها (منهاج

---

(١) خوا لە هەموویان خۆشبێ و لێیان ڕازی بێ و پلە و پایەیان بەرز و بەرزتر بکاتەوە.

السنة النبوية) و کتێبەکانی دیکەشی، باشە بۆچی (ابن تيمية) ئیکتیفای نەکرد بە فەتوایەکانی ئیمام ئەحمەد؟ چونکە تەماشای کردوە: دنیا گۆڕاوەو وەزعێکی دیکەیە، تەتەرو مەغۆل لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتوون و، خاچپەرست لە ڕۆژئاواوە و، دنیا گۆڕاوەو پرسیاری تازە پەیدا بوونەو، پێویستییان بە وەڵامی تازە هەیە!

ئنجا ئائەوە شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵحە، کەهەمان بەرنامەی ئەوان مامەڵەیان پێ لەگەڵ وەحیی و واقیعدا کردوە، تۆش وەك وان بکەی، نەك وەك وان بڵێی، بەڵکو ئەوان چۆن بەقووڵیی تەماشای قورئان و سوننەتیان کردوە و، بە عەقڵێکی ئازادەوە، تەماشای واقیعی خۆیانیان کردوە، تۆش وەك وان بکەی، نەك ئەوەی ئەوان گوتوویانە، دووبارەی بکەیەوە!

وەك نوکتەیەك بۆتان باس دەکەم: (إبن نباتة) هەبووە زانایەکی گەورەی میصریی بووە، کۆمەڵە وتارێکی هەن، بۆ هەموو جومعەکانی ساڵ (کە ساڵ (٤٨) جومعەی تێدایە)، ئەویش بۆ هەموو جومعەکان وتاری داناوە، بەپێی فەصڵەکانی ساڵ، دەڵێن: مامۆستایەك بۆ وتاردان لەسەر ئەو وتارانەی (إبن نباتة) دەڕۆیشت، گەیشتبوە وتارێکی، کە ئەو وتارەی کاتێ دابوو، کە لە میصر ڕووباری (نیل) لافاوی لێ هەڵساوە، ئنجا مامۆستایەکە وتارەکەی دەداو، دەماری لاملی هەڵسابوون، دەیگوت: مسوڵمانینە! هەمووی بەهۆی گوناهی ئێوەوەیە ڕووباری نیل هەڵساوە! ئنجا ئەو خەڵکەش سەری سوڕما بوو، ڕووباری نیلی چیی؟! مامۆستاش هەر دەیگوت: ئەوەتا لافاو هەڵساوەو دەبێ چاکە بکەن و، صەدەقە بکەن و، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا!

جەنابی مامۆستا! ئەوە چ پەیوەندیی هەیە، بەواقیعی ئەوخەڵکەوە کەتۆ وتارەکەتیان بۆدەدەی؟! ئنجا بڕواتان بێ، زۆر فەتوا بەناوی ئیسلامەوە دەدرێن و، زۆر قسە دووبارە دەکرێنەوە، بەناوی شوێنکەوتنی (سەلەفی صاڵح)ەوە، وەك خوێنەرەوەی وتارەکانی (إبن نباتة) وایە!

بەڵێ وەك گوتراوە: (لِكل مقام مقال) تۆ بزانە ئەو قسەیە بەکەڵکی ئەو شوێنە دێ! داخۆ ئەو فەتوایە پڕ بەپێستی ئەو واقیعەیە؟ لە سەلەفی صاڵح

کەس نەهاتوە لاسایی ئەوەی پێش خۆی بکاتەوە، بەڵکو تەماشای واقیعی خۆی کردوە و تەماشای قورئان و سوننەتی کردوە، ئنجا لەقورئان و سوننەت دا گەڕاوە: داخۆ ئەو پرسیارەی کە پەیدا بووە، چ وەڵامێك بەکەڵکی ئەو پرسیارە دێ، ئیدی تەماشای نەکردوە داخۆ: پێش ئەو چی گوتراوە؟ بەڵێ بیزانی باشە، بەڵام لاسایی بکەیەوەو دووبارەی بکەیەوە، وەك تووتیی، شتێکی زۆر خراپە.

**چـــوار:** وەك لە تەوەری دووەم، لە بەشی یەکەمیدا گوتمان و، ڕوونمان کردەوە: ناوی (سەلەفیی) لەخۆنان، نەك هەر پەسەند نیە، بەڵکو ناپەسەندیشە، هەڵبەتە من ناشڵێم: کەسێك هەر ناوی (سەلەفیی) بوو، گومڕایە و حاڵ و حیسابی وا! بەڵکو تەنیا دەڵێم: ئەو ناو لەخۆنانە، شتێکی پەسەند نیە، لەبەر ئەم پێنج هۆیانە:

١- ئەو ناوە خۆ پەسەندیی دەگەیەنێ، پێموایە: هیچ کەسێك نیە ناوی (سەلەفیی) لەسەر بێ و، جۆرێك لە خۆ پەسەندیی بەخۆوە نەبینێ! چونکە دەڵێ: من لە خەڵکی دیکە جیام و بەدوای سەلەفی صالح دەکەوم! ئنجا ئایا بەڕاستیی وای؟ ئەگەر وا بێ، ئەوە خۆ پەسندییەو مەدحی خۆ کردنە و حەڕامە، ئەگەر واش نەبێ، درۆیە! تەنیا ئەو دوو حاڵەیە، بەڵێ ئەوەی دەڵێ: من سەلەفییم یان ڕاست دەکا، یان درۆ دەکا، سەلەفییم، یانی: بەدوای سەلەفی صالح کەوتووم، ئنجا ئەگەر ڕاست بکات، ئەوە خۆپەسندییە، چونکە ئەگەر تەقوا لەخۆتدا شك بەری، عیبادەتێك، تاعەتێکی زیادە، چاکەیەك، نابێ باسی خۆت بکەی، ئەگەر باسی خۆت بکەی، ئەوە تەزکیەی نەفسە و، خۆ پێ چاك بوونیش خراپە، خوا فەرموویەتی:

﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ النجم.

واتە: پەسندی خۆتان مەکەن (خۆتان پێ باش نەبێ) ئەو (خوا) زاناترە کێ پارێزکارترە.

یانی: نابێ خۆت پێ چاك بێ، بەڵکو دەبێ خەڵك پێی چاك بێ، یانی: ئەگەر ڕاست بکەی کە دەڵێی: سەلەفییم واتە: بەدوای (سەلەفی صالح) دەکەوم، ئەوە عەیبە ئینسان باسی خۆی بکات، دەڵێن: کاتێ خۆی کابرایەك

هەبووە گوتوویەتی: ئەم کوردستانە دوو پیاوی تێدان: یەکێکیان مەلا مستەفایەو، ئەوی دیکەشیان، پیاو عەیبە باسی خۆی بکا، ئەوەی سەلەفییش هەر وای لێ دێ، دەڵێ: من سەلەفییم، یانی: بەدوای سەلەفی صاڵح کەوتووم؟ ئنجا (سەلەفیی ناو)ی بەڕێز! ئەگەر ڕاست بکەی، ئەوە عەیبە باسی خۆت بکەی و، ئەگەر درۆش بکەی، هەر نابێ بیڵێی!

هەروەك مەلەسەی بڕوادار (مؤمن): ئەگەر پێت گوترا: تۆ بڕواداری؟ (أنت مؤمن؟)، دەبێ بڵێی: ئەگەر خوا بیەوێ (إن شاء الله) چونکە نازانی لەلای خوا بە ئیماندار لە قەڵەم دراوی، یان نا؟ دەچیە بەهەشتێ، یان ناچی؟ بەڵام ئەگەر گوترا: ئایا تۆ مسوڵمانی؟ (أنت مسلم؟) ئەگەر بڵێی: بەڵێ، ئاساییە، چونکە مسوڵمان (مسلم) یانی: شایەتمانت هێناوە، نوێژت هەیەو، ڕۆژووت هەیەو، زەکات و حەجت هەیە، بەڵام بڕوادار (مؤمن) یانی: بەدڵنیایی خوالێی ڕازییە و دەچێتە بەهەشتێ! ئنجا خوای پەروەردگار (نفي) ئیمانی لە (أعراب) کردوە، بەڵام (إثبات)ی ئیسلامی بۆ کردوون:

﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا ﴾ (الحجرات: ١٤).

واتە: عەرەبە خێڵەکییەکان گوتیان: بڕوامان هێناوە، بڵێ: بڕواتان نەهێناوە، بەڵکو بڵێن: مسوڵمان بووین.

بەڵێ مرۆڤـ کە گوتی: ئیماندارم، مانای وایە دەچێتە بەهەشتێ و، ئەوەش دەکا لەخۆ ڕازیی بوون و خۆ پێ چاك بوون و، جۆرێك لە ئیددیعای زانینی پەنهان (غَیب)یش!

٢- ئەو ناوە هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی لەسەر نیە، جارێك لەگەڵ یەکێك لەوجۆرە کەسانە ئەوقسەیەم کرد، گوتی: با لە قورئاندا هەیە، گوتم لەکوێدا؟ گوتی: ئەوە نیە خوا دەفەرموێ:

﴿ ...فَلَهُۥ مَا سَلَفَ... ﴾ (البقرة: ٢٧٥).

گوتم: ئەوە دەربارەی ڕیبا خواردنێیە، یانی ئەو ڕیبایەی پێشی خواردووتانە، خوا عەفووی کردوون، ئەوە لە مەقامی مەدحدا نیە!!

٣- هیچ زاناو پێشەوایەکی موعتەبەرو متمانە پێکراوی ڕابردوو، ئە و ناوەی بەکار نەهێناوە، واتە: شتێکی پەیداکراو (مُحْدَث)، هەموو کتێبەکان تەماشا بکەن! بەڵێ زانایان گوتوویانە: ئێمە لەسەر ڕێبازی سەلەفی صاڵحین، بەڵام کەس نەیگوتوە: من سەلەفییم! من لە کتێب و فەتوایەکانی (ابن باز) و (محمد بن صالح العثیمین)دا بینیومە، گوتوویانە: چونکە ئەو ناوە زۆر کەس بەکاری دێنێ، کە شایستەی نیە، بەکارنەیەت چاکە.

٤- مایەی لێکدابڕینی مسوڵمانانیشە، چونکە ئەوکەسەی دەڵێ: سەلەفییم، ئەدی خەڵکی دیکە چییە؟ (سەلەفیی) ئەگەر کەسێك بێ کە بەدوای سەلەفی صاڵح دەکەوێ؟ بێگومان هەموومان بەدوای پێشینی چاك دەکەوین، بەڵام نابێ خۆمانی پێوە هەڵبکێشین، ئەگەرنا (إن شاء الله) دەبێ هەر لەسەر ڕێبازی پێشینی چاك بڕۆین.

٥- لەگەڵ فەرموودەی خوادا تێك دەگیرێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا﴾ (الحج: ٧٨).

واتە: خوا ناوی لە ئێوە ناوە مسوڵمان، لە پێشداو لەم قورئانەشدا.

خوا یەك ناوی بۆ ئێمە داناوە، بۆ کۆکردنەوەی ئەو خەڵکانەی بەدوای پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەکەون کە بریتیە لە مسوڵمانان (مسلمین).

**پێنــــج**: وەك چۆن تەزکیەبوونی نەفس و، ناوی سۆفیی و دەروێش و دێوانە لەخۆنان و، شوێن کەوتنی ڕێبازو قوتابخانەیەکی دیارییکراوی تەصەووف (ئەو دووانە) پێکەوە پەیوەست نین و، مەرج نیە هەرکەس نەفسی تەزکیە کراو بێ، ناوی صۆفیی یان دەروێش یان دێوانە، یان...هتد بی و، شوێنکەوتووی ڕێبازێکی تەصەووف بێ، بەهەمان شێوەش شوێنکەوتنی پێشینی چاك و، ناوی

سەلەفیی و وەهابیی و ...هتد لە خۆنانیش، پێکەوە پەیوەست نین، کەسانێك هەن، زۆر چاك پێش شوێن سەلەفی صالح دەکەون و، ئەو ناوەشیان لەسەر نیە، هەروەها دەبینین: کەسێك ناوێکی زۆر گەورەی لەخۆ ناوەو، نێوەڕۆکەکەشی لەلانیە.

**شەش:** لەم ڕۆژگارەدا گرووپ و دەستەکانی ژێر ناوونیشانی (سەلەفیی) زۆرو جۆراو جۆرن و، زۆریان دژ بەیەکن و، پێکەوە ناکۆکن، چەند جۆرە خەڵك هەیە لەم هەرێمەی خۆماندا، ناویان سەلەفییە؟ زۆرمان پێ شك دێن، کە هیچیان مەرحەبای یەکدی ناکەن و، هەر یەکەش لەئاوازێك دەخوێنێ، ئنجا لەسەر چییش؟ ئێستا تۆ بڵێی: من (کۆمەڵی ئیسلامیی)یم، دیارە تۆ بەرنامەو پەیڕەوێکت هەیە (یەکگرتوو) دیارە، هەرکامیان خاوەنی، ئەزموونێك و هەڵوێستێکی سیاسییە، بەڵام خەڵکی سەلەفیی لەسەرچی لەیەك جیان؟

پێم وایە زۆرێك لەوانەی کە ناوی (سەلەفیی) بەکاردەهێنن، لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەستیارییان زۆرە بە ئەهلی تەصەووف، خۆیان بێبەش کردوە لەو خەزێنەی پڕ گەوهەر و مرواریی عیرفان و تەزکیەی نەفس و، بۆ خوا صوڵحان و لەخوا نزیك بوونەوە.

ئنجا لە دەرەنجامی ئەو بێهێز و پێزییە مەعنەوییەدا: دەبینی: کابرا ناوێکی زلی لەسەرە، کەچی کەم و کوڕیی و عەیب و عاری زل زلی هەن! بەڵێ پێم وایە ئەو دووریی گرتن و خۆ بێبەش کردنە لە کەلەپووری تەزکیەی نەفس و، بەرهەمی عاریفان و بۆ خوا صوڵحاوان و بۆ خواسووتاوان، زۆر کاریگەریی نەرێنیی هەیە، کەسێك کە دینداریەکی سەرکێڵی هەیە و، ئایەت و حەدیسان بەبێ ڕووحیی دەخوێنێتەوە، کەمتر وایە بتوانێ بەرهەڵستیی ئارەزووان و شوبهان (شهوات و شبهات) بکات! ئنجا بۆیە ئەوانەی گوایە: پەروەردەشیان دەکەن، زۆر جار شوێن حیزبە سیکۆلاریست و دنیا ویستەکان دەکەون و، دەبنە هەموو شتێك، چونکە هیچ پارێزبەندیی (حصانة) و بەرگریی (مناعة)یان نیە!

ئنجا ئەو پێکەوە ناکۆك بوونەی سەلەفیی سیاسیی و ناسیاسیی، سەلەفیی جیهادیی و نا جیهادیی، حکوومیی و ناحکوومیی، سەلەفی مەدخەلیی و

جامیی و...هتد، ئەوە شتێکی زۆر خراپە و من زۆر پەرۆشی ئەو ناوەمە، کە بەوجۆرە بەدناو کراوە!

**حــەوت:** لەوەتەی جووڵانەوەی (محمد بن عبدالوهاب) سەری هەڵداوە، لەلای زۆر کەس وازانراوە کە ڕەوتی (شوێنکەوتنی پێشینی چاك) لەسەر ئەو جووڵانەوەیە کورت هەڵاتوە!! یان: (شوێنکەوتنی پێشینی چاك) تەنیا هەتا ڕۆژگاری: (ابن تیمیة) و (ابن القیم) دەچێ، یان ئەوپەڕی تاکو: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەچێ!! کە بە تەئکید ئەوە ڕاست نیە و، قسەو بۆچوونێکی عاتیفییانەو دەمارگیرانەیەو، بێ بەڵگەیە، چونکە (ابن تیمیة) و (ابن القیم) و ئەوانی دیکەش، هەتا دەگاتە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، هەموویان هەر بەدوای پێشینی چاك کەوتوون و، ئەو ڕێبازە لە پێش ئەواندا بووە، چونکە ئیمام ئەحمەد لە ساڵی (٢٦٤)ی کۆچییدا وەفاتی کردوە، یانی: دوای ئەوەی کە سێ سەدەکان (القرون الثلاثة) ڕابردوون، ئەگەر سنووری جیاکەرەوەی سێ سەدە بەچاك زانراوەکان (القرن الثلاثة المشهود لها بالخیر) ساڵی دووسەدو دە (٢١٠) ی کۆچیی[1] بێ، ئەوە (أحمد بن حنبل) پەنجاو چوار(٥٤) ساڵ دوای ئەوە وەفاتی کردوە، یانی: سەلەفی صاڵح، پەنجاو چوار ساڵ بووە ڕابردوون!

**هـەشــت:** چەند هەڵە و پەڵەیەکی (محمد بن عبدالوهاب):

جووڵانەوەکەی (محمد بن عبدالوهاب) وێڕای لایەنی باش و ئەرێنیی، لایەنی خراپ و نەرێنیشی تێدا بوون و، زیانێکی گەورەی لە ڕەوتی (شوێنکەوتنی پێشینی چاك)داوە، بەتایبەت لەڕووی بە کافر دانانی مسوڵمانان و ڕەواکردنی سەروماڵیانەوە، کە ئەوە شتێکی زەق و نکووڵیی لێ نەکراوە، لەژیانی خۆشیداو، لە هی پەیڕەوانیشیدا.

---

(١) کە ئەوە ڕای زۆربەی زانایانە، چونکە هەر جیل (قرن)ەی بە حەفتا (٧٠) ساڵ دانراوە و ٧٠+٧٠+٧٠=٢١٠ ساڵ.

لێرەدا چەند نەقڵێکم هێناون لە کتێبەکانی خۆی و بۆ زانیارییشتان! برایەکەی خۆی (سليمان بن عبدالوهاب)[1] لەسەر ئەو شتانە زۆر لەگەڵی ناکۆك بووە و، عالمێکی زۆر گەورەش بووە و دەڵێن: لەخۆی زاناتر بووە، بەڵام دەستەڵاتی نەبووە، چونکە (محمد بن عبدالوهاب) بەوە زیاتر دەرکەوتوە کە لەگەڵ (سعود بن عبدالعزيز) دا ڕێککەوت، باپیرە گەورەی بنەماڵەی مەملەکەتی عەرەبیی سعوودیی ئێستا.

ئەمەش چەند نموونەیەك، لەقسەو فەتوایە هەڵە و تێپەڕێنەرەکانی (محمد بن عبدالوهاب):

١- گوتوویەتی: {فإن أعداء الله لهم اعتراضات كثيرة على دين الرسل، يصدُّون بها الناس عنه، منها قولهم: نحن لا نُشرِك بالله، بل نشهد أنه لا يخلق ولا يرزق ولا ينفع ولا يضر إلا الله، وحده لا شريك له، وأن محمداً -عليه الصلاة السلام- لا يملك لنفسه نفعًا ولا ضرًا فضلاً عن عبد القادر أو غيره، ولكن أنا مذنب، والصالحون لهم جاهٌ عند الله، وأطلب من الله!

فجاوِبه بما تقدَّم وهو: إن الذين قاتلهم رسول الله -صلى الله عليه وسلم- مُقرّون بما ذكرتَ، ومُقِرّون أن أوثانهم لا تُدَبِّر شيئاً، وإنما أرادوا الجاه والشفاعة}[2].

واتە: دوژمنانی خوا زۆر قسەو ڕەخنەیان هەن کە خەڵکیان پێ لەڕێی خوا لادەدەن، یەکێ لەوانە ئەو قسەیانە کە دەڵێن: ئێمە هیچ شتێك ناکەینە هاوبەشی خوا، بەڵکو شایەدیی دەدەین کە هیچ کەس دروست ناکا و، ڕزق نادا و، زیان ناگەیەنێ و، سوود ناگەیەنێ، جگە لەخوا، بەتەنیا و بەبێ هاوەڵ، هەروەها موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هیچ شتێکی خۆی بەدەست نەبووە، نە قازانجی، نە زیانی، چ جای (عبدالقادر)و غەیری ئەویش (واتە: عەبدولقادری گەیلانیی)، بەڵام من گوناهبارم و، صاڵحەکان لەلای خوا پێگەو ڕوویێکیان هەیە، من بەهۆی ئەوانەوە داوا لەخوا دەکەم!

---

(١) کتێبێکی لەبەر پەرچدانەوەی برایەکەی دا نووسیوە، بە ناوونیشانی: (فصل الخطاب في الرد على محمد بن عبدالوهاب)، هەروەها بە ناوونیشانی (الصواعق الإلهية في الرد على الوهابية)شدا چاپ کراوە.

(٢) كشف الشبهات، ط١، ١٤١٤هـ ص٢٣.

تۆش وەڵامیان بدەوە و بڵێ: ئەوانەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جەنگی لەدژ کردن، دانیان بەو شتانەدا دەهێنا، کە تۆ دانیان پێدا دێنی، دانیان بەوەدا دەهێنا: کە بتەکانیان هیچ ڕۆڵێك نابینن، بەڵام ئەوانیش تەنیا پێگەو ڕووی بتەکان و تکاکردنیانیان دەویست!

کە بێگومان ئەوە تێپەڕاندنێکی زۆر گەورەی تێدایە، ئنجا سەیر ئەوەیە کە (محمد بن الوهاب) هەر بۆ خۆی لە فەتوایەکی دا دەڵێ: (داواکردنی شتێك بە پێگەی (جاە)ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، یان (توسُّل) بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خیلافی فیقهیی تێدایە و، عیلاقەی بە عەقیدەوە نیە)[١]، ئنجا مادام پەیوەندیی بە عەقیدەوە نیە تۆ چۆن هەر لەڕێوە بەو هەموو خەڵکە دەڵێی: (أعداء الله) دوژمنانی خوا!!

٢- هەروەها دەڵێ: {فإن قال: الكفارُ، يريدون منهم، وأنا أشهد أن الله هو النافع، الضار، المدبّر، لا أريدُ إلا منه، والصالحون ليس لهم من الأمر شيء، ولكن أقصدهم: أرجو من الله شفاعتهم.

فالجواب: إن هذا قول الكفار سواء بسواء}[٢].

واتە: [ئەوەی کە پێچەوانەتانە، کە زۆربەی ئەو خەڵکەی ئەوکاتی ئەو بەنەیاری داناون، مسوڵمانان بوون] ئەگەر گوتی: کافرەکان شت لە پەرستراوەکانیان داوا دەکەن، بەڵام من شایەدیی دەدەم کە بەس خوا سوود دەگەیەنێ و زیان دەگەیەنێ و کار هەڵسووڕێنەرە و، تەنیا شت لەخوا داوا دەکەم و، صاڵحەکان هیچیان بەدەست نیە، بەڵام بۆیە ڕوویان تێ دەکەم، بەڵکو شەفاعەتم لەلای خوا بۆ بکەن.

---

(١) بڕوانە: {مجموع مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب}، ج٢، ص ٤١، کە ئەمە دەقی قسەکانیەتی لەو بارەوە:
{... فكون بعضٍ يرخِّصُ بالتوسُّل بالصالحين، وبعضهم يَخُصَّهُ بالنبيّ (صلى الله عليه وسلم) -وأكثر العلماء يَنهى عن ذلك ويكرهُهُ- فهذه المسألة من مسائل الفقه، ولو كان الصَّواب عندنا: قول الجمهور: أنه مكروه فَلا نُنْكِرْ على مَن فَعَلَهُ ولا إنكار في مسائل الإجتهاد ...}.

(٢) كشف الشبهات، ص ٢٦.

تۆ بڵێ: ئەوە ڕێك قسەی کافرەکانە و لە گەڵی یەکسانە.

کە بێگومان ئەوەش بێ ویژدانیی و تێپەڕاندنێکی زۆری بەرانبەر بەخەڵکێکی زۆر لە مسوڵمانان، تێدایە، چونکە: من دەزانم ئەو ئایەتە موبارەکە دەفەرموێ:

﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ (الزمر:٣).

واتە: بتپەرستەکان گوتیان: تەنیا بۆ ئەوە دەیانپەرستین لە خوامان نزیك بخەنەوە.

بەڵام کافران کە گوتوویانە: {مَا نَعۡبُدُهُمۡ} ڕێك عیبادەتیان بۆ بتەکان کردوە، بەڵام هیچ مسوڵمانێك نەبووە ڕێك و ڕاست عیبادەت بکات بۆ یەکێ لەو بتانە! یانی: کافرەکان لەبتەکان پاڕانەوە، قوربانییان بۆ سەر بڕیون، بەڵام هەرگیز مسوڵمانان پەرستنیان بۆوان نەکردوە، ئەدی چۆن قسەی مسوڵمانێکی عەوام کە دەڵێ: خوایە! بۆ خاتری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لێم خۆشبە! یان بۆ خاتری عەبدولقادری گەیلانیی لێم خۆشبە! -کە من لەگەڵ ئەوەدا نیم و بەهەڵەی دەزانم- بەڵام ئەوە جیایە لەوەی کە بچێ ڕکووع و سەجدە بەرێ بۆ بت و صەنەم، چۆن دەبێ وەك یەکیان تەماشا بکەی؟

دوایی گوتوویەتی: وەك چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خوێنی وانی بۆ حەڵاڵ بووە، ئێوەش خوێنی ئەوانەتان بۆ حەڵاڵە! هەربۆیەش (محمد بن عبدالوهاب) خەڵکێکی زۆری کوشت لە (حیجاز) و شوێنانی دیکەش.

٣- هەروەها دەڵێ: {فإذا عرفت أن هذا الذي يُسَمِّيه المشركون في زماننا (الإعتقاد) هو الشرك الذي نزل فيه القرآن، وقاتَلَ رسولُ الله -صلى الله عليه وسلم- الناس عليه، فاعلم! أن شرك الأولين أَخَفُّ من شرك أهل زماننا بأمرين:}[١].

واتە: ئنجا زانیت ئەوەی کە هاوبەشدانەرەکان لەم ڕۆژگارەمان دا پێی دەڵێن: (إعتقاد) [یانی: متمانەبوون بەوکەسەی چاوەڕوانییان لێی هەیە] ئەو

---

(١) هەمان سەرچاوە ص ٣٩.

شیرکەیە کە قورئانی لەبارەوە دابەزیوە و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەری دژی خەڵك جەنگاوە، بزانە! کە شیرکی پێشووان لە دوو ڕووەوە لە شیرکی خەڵکی ڕۆژگاری ئێمە سووکتر بووە...

کەواتە: (إبن عبدالوهاب) ئەو مسوڵمانە سادەو بێ ئاگایانەی بە نەزانیی تووشی هەندێك جۆری شیرکی گچکەو گەورەبوون، لە کافرو موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بەخراپتر زانیون!!

٤- هەروەها دەڵێ: {فهؤلاء الذين صرَّح الله فيهم أنهم كفروا بعد إيمانهم، وهم مع رسول الله -صلى الله عليه وسلم- في غزوة تبوك، قالوا كلمة ذكروا أنهم قالوها على وجه المزح، فتأمل هذه الشبهة وهي قولهم: تُكَفِّرون من المسلمين أناساً يشهدون أن (لا إله إلا الله) ويُصَلُّون ويصومون، ثم تأمَّلْ جوابَها، فإنه من أنفع ما في هذه الأوراق}[١].

واتە: ئەوانەی کە لەجەنگی تەبووك لەخزمەت پێغەمبەری خوا دابوون، وشەیەکیان بەسوعبەت و گاڵتە گوت، کەچی خوا بەڕاشکاویی فەرمووی: پاش ئیمانیان کافر بوونە! ئەوە وەڵامی ئەوشوبهەیانە کەدەڵێن: چۆن مسوڵمانانێك بەکافر دادەنێن، کە شایەدیی دەدەن: جگە لەخوا هیچ پەرستراوێك نیە و، نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن؟!

ئنجا تۆ لەوەڵامەکەیەوە ڕامێنە! ئەوەش لەبەسوودترینی ئەو قسانەیە کە لەو پەڕانەدان.

هەڵبەتە زێدە ڕۆیی و بێ ویژدانییەك کە لەم قسانەی (محمد بن عبدالوهاب) دایە، زۆر ڕوونە، چونکە: بە لە مونافیقان خراپتر دانانی مسوڵمانێکی نوێژکەر و ڕۆژوو گر و خاوەن ئیمان، شتێکی زۆر بێ جێیە!

٥-موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب (فخرالدين الرازي) خاوەنی: (التفسيرالكبير) بەکافر داناوە و لەڕیزی ئۆممەتی بردۆتە دەرێ[٢]!!

---

(١) هەمان سەرچاوە ص ٥٢.

(٢) الدرر السنية في الأجوبة النجدية، ط٦، ١٤١٧هـ ج١٠ ص ٧٢، ١٧٣.

٦- هەروەها خەڵكی شامی هەموو تەكفیر كردوە، گوایە: هەموویان (إبن عربي) دەپەرستن[(١)].

٧- هەر كەسێك (ابن عربي) پێ كافر نەبێ، ئەویشی بە كافر داناوە[(٢)]، كە چی (ابن تيمية) كە باسی (ابن عربي) كردوە، گوتوویەتی: ئەو قسەیەی كوفرە و، ئەو قسەیەی شیركە، بەڵام قسەی زۆر باشیشی هەن و هەر خواش دەزانێ لەسەر چی مردوە؟! یانی لێیان پەشێمان بۆتەوە، یان نا[(٣)]؟!

٨- بۆ تێكڕای زانایانی (علم الكلام)یش گوتوویەتی: ئیجماعی لەسەرە كە هەموویان كافرن[(٤)]، یانی: بە ئەبو حەسەنی ئەشعەریی و ئەبو مەنصووڕی ماتوریدییشەوە!!

٩- سەرجەم شیعەی دوازدە ئیمامیی (الشيعة الإمامية الإثناعشرية)ی بەكافر داناون.

١٠-هەروەها هەركەسێكیش شیعەی ئیمامیی پێ كافر نەبێ، ئەویشی بە كافر داناوە[(٥)]!!.

كەچی (ابن تيمية) بەكافریان دانانێ، بەڵكو لە ڕیزی حەفتاو سێ (٧٣) كۆمەڵەكەدا حیسابیان دەكات كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر لە بازنەی ئۆممەتدا ئەژماری كردوون، وەك لە تەوەری دووەمدا - كتێبی دووەم دا - قسەكانیمان هێنان.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ج٢ ص٤٥.

(٢) هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٤٥، ج١٠ ص٢٥

(٣) بڕوانە: مجموع الفتاوى، ج٤ ص ١٧، كە ئەمە دەقی قسەكانیەتی: {إنَّ مقولة (ابن عربي) صاحب (فصوص الحكم) مع كونها كفراً، فهو أقربهم إلى الإسلام لما يوجد في كلامه من الكلام الجيد كثيرٌ.. والله أعلم بما مات عليه}.

هەروەها لە: (مجموع الرسائل والمسائل) ص ٢٢٤دا گوتوویەتی: {لكن ابن عربي أقربهم إلى الإسلام وأحسن كلاماً في مواضع كثيرة}.

(٤) هەمان سەرچاوە ج١ ص ٥٣.

(٥) هەمان سەرچاوە ج١٠ ص٣٦٩.

**١١-** هەر کەسێك کۆچیی نەکردبێ بۆ ئەو شوێنەی کە پێی گوتراوە: وڵاتی تەوحید (بلد التوحيد) کە لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا بووە، بە کافری داناوە[1].

**١٢-** گوتوویەتی: {مَنْ بَلَغْتُه دعوتُنا للحق، وَوَضَحتْ له المحجَّةُ، وقامَتْ عليه الحجَّةُ، وأصرَّ مستكبراً معانداً}[2].

هەر کەسێك بانگەوازیی ئێمەی پێ بگات و، بۆی ڕوون بێتەوە و، بەڵگەی لەسەر تەواو بکرێ، بەڵام سەرکەشانە هەر بەردەوام بێ و، لەگەڵ ئێمەدا نەبێ، ئەوجۆرەکەشی بە کافر داناوە!!

**١٣-** کاتێك جوڵانەوەکەی دوای خۆی شاری مەککەی گرتوە، زاناکانیان هەموو کۆکردۆتەوەو شتێکیان پێ نووسیون (دیارە بە زۆر پێیان نووسیون) کە ئەمە دەقەکەیەتی: {نشهد: نحن علماء مكة، الواضعون خُطوطَنا، وأختامَنا في هذا الرقيم: أن هذا الدين، الذي قام به الشيخ: محمد بن عبد الوهاب، رحمه الله تعالى، ودعا إليه إمامُ المسلمين: سعودُ بن عبد العزيز، من توحيد الله، ونفي الشرك، الذي ذكره في هذا الكتاب، أنه هو الحق، الذي لا شك فيه، ولا ريب، وأن: ما وقع في مكة، والمدينة، سابقاً، ومصر، والشام، وغيرهما، من البلاد، إلى الآن، من أنواع الشرك، المذكورة في هذا الكتاب، أنه: الكفر المبيح للدم، والمال، والموجِبُ للخلود في النار، ومن لم يدخل في هذا الدين، ويعمل به، ويوالي أهله، ويعادي أعداءه، فهو عندنا كافر بالله، واليوم الآخر، وواجب على إمام المسلمين (سعود بن عبدالعزيز)، والمسلمين، جهادُهُ وقتالُهُ، حتى يتوب إلى الله مما هو عليه، ويعمل بهذا الدين}[3].

واتە: ئێمە زانایانی مەککە کە ئیمزا و مۆرەکانی خۆمانمان لەسەر ئەم کاغەزە داناوە، شایەدیی دەدەین کە: ئەم ئایینەی شێخ (محمد بن عبدالوهاب) خوا لێی خۆشبێ، پێی هەڵساوە و، پێشەوای مسوڵمانان (سعود بن عبدالعزيز) بانگەوازی بۆ کردوە، لە خوا بەیەکگرتن و لابردنی شیرك، کەلەم نووسینەدا باسیکردوە، ئەوهەقەیە

---

(١) هەمان سەرچاوە ج١٠ ص٣٦٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ج١ ص٢٣٤.

(٣) هەمان سەرچاوە، ج١ ص٣١٤

کە هیچ گومان و دوودڵیی تێدا نیە، هەروەها ئەوەی کەپێشتر لەشارەکانی مەککە و مەدینە و، وڵاتی میصر و شام و وڵاتانی دیکەدا هەبووە لەجۆرەکانی شیرك کە لەم نووسینەدا باسکراون، تاکو ئێستا لەوجۆرە شیرکە بووە کە خوێن و ماڵ حەڵاڵ دەکات و، هۆکاری هەمیشەیی مانەوەیە لەئاگری دۆزەخ دا.

ئنجا هەرکەسێك نەیەتە نێو ئەم ئایینەوە و کاری پێ نەکات و، پشتی دۆستەکانی نەگرێ و، دژایەتیی ناحەزانی نەکات، ئەوە لەلای ئێمە: بێبڕوایە بەخوا و بەڕۆژی دوایی و لەسەر ئیمامی مسوڵمانان (سعود بن عبدالعزیز) و مسوڵمانان فەرزە، لەدژی بجەنگن، تاکو دەگەڕێتەوە لای خوا و واز لەوە دێنێ کەلەسەریەتی و، کار بەم ئایینە دەکات.

لێرەش دا تەنیا ئەوەندە دەڵێین:

١/ وادیارە (محمد بن عبدالوهاب) ڕێچکە و تاقمەکەی خۆی و (سعود بن عبدالعزیز)ی بە ئایینێکی سەربەخۆ داناوە!!

٢/ وادیارە هەرچی زانایانی دیکە لەسەری بوون، لە حیجاز و میصر و شام و... هتد، بەکوفر و شیرکی داناوە!!

٣/ هەر کەسێك نەهاتبێتە ژێر ڕکێفی و سەر ڕێچکەکەی، سەرو ماڵی بە حەڵاڵ داناوەو، لەسەر مسوڵمانانی بە فەرز زانیوە لە دژی بجەنگن!

١٤- هەروەها زانایانی شاری مەدینەشی کۆ کردۆتەوەو، بەهەمان شێوە ئەو نامەیەی بەوانیش واژۆ کردوە![1].

١٥- هەروەها (محمد بن عبدالوهاب) دەوڵەتی عوسمانیی بە سوڵتانەوە و بە هەرچی لەژێر ڕکێفی دابووە، هەمووی بەکافر داناوە و گوتوویەتی: بەس ئێمە مسوڵمانین! بۆیەش دوایی - ئەو کاتەی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب نەماوە - سوڵتانی عوسمانیی فەرمانی کردوە بە (محمد علي باشا) و هێرشێکی کردوە بۆ سەر حیجازو دەوڵەتەکەی ئالی سعوودی تێکوپێك داوە.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ج١ ص٣١٦، ٣١٧.

شایانی باسیشە لە ئەنجامی ئەو جۆرە تێگەیشتنە تێپەڕێنەرانەیەی (محمد بن عبدالوهاب)دا (محمد بن عبدالوهاب) و (سعود بن عبدالعزیز) کوشتارێکی زۆریان لەو مسوڵمانانە کردوە، کە بە (مشرك) و (کافر)یان داناون و، سەرەنجام کارەکەیان سەری بەوە گەیشتوە کە:

هەر کەس لەگەڵیان بووبێ و هاتبێتە ژێر ڕکێفیان و بۆیان ملکەچ بووبێ، ئەوە بە ئەهلی ئیمان و تەوحیدیان داناوە، ئەگەرنا بە موشریك و کافر یان داناوەو -سەرو ماڵیشیان- حەڵاڵ کردوەو، هەر کەس دەیەوێ بە تەفصیل لەو بارەوە ئاگادار بێ، با سەرنجی ئەم دوو کتێبە بدات کە نووسەرەکانیان لایەنگری سەرسەختی جووڵانەوەکەی (ابن عبدالوهاب و سعود بن عبدالعزیز) بوون:

١- (عنوان المَجْد في تأريخ نجد) عثمان بن عبدالله بن البشر.

٢- (تأريخ نجد) الشيخ حسين بن غنام.

بە پێویستیشی دەزانم کۆتایی ئەم باسە، بە ئامۆژگارییەکی مامۆستایەکی (محمد بن عبدالوهاب) بێنم کە لە بارەی بە کافردانانی مسوڵمانانەوە، ئاڕاستەی کردووە: ئەویش (أحمد بن زيني دحلان)ە، دەڵێ:

[فإنْ سمعت من شخصٍ أنه يعتقدُ تأثير ذلك المُسْتَغاث به من دون الله، فَعَرِّفْه الصواب وأَبِنْ لَه الأدلة على أنه لا تأثير لغير الله، فإن أبى فَكَفِّرْهُ حينئذٍ بخصوصه، ولا سبيل لك إلى تكفير السواد الأعظم من المسلمين، فنسبة الكفر إلى مَنْ شَذَّ عن السَّواد الأعظم: أقربُ، لأنَّهُ اتَّبع غير سبيل المؤمنين: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾ (النساء:١١٥)][1].

واتە: هەر کات لە کەسێکت بیست کە بڕوای وابوو: ئەو هاوار بۆ کراوە، بەبێ خوا کاریگەریی هەیە، ڕاستیی پێ بناسێنەو بەڵگەکانی ئەوەی بۆ بخەڕوو کە جگە لە خوا (هیچ کەس) کاریگەریی نیە، ئنجا ئەگەر هەر ملی نەدا،

---

(١) فتنة الوهابية، ص ٥ و ٨، إستانبول، مطبعة حسين حلمي/١٩٧٨م.

ئەو کاتە خۆی بەتایبەت بە کافر دابنێ، بەڵام بۆت نیە جەماوەری مسوڵمانان کافر بکەی، بەڵکو کوفر پاڵدانە لای کەسێك کە لە جەماوەری مسوڵمانان دابڕاوە، نزیکترە، چونکە کەوتۆتە دوای ڕێبازی غەیری مسوڵمانان: {هەر کەس سەرپێچیی پێغەمبەر بکات، دوای ئەوەی ڕێی ڕاستی زانیوەو شوێن ڕێبازی جگە لە بڕواداران بکەوێ، ئەوەی حەواڵەی خۆی دەکەین و دەیخەینە دۆزەخەوەو خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە}.

هەڵبەتە لەگەڵ توندییەکەی (زین دحلان)یش دانیم، بەرانبەر بە (إبن عبدالوهاب) و وەك ئەوەی (إبن عبدالوهاب) و پەڕگیریی لە هەر لایەکەوە بێ، خراپە.

**نـــــۆ:** حەوت ڕەخنە لەسەر زۆربەی (سەلەفیی ناو)ەکانی[1] ئەم ڕۆژگارە:

١- دژی تەوژمی ئیسلامیی بوون و، کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان، بە ناڕەوا دانان:

کە لە واقیع دا بۆ خۆشیان هەر کۆمەڵ و گرووپ و ڕێکخراوی جۆراو جۆریان هەن، گوێم لێ بووە پیاوی ناوداریان کە لەبارەی: ڕەوایی (شرعیة)ی هەبوونی ڕێکخراو و کۆمەڵی سیاسییەوە لێیان پرسیوە گوتوویەتی: حیزبی عەلمانیی ئەگەر خەڵك لێی کۆ بێتەوە، ئیشکالی نیە، بەڵام بەنسبەت حیزبی ئیسلامییەوە، گوتوویەتی: دروست نیە و حەڕامە!! ئیدی من نازانم ئەوە لەکوێ هاتوەو چۆنە؟ دروستە مسوڵمان لەسەر کوفر و لەسەر غەیری ئیسلام کۆ ببنەوە، بەڵام دروست نیە لەسەر ئیسلام کۆببنەوە!!

٢- سەر بەڕژێم و حیزبە سیکۆلاریزم و دژ بە ئیسلام بووەکان:

زۆرێك لەوانەی هەڵگری ئەو ناونیشانەن، سەر بەڕژێمە دیکتاتۆر و خۆسەپێنەکان و سەر بە حیزبە سیکۆلاریستەکانن و، هەر چاوێك بە گۆڕەپانی سیاسی دا بگێڕێ، چ لەسەر ئاستی عێراق و هەرێم و چ فراوانتر، ئەو دیاردەیە زۆر زەقە.

---

(١) سەلەفیی ناو: یانی ئەوانەی ناویان لەخۆیان ناوە: سەلەفیی، کە ئەمە جیاوازە لەتەعبیری (بەناو سەلەفیی)، چونکە من خودی ناو لەخۆنانەکەیانم پێ هەڵەیە.

٣- بچووککردنەوەی ئیسلام لە مەزهەبی (حەنبەلیی)دا:

هەندێ گەنج دەبینن: دەست بەسەر سینگەوە نان و، پەنجە جوولآندن و، دەلینگ هەڵپێچان و...هتدیان کردۆتە نیشانەی شوێنکەوتنی سەلەفی صالح!! بێ خەبەر لەوە کە ئەومەسەلانە وردە بابەتی فیقهیین و ڕاجیایی زۆریان تێدایە و، ئەو ڕایانەش زیاتر هی (أحمد بن حنبل) و مەزهەبی حەنبەلیین کە شوێنکەوتووانی ئەبو حەنیفە سەد هێندەی شوێنکەوتووانی (أحمد بن حنبل)ن و، مەزهەبی حەنبەلیی بەس لە حیجاز هەیە، بەڵام زۆربەی مسوڵمانان لەسەر مەزهەبی حەنەفیین، یان مالیکیین، ئەوانی دیکەش شافیعیین و، شیعەن، ئنجا مەزهەبی حەنبەلیی لەسەر ئاستی ئۆممەت، کەمترین شوێنکەوتووانی هەن!

٤- دەمارگیریی کوێرانە بۆ ڕاو مەزهەبی خۆ:

هەندێ ڕای فیقهیی هەیە، مرۆڤ دەتوانێ بڵێ: من ڕای خۆم پێ ڕاستەو هی بەرامبەرەکەم پێ هەڵەیە، بەڵام دەشگونجێ هی بەرامبەرەکەم ڕاست بێ و، هی من هەڵەبێ، بەڵام کەسێك بڵێ: هی من ڕاستەو ناشگونجێ هەڵە بێ و، هی بەرامبەرەکەشم هەڵەیەو، ناشگونجێ ڕاست بێ!! ئەوە دەمارگیرییەکی بێ تامە و، پێچەوانەی عەقڵ و شەرعە، کە زۆربەی سەلەفیی ناوەکان ئەوحاڵەتەیان هەیە.

٥- داخراویی و وشکیی و نەگونجاویی لەگەڵ مسوڵماناندا و، نەرمکێشان بۆ خەڵکی دیکە:

نەرم کێشان بۆ خەڵکی دیکە و سەخت و ڕەق بوون لەگەڵ مسوڵمانان دا، ڕەخنەیەکی دیکەی جیددییە کە لەژمارەیەکی زۆری (سەلەفیی ناو)ەکان دەگیرێ، لەحاڵێکدا خوا دەفەرموێ:

﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ ﴿٢٩﴾﴾ الفتح،

هەروەها دەفەرموێ: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾﴾ المائدة.

زۆر كەسم بینیوە لەوانە لەسەر مسوڵمانان زۆر زبرو توندە، كەچی لەبەرامبەری خەڵكی دیكەدا، زۆر نەرم و نۆڵە! بەڕێز! حیسابەكەت لێ تێك چووە، تەماشا بكە! قورئان بەجۆرێكی دیكە دەفەرموێ!

٦- لاسایی كردنەوەی كوێرانەی پێشینان:

زۆربەی (سەلەفیی ناو)ەكان، لەبەر ئەوەی نەشارەزان لە قورئان و سوننەت و، ناتوانن تەماشای قورئان و سوننەت بكەن، هەر كتێبان دەخوێننەوەو دەڵێن: ئەو زانایە وای گوت و، ئەو كتێبە وای گوت، ئاخر بەڕێز! ئەو فەتوایە بۆ كات و جێیەك دیكە دراوە و، بۆ ئێستا بە كەڵك نایەت و وەڵامی ئەو پرسیارەی ئێستای پێ نادرێتەوە!

٧- فراوانكردنی چەمكی بیدعەت، تاكو هەر شتێكی تازەو نوێ بگرێتەوە:

مامۆستا مەلا موحەممەدی جەلیزادە، كە زۆر دژی سۆفییگەریی ناشەرعیی و شێخێی ساختە و ئەفسانە و بیدعەت بووە، لەتەفسیرەكەی دا دەڵێ: جەماعەتی حیجاز، شوێنكەوتووەكانی موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب، هەرچەندە شتی باشیان هەیە، بەڵام بێ قەزا بن! هەر لە كەوڵی خۆتدا بجوڵێیەوە دەڵێن: بیدعەتە و، هەموو شتیان لە خەڵكی كردۆتە بیدعەت!

كە ئەوە ڕاستە و كاتی خۆی هێڵی شەمەندەفەر براوە بۆ حیجاز، كتێبیان لەسەر داناوەو گوتوویانە: بیدعەتە، هەروەها وێنەگرتن و، گەلێك شتی دی كە كە تازە پەیدا بووە، گوتوویانە: بیدعەت و ناشەرعییەو، كتێب و نامیلكەی زۆریان لەبارەوە نووسیون و ئێستاش هەر دەنووسن، بێگومان حكومڕانانیش زۆریان پێخۆشە: مسوڵمانان بەو وردە مەسەلانەوە سەرقاڵ بكرێن و، ئاگایان لەدنیا و دین نەبێ!

**دەیەم:** ڕەوتی {سەلەفیی ناو} وەك سەرجەم ڕەوتەکانی دیکە، لە چەند لایەکەوە سوودی بە مسوڵمانان گەیاندوە:

١- لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، کە خەڵك دوور بێ لە شیرك و لە لەغەیری خوا پاڕانەوە.

٢- لە ڕووی خزمەت کردنی سوننەتەوە، لێکۆڵینەوە لە دەقەکانی سوننەت و ساغ کردنەوەیان.

٣- لە ڕووی بژارکردنی دینداریی مسوڵمانان لە هەڵەو لادان، بە تایبەتیی شیرك و بیدعەت.

٤- لەڕووی پێگەیاندنی جیلێك لە گەنج و لاوی خواپەرست و دیندار، هەرچەندە زۆر جار بەشێوەیەکی لار و سەقەت پەروەردە دەکرێن و، خۆشیان و دەوروبەریشیان، گرفتار دەبن!

٥- لەڕووی پاراستنی مسوڵمانان لە کەوتنە ژێر کاریگەریی ڕێچکەو بیردۆزە ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژئاواییەکانەوە.

بەڵێ ڕەوتی (سەلەفیی ناو) بەگشتی ئەو سوودانەشی هەبوون، بەڵام:

**یەکەم:** بێگومان لەو مەیدانەدا هەر خۆیان نەبوون، بەڵکو ئەو کارانە هی سەرجەم مسوڵمانان و دڵسۆزان و، مشورخۆران بوون، بە هەموو مەشرەبەکانیانەوە و، هیچ کەس بۆی نیە بڵێ: ئەوبەرهەمە تەنیا هی من بووە.

**دووەم:** گەلێك جار ئەوانەی کە ناوی سەلەفییان لەسەرە، لەو بوارانەشدا دووچاری تێپەڕاندن و بەزایەدان بوون.

خوای پەروەردگاریش زیاتر هیدایەتی هەموو لایەکمان بدات و، ڕاستە شەقامەکەی خۆیمان لێ حاڵی بکا و، یارمەتیشمان بدات پێوەی پابەند بین و، خۆ پەسند نەبین و، خەڵکمان پێ کەم نەبێ و، خۆمان پێ زۆر نەبێ، وەك ئایەتەکە دەفەرموێ:

﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ فصلت.

واتە: قسەی کێ لەهی کەسێك چاکترە، کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات و، کردەوەی باشیش دەکاو دەڵێ: من لە مسوڵمانانم.

ئەگەر بگوترێ: ئەدی بۆچی دەڵێی: من کۆمەڵی ئیسلامییم؟ دەڵێین: کۆمەڵی ئیسلامیی نەیگوتوە: شوێنکەوتنی سەلەفی صالح، یان شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت، یاخود دینداریی، یان بۆخوا صوڵحان، لەسەر من تاپۆ کراوە، بەڵام ناوی (سەلەفیی) ئەوە دەگەیەنێ، ئەگەرنا بەڵێ: (کۆمەڵی ئیسلامیی) ناوو نیشانێکە کۆمەڵێك لە مسوڵمانان بۆخۆیان بەکاریان هێناوە، هەروەها هەرناوێکی دیکە لەو ناوونیشانە ئیسلامییانەی کە هەن، ناوو نیشانێکە، کۆمەڵە مسوڵمانێك لەژێر ئەو ناوونیشانەدا کۆبۆتەوە، بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ واقیعی دەرەکیی دا، ئنجا با ئەوانیش وابکەن، وەك چۆن حیزبی (نووری سەلەفیی) لە میصر وایان کرد، کە دوایی خەڵك بۆی دەرکەوت کە ئەو سەلەفییەتە بایی چەندە؟ کە لەگەڵ سەرۆکی (أقباط) و شێخی ئەزهەر، سێکوچکەیەکیان پێکهێنا، دژی ئەو مسوڵمانە مەزڵوومانەی کە خەڵك ڕەوایەتیی پێدابوون و هەڵیبژاردبوون، دوایی دکتۆر موحەممەد مورسییان برد بۆ زیندان و (عبدالفتاح السیسي)یان کردە سەرۆك و، برای سەلەفییش لەوێ دانیشتبوو!!

پەندێکی عەرەبییە دەڵێ: (عند الإمتحان يُكرم المَرء أَو يُهان)، لەکاتی تاقیکردنەوەدا، مرۆڤ ڕێزدار دەبێ یان ڕیسوا! کاتێك کۆمەڵێك دەکەونە نێو چوارچێوەیەکی سیاسیی، ئەو کاتە لەهەڵوێستە سیاسییەکانیدا دەردەکەوێ کە چی پێیەو بایی چەندە؟ بەڵام وەك شەخس، ڕەنگە نەناسرێ، بیستوومە: هەندێك لەوانەی کە دەڵێن: سەلام و کەلام لەگەڵ فلان و فیساری ئیسلامیی دا دروست نیە و، ئەوە بیدعەتەو، ئەوە چییەو چییە!! بیستوومە پەیوەندیی ژێر بەژێریان هەیە لەگەڵ هەندێك لەو بەرپرسانەی حیزبە عەلمانییە گەندەڵەکان، بینیویانن و، ڕەنگە کەم و زۆر هاوکارییش بکرێن!!.

## سێیەم: کۆمەڵی تەبلیغ:

خوا پشتیوان بێ هەوڵدەدەین لەحەوت خاڵان دا، تیشك بخەینە سەر: کۆمەڵی گەیاندن (جماعة التبليغ):

١- پێناسە.
٢- دامەزرێنەری ئەم ڕەوتە.
٣- چەند کەسایەتییەك لە هاوەڵە نزیکەکانی کاندەهلەویی.
٤- بنەماکانی کاری کۆمەڵی تەبلیغ.
٥- شێوازی کۆمەڵی تەبلیغ.
٦- چەند تێبینیی و ڕەخنەیەك لەسەر کۆمەڵی تەبلیغ.
٧- شوێنی بوونی کۆمەڵی تەبلیغ.

### ١- پێناسە:

{جماعة التبليغ: جماعة إسلامية أقرب ما تكون إلى جماعة وعظ وإرشاد منها إلى جماعة منظمة، تقوم دعوتها على تبليغ فضائل الإسلام، لكل من تستطيع الوصول إليه، ملزِمةً أتباعها بأن يقتطع كل واحد منهم جزءً من وقته لتبليغ الدعوة ونشرها، بعيداً عن التشكيلات الحزبية والقضايا السياسية، ويلجأ أعضاؤها إلى الخروج للدعوة ومخالطة المسلمين في مساجدهم، ودُورهم، ومتاجرهم، ونواديهم، وإلقاء المواعظ والدروس، والترغيب في الخروج معهم للدعوة، وينصحون بعدم الدخول في جدل مع المسلمين أو خصومات مع الحكومات}[1].

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، ج١، ص ٣١٧ - ٣٢٣.

واتە: کۆمەڵی تەبلیغ، کۆمەڵێکی ئیسلامیین، بەڵام زیاتر لە کۆمەڵێك کە سەرگەرمی ئامۆژگاریی و ڕێنمایی کردنن بۆ مسوڵمانان، نزیکترن لەوەی کە کۆمەڵێکی ڕێکخراو بن (واتە: لە حاڵەتی حیزبیی دوورترن) ئنجا ئەو کۆمەڵە ئیشیان ئەوەیە کە خەڵك بەرەو ئیسلام بانگ بکەن و، لایەنە ئەرێنییەکانی ئیسلام [ئیسلامیش هەموو لایەنەکانی چاك و ئەرێنین] بۆ خەڵك بخەنە ڕوو، هەر کەسێك کە دەمیان بیگاتێ، شوێنکەوتووانی خۆشیان پابەند دەکەن بەوەوە کە هەر کامێکیان بەشێك لەکاتی خۆی تەرخان بکات بۆ چوونە دەر [واتە: لە شوێنی خۆی، لە شاری خۆی بچێتە دەر] خەریك بن ئەو بانگەوازە بڵاوبکەنەوە، بەڵام خۆشیان لە ڕێکخستنی حیزبیی دەپارێزن، هەروەها خۆشیان لە بابەتە سیاسییەکان دەپارێزن، کاتێك کە دەچنە دەرێش، لەگەڵ مسوڵمانان تێکەڵ دەبن لە مزگەوتەکانیان داو لەماڵەکانیان و دووکان و یانەکانیان [ئەو شوێنانەی کە خەڵك لێیان کۆ دەبێتەوە] دەچن بەشدارییان دەکەن و، ئامۆژگاریی خەڵك دەکەن و دەرسیان پێ دەڵێن و، هانیان دەدەن لەسەر ئەوەی کە لەگەڵیان دەربچن و، ئەوانیش بەشداریی دەرچوون بکەن بۆ بانگەواز، هەروەها شوێنکەوتووانی خۆشیان ئامۆژگاریی دەکەن: کە مشتومڕ لەگەڵ مسوڵماناندا نەکەن و، ناکۆکیی لەگەڵ دەوڵەت و ڕژێمەکاندا نەکەن.

٢- دامەزرێنەری ئەم ڕەوتە:

شێخ (محمد إلياس الكاندهلوي)یە، کە لە ساڵی (١٣٠٣)ی کۆچیی دا لەدایك بووە و، لە ساڵی (١٣٦٤)ی کۆچیی دا، کۆچیی دوایی کردوە، لە دێیەك لە دایك بووە ناوی (کاندهلە)، لە دێیەکانی (سهار نفورا) لە (هیند)، زانستی سەرەتایی خۆی هەر لەو شوێنە وەدەست هێناوە، دوایی گواستوویەتەوە بۆ (دهلي)، کە شارێکی قەرەباڵغی (هیند)ە و، لەوێ لە قوتابخانەی (ديو بند) خوێندنی خۆی تەواو کردوە، کە ئەویش گەورەترین قوتابخانەی (حەنەفیی مەزهەبەکانە) لە نیمچە کیشوەری هیندیی، کە لە ساڵی (١٢٨٣)ی کۆچیی دا دامەزراوە، واتە: (١٨٦٧)ی زایینی دا و، قوتابخانەیەکی زۆر مەشهوورە.

٣- چەند کەسایەتییەك لە هاوەڵە نزیکەکانی کاندەهلەویی :

أ- الشيخ عبدالرحيم شاه الديوبندى التبليغي.

ب- الشيخ إحتشام الحسن الكاندهلوي.

ج- الأستاذ أبو الحسن علي الحسن الندوي.

د- الشيخ محمد يوسف الكاندهلوي، کوڕی شێخ (محمد إلياس)ە، لەدوای خۆی درێژەی بە کارەکانی بابی داوە، خاوەنی کتێبی: (حياة الصحابة)یە، کە کتێبێکی ناودارە.

٤- بنەماکانی کاری کۆمەڵی تەبلیغ:

شەش (٦) پرەنسیپ و مەبدەئی گشتییان هەن:

١)- وشەی هەرە پاك و چاك (الكلمة الطيبة): (لا إله إلاّ الله، محمد رسول الله)، زۆر تەئکید لەوە دەکەنەوە، کە ئەو وشەیە زۆر بگوترێ و، مسوڵمانان لە چەمك و مەبەستەکانی تێبگەن.

٢)- بەرپاکردنی نوێژ، دیارە نوێژێك بە بەمەزنگرتن و گەردنکەچییەوە، بۆ خوای تاك و پاك.

٣)- وەدەستهێنانی زانستی شەرعیی.

٤)- یادی خوا (ذكرُ الله).

٥)- دڵسۆزیی و یەکلابوونەوە بۆ خوا (الإخلاص).

٦)- ڕێزگرتن لە مسوڵمانان بەگشتی، بەبێ ئەوەی کە جیاوازییان بخەنە نێوان.

٥- شێوازی كۆمەڵی تەبلیغ:

ئەو سەرچاوانەی تەماشام كردوون، بە تایبەتی: (الموسوعة الميسّرة) زۆر بە تەفصیل باسی كردوون، بەڵام دەتوانین شێوازی كاریان لە چەند شتێك دا خوڵاصە بكەینەوە:-

١)- كۆمەڵ كۆمەڵ لەشوێن و شار و وڵاتی خۆیان دەردەچن و سەفەردەكەن، بۆ وڵاتێكی دیكە، یان شارێكی دیكە، بۆ ئەوەی ئەو خەڵكە بانگ بكەن، بەو شێوەیەی كە باسمان كرد، بانگیان بكەن بۆ ئەو شەش مەبدەئە گشتییە كە باسكران.

٢)- كاتێك دەگەنە جێی مەبەست، خۆیان ڕێك دەخەن و، دەچن بۆ ئەو شوێنانەی كە خەڵكیان لێ كۆ دەبێتەوە، ئنجا: بازاڕە، مزگەوتە، دووكانە، یانەیە .. هەر شوێنێكە.

٣)- دوای ئەوەی دەگەڕێن، ئنجا ئایا ڕۆژیان دیاریی كردوە، یان چەند سەعاتێكیان دیاریی كردوون، دوایی شوێنێكیان هەیە هەموویان لێی كۆ دەبنەوە، ئەو ئەندامانەی كە ڕۆیشتوون، كۆدەبنەوە، دیارە خەڵكیشیان لێ كۆ دەبیتەوەو قسەیان بۆ دەكەن.

٤)- خەڵك هان دەدەن لەسەر ئەوەی كە لەگەڵیان دەربچێت، خەڵك هاندەدەن كە ئەوانیش لەگەڵیاندا هاوەڵێتیی بكەن، دەزانن كە مرۆڤ لە ئەنجامی هاوەڵێتیی و ڕەفاقەتدا زیاتر كارتێكراو دەبێ، ئنجا ئەوانە دەرچوونی سێ ڕۆژییان هەیە، هەفتەییان هەیە، مانگییان هەیە، دەڵێن: بەڕێز! سێ ڕۆژان دەتوانی بێی، هەفتەیەك دەتوانی، مانگێك دەتوانی، بەڵام نەمبیستوە ئافرەتیان لەگەڵدابێ، زیاتر بانگخوازەكان پیاوانن.

٥)- ئەوانە لەسەرخۆیانیان پێویست كردوە: كە هەرگیز ناچن بۆ بانگهێشت كردنی خواردن (دعوة)، ڕەنگە پارێز لەوە بكەن تووشی حەرام ببن، یاخود

ئەگەر چاوبەرەوژێری خەڵك بن، كەسێك كە دەعوەتیان بكات، ڕەنگە دوایی نەتوانن وەك پێویست حەق بڵێن.

٦)- ئەوانە زۆر خۆیان بە ئەوەوە سەر گەرم ناكەن: شتێك كە ناشەرعیی و خراپە، لای بەرن، دەزانن لە ئەنجامی ئەوەدا تێكگیرانیان بۆ دروست دەبێ.

٧)- جەخت دەكەنەوە لەسەر چاككردنی تاك.

٨)- دەربارەی سیاسەت قسە ناكەن و، دەڵێن: (السیاسة: ترك السیاسة)، سیاسەت بریتیە لە وازهێنان لە سیاسەت!

٩)- بە پێویستیی دەزانن كە مسوڵمانان بەگشتی تەقلیدی یەكێك لە چوار مەزهەبە فیقهییەكان بكەن. هەرچەندە وەك لەتەوەری سێیەم دا باسمان كرد، ئێستا هەشت (٨) مەزهەبی فیقهیی هەن.

١٠)- پێیان وایە كە پێویستە: هەموو كەسێك شێخێكی هەبێ، ئوستازێكی هەبێ، دینی لێ فێر بێ.

١١)- زۆریش زێدەڕۆیی دەكەن لە خۆشویستنی هەر كەسێك دا كە بە شێخی دەزانن.

١٢)- یەكێ لە تایبەتمەندییەكانیان: زۆر گرنگیی دەدەن بەوەی كە لەجێی دەقە شەرعییەكان، پشت بە خەون دەبەستن، وەك بەڵگەی شەرعیی.

١٣)- پێیان وایە: تەصەووف نزیكترین ڕێگایە بۆ ئەوەی ئینسان شیرینایەتیی ئیمانی پێ بچێژێ.

١٤)- زۆر جەخت دەكەنەوە لەسەر ئارەزوومەندكردن و ترساندن (ترغیب وترهیب) ی خەڵك و، دەیانەوێ لە ڕووی عاتیفەوە خەڵك بخەنە ژێر كاریگەریی خۆیان.

١٥)- ئەم ئایەتە بە بەڵگە دێننەوە بۆ دەرچوون، كە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: [كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ] (آل عمران: ١١٠)، واتە: ئێوە باشترین كۆمەڵن كە بۆ خەڵك دەرهێندراون، پەیدا كراون!

بەڵام پێم وایە بەڵگە هێنانەوەکەیان لەجێی خۆیدا نیە، چونکە ئەم ئایەتە چەمکەکەی لەوە جیایە، کە ئەوان بەڵگە هێنانەوەی (إستدلال)ی پێدەکەن.

## ٦- چەند تێبینیی و ڕەخنەیەك لەسەر کۆمەڵی تەبلیغ:

١)- ئەوانە زیاتر گرنگیی دەدەن بە پانتایی لەسەر حیسابی قووڵایی، یانی: زیاتر گرنگیی بە حاڵەتی ئاسۆیی (أفقي) دەدەن، ئاسۆیی دەڕۆن و شاقوڵیی (عمودي) قووڵ نابنەوە.

٢)- ئەوانە ڕێکخراوێك کۆیان ناکاتەوە، بەڵکو زیاتر پەیوەندیی تاکییە، لەنێوان تاکەکاندا.

٣)- زۆر جاران ئایەتەکانی جەنگ و جیهاد تەئویل دەکەن، بە واتای: دەرچوون، دەرچوون بۆ بانگەوازو هۆشیار کردنەوەی مسوڵمانان، بەشێوەیەك کە ئەو شێوە دەرچوونەی خۆیان کە بۆ بانگەوازو پەروەردەکردنی مسوڵمانان، خەریکە بیکەن بە بەدیل بۆ جەنگ و جیهاد!

٤)- هەندێ جار پشت دەبەستن بە هەندێك لە گێڕدراوە بێ هێزەکان (المرويات الضعيفة) بەڵکو جاری وا هەیە هەڵبەستراوەکان (الموضوعات) واتە: زۆر تەحقیق ناکەن لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

٥)- زۆر باسی کەرامەت و خەون دەکەن! وەك کۆمەڵی نوڕسییەکان و، دەتوانین بڵێین: ئەوە خاڵێکی هاوبەشیانە.

٦)- بە زۆریی: خەوتن و خواردن و پشوودانیان لە مزگەوتەکانە و، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە کە مزگەوتەکان لە هەیبەتیان بێتە خوار -هەرچەندە پاك و خاوێنییشیان ڕادەگرن- بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە لەگەڵ حورمەت و هەیبەتی مزگەوتدا گونجاو نیە.

٧)- بە تەئکید ئەو کارەی ئەوان بایی ئەوە ناکا، ئیسلام بەرپا بکرێ، کە خوا دەفەرموێ:

﴿أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِ﴾ (الشورى:١٥).

واتە: ئایین بەرپابکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن.. ئەو شێوە کارکردنەی ئەوان، زیاتر بۆ هۆشیارکردنەوەی چەند تاکێکە لە مسوڵمانان، ئەویش زیاتر ئەوانەی کە هاموشۆی مزگەوت دەکەن.

٨)- ئەوانە شوێنەوار لەسەر هاموشۆکەرانی مزگەوتەکان بەجێ دەهێڵن، بەڵام ئەوەی کە هاموشۆکەری مزگەوت نەبێ، دەستیان نایگاتێ و دەمیان نایگاتێ، مەگەر لەبازاڕ و یانەیەکدا لێیان هەڵبکەوێ!

ئنجا لەبارەی ئەوانەوە گوتراوە: هەندێ لە ئیسلامیان وەرگرتوە، و هەندێکیشیان واز لێهێناوە (أخذوا بعض الإسلام، وتركوا البعض)! بەڵام نکوولیی لەوە ناکرێ، کە ئەو کۆمەڵە شوێنەواری باشیشیان هەبووە، لە زۆر لە کۆمەڵگایەکاندا، ئەوانەی کە تێیاندا هەن و، خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی ئەوان گەڕاوەتەوە.

## ٧- شوێنی بوونی کۆمەڵی تەبلیغ:

ئەو کۆمەڵە: لە هیند و پاکستان و بەنگلادیش و سووریا و ئوردن و فەلەستین و لوبنان و میصر و سوودان و، لە ناوچە عەرەب نشینەکانی عێراق دا هەن، هەروەها لە حیجاز و ئەورووپاو ئەمریکاش، تا ڕادەدەیەك، هەن، بەڵام زیاتر لە ناوچەکانی (ڕۆژهەڵاتی ئاسیا)دا هەن[1].

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، ج١، ص ٣١٧ - ٣٢٣.

## چوارەم: کۆمەڵەی نوور (النورسیة):

خوا پشتیوان بێ لە پێنج خاڵان دا پوختەیەك لەبارەی مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسیی و کۆمەڵەکەیەوە (کۆمەڵی نوور) کە ئێستا بە تەوژمێکی گەورە و کاریگەری ئیسلامیی دادەنرێ لە دنیادا، دەخەینەڕوو:

١- پێناسە.

٢- دامەزراندن.

٣- وێستگەکانی ژیانی مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسیی.

٤- چەند تێبینیی و سەرنجێك لەسەر تەوژمی نوور.

٥- کاریگەریی نامەکانی نوور.

### ١- پێناسە:

لە (الموسوعة الميسرة)دا هاتوە دەڵێ: {النورسية: جماعة دينية إسلامية، هي أقرب في تكوينها إلى الطرق الصوفية، منها إلى الحركات المُنَظَّمة، ركَّز مُؤَسِّسُها على الدعوة إلى حقائق الإيمان، والعمل على تهذيب النفوس، مُحْدِثاً تياراً إسلامياً، في محاولة منه للوقوف أمام المدِّ العلمانيِّ الماسوني الكمالي الذي اجتاح تركيا، عَقِبَ سقوطِ الخلافة العثمانية، واستيلاءِ كمال أتاتورك على دَفَّةِ الحكم فيها.}(١)

واتە: جووڵانەوەی قوتابییانی نوور، کۆمەڵێکی دینیی ئیسلامیین و، لە پێکهاتەیدا زیاتر لە ڕێبازەکانی تەصەووفەوە نزیکترە، تاکو لە جموجۆڵە ئیسلامییە ڕێکخراوەکان، دامەزرێنەرەکەی زیاتر جەختی کردۆتەوە لەسەر بانگەوازکردن بۆ ڕاستییەکانی ئیمان و، بۆ کارکردن لەسەر پەروەردەکردنی

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، ج١ص٣٢٤.

مسوڵمانان، تاکو لە ئەنجامی ئەوەش دا تەوژمێکی ئیسلامیی پەیدا ببێ، ئەویش بۆ ئەوە کە لەبەردەم ئەو تەوژمە عەلمانییە ماسۆنییە کەمالییەدا بوەستێ، کە کاتی خۆی بەسەر تورکیادا هات، لەدوای ڕووخانی خیلافەتی عوسمانیی و، خۆسەپاندنی (کەمال ئەتاتۆرك)بەسەر کورسیی حوکمڕانیی دا.

٢- دامـــەزرانـــدن:

دامەزرێنەرەکەی بریتیە لە: (سعيد النورسي) مامۆستا مەلا سەعیدی نۆڕسیی، کە لە ساڵی (١٨٧٣)ی زایینیی دا لەدایك بووەو لە ساڵی (١٩٦٠)ی زاینیدا کۆچی دوایی کردوە، لە تەمەنی (٨٧) ساڵییدا، کوردەو خەڵکی گوندی (نورِس)ە، کە نزیکە لە دەریاچەی وان، لە موقاتەعەی (هەزان) لە هەرێمی بەتلیس، لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆل، لە تورکیا.

٣- وێستگەکانی ژیانی مامۆستا مەلا سەعیدی نۆڕسیی:

لەبەر ئەوەی جووڵانەوەی (نوور) زیاتر لە مامۆستا مەلا سەعیدی نۆڕسیی و بەرهەمەکانیدا بەرجەستە بووە، بۆیە ئاماژەیەك دەکەین بە وێستگە و قۆناغەکانی ژیانی.

شایانی باسیشە: مامۆستا نۆڕسیی سەدوسی(١٣٠) نامیلکە (رسالة)ی نووسیوە، بەناوی (رسائل النور)، کە ئێستا لە دە (١٠) بەرگدا بە ژیاننامەکەشییەوە، وەرگێڕدراونە سەر زمانی عەرەبیی و بۆ زمانی کوردیش وەرگێڕراون.

ئنجا ئێمە لە پازدە (١٥) خاڵان دا و بەکورتیی: تیشك دەخەینە سەر وێستگەکانی ژیانی مامۆستا سەعیدی نۆرسیی:

١)- لە ساڵی ١٨٧٣زدا لە دایك بووە، وەك گوتمان: لە گوندی (نۆڕس).

٢)- لە (١٨) ساڵییدا قورئانی لەبەر کردوە و، زانستە باوەکانی ئەو ڕۆژگارەی خوێندوون و، فێری تیر ئەندازیی و زۆرانبازیی و سوارچاکییش بووە.

٣)- لە ساڵی ١٨٩٢ز دا، چۆتە (ماردین) و دەستی بە بانگەواز کردوە، بەڵام نەفیی کراوە بۆ (بەتلیس) لەلایەن والی ماردینەوە.

٤)- لە ساڵی ١٨٩٤ز دا، چۆتە شاری (وان) و، دەرسی گوتۆتەوەو زانستە نوێیەکانی خوێندوون و، لەوێ نازناوی (بدیع الزمان)ی پێدراوە، یانی: خەڵك ئەو نازناوەی پێداوە، (بدیع الزمان)یش یانی: سەر سوڕهێنەری ڕۆژگار، یان شتێکی سەرسوڕهێنەرو ناوازە لە ڕۆژگاردا.

٥)- لە ساڵی ١٨٩٦ز دا، چۆتە ئەستەنبووڵ و، ویستوویەتی: (جامعة الزهراء) دابمەزرێنێ، وەك چۆن (جامعة الأزهر) لە میصر هەیە و، لەوێ چاوی بە موفتی ئەوسای (أزهر): (شيخ بخيت المطيعي) کەوتوە و زۆر بە مامۆستا مەلاسەعید سەرسام بووە.

٦)- کاتێك کە هاوپەیمانەکان ئەستەنبووڵ دەگرن، مامۆستا مەلاسەعید هێزێك پێك دێنێ لە کوردەکان، کە پیرەمێردی شاعیریش لەگەڵ ئەو هێزەدا دەبێ، لە سەرچاوەکاندا بینیومە دەڵێ: (مەلا سعید تەکلیفی لێ کردم گوتی: غەزایە با بچین دیفاع بکەین لە دەوڵەتی ئیسلامیی! منیش لەبەر خاتری وی چووم) (پیرەمێرد) ناوی (تۆفیق) بووە، لەوکاتی دا ئەویش لە ئەستەنبوول پێگەیەکی ئیداریی هەبووە.

٧)- لە ساڵی ١٩٠٨ز دا، کە لەلایەن کۆمەڵەی: (الإتحاد والترقِّي) سوڵتان (عبدالحميد) لا دەدرێ و، دروشمی (الوحدة، الحرية، الإصلاح) بەرز دەکەنەوە، (بدیع الزمان)یش (جمعية الإتحاد المحمدي) واتە: (کۆمەڵەی یەکیەتیی موحەممەدیی) دادەمەزرێنێ، لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی دیکە پێکی دێنن، کە پیرەمێرد باسی ئەو کۆمەڵەیەش دەکات لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا.

٨)- لەساڵی ١٩١١ز دا دەچێتە سووریا و، لە (المسجد الأُموي)دا وتارێك دەدا، کە دوای خۆی بە: (الخطبة الشامية) ناو دەردەکا، لەو وتارەدا باسی (أسباب تقدمّ أوروبا وتخلُّفِ المسلمين)، (هۆیەکانی پێشکەوتنی ئەورووپاو دواکەوتنی مسوڵمانان) دەکا و، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هۆکاری دواکەوتنی مسوڵمانان شەشن:

١- نائومێدیی و بێ هیوایی.
٢- تێکچوونی ڕەوشت و، نەمانی ڕاستگۆیی لەژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.
٣- بڵاوبوونەوەی دژایەتیی و ناکۆکیی.
٤- نەمانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە گەرم و گوڕەکان و، هاوکاریی پێکەوە کردن.
٥- خۆسەپاندنی سیاسیی، کە وەك نەخۆشییەکی درم تەشەنەی کردوە.
٦- پێشخستنی بەرژەوەندیی تاکیی، بەسەر بەرژەوەندیی گشتییدا.

کە ئەو دەردانە ئێستاش هەر هەن و زیاتریش تەشەنەیان کردوە.

٩)- لە شەڕی جیهانیی یەکەمدا مامۆستا مەلا سەعید هێزێك پێك دێنێ بەناوی: (لقی پشتیوانان) (فرع الأنصار) (بە عەرەبیی وایە و، بە تەئکید بە تورکیی ناوێکی دیکەی هەبووە) بۆ هاوکاریی سوپای تورکیا، وەك سوپایەکی گەلیی وابووە، سوپایەکی خۆبەخش (جيش متطوِّع) و خۆیشی دەبێتە ئەفسەر و دەرسی قورئان بە قوتابییەکانی و، سەربازەکانی دەڵێ.

١٠)- ڕووسییەکان لەو شەڕەدا بە بریندارییی دەیگرن، دوای یەك دوو ڕۆژ، بە بریندارییی لە شوێنێك دەبێت، توانای ڕۆیشتنی نابێ و دەیگرن و نەفیی دەکەن بۆ (سیبیریا)، باکووری یەکێتی سۆڤیەت و ڕووسیا، کە لەوێش بەسەرهاتێکی عەجیبی لێ ڕوودەوە، بەڵام دوایی لە ڕێی ئەڵمانیاوە، پاشان لە ڕێی بولغارییاوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و، لەوێ هەم خەلیفە و، هەم (شيخ الإسلام) پیشوازییەکی گەرمی لێ دەکەن.

**١١)**- لە ساڵی (١٩٢٣ز) دا، وەرچەرخانێك لە ژیانیدا دروست دەبێ، کە بۆخۆی ناو لەقۆناغی پێش (١٩٢٣) دەنێ: سەعیدی کۆن (سعيد القديم) و، ئەوی دیکەش: ناو دەنێ سەعیدی تازە (سعيد الجديد)، کە دیارە ئەوەی کە زەق بووە لە قۆناغی سەعیدی تازەدا، ئەوە بووە کە وازی لە کارو چالاکیی سیاسیی هێناوە.

**١٢)**- ئنجا کاتێك موستەفا کەمال ئەتاتۆرك[1]، یاخیی بوون ڕادەگەیەنێ و دەیەوێ مامۆستا مەلا سەعید بەلای خۆیدا بکێشێ، بەڵام ئەو ڕازی نابێ، ئنجا لێرە دەرفەت نیە ئەگەرنا مامۆستا مەلا سەعید هەڵوێستی زۆر مەردانەو جوامێرانەی هەبوون، یەکێ لە هەڵوێستەکانی:

کاتێك کەمال ئەتاتۆرك بانگی کرد گوتی: تۆ قارەمانێکی ئەو گەلەی ئێمەی و لەشەڕدا بەدیل گیراوی و جیهادت کردوە لەدژی هاوپەیمانەکان و، دواتر لە دژی ڕووسەکان، ئێمە دەمانەوێ زۆر ڕێزت لێ بنێین و کارت پێ بسپێرین، ئنجا دەڵێ: ئێمە کۆبوونەوەی پەرلەمانمان هەیە کە ئەو کاتە ناوی: (مجلس المبعوثين) بووە، (مبعوث یانی: نوێنەر) دەبێ بێی، ئەویش دەچێ و وتەیەکی بۆ دادەنێن، ئاوا دەست پێ دەکا: {أيها المبعوثون! إنكم مبعوثون ليومٍ عظيم}، ئەی نوێنەران! ئێوە زیندوو دەکرێنەوە بۆ ڕۆژێکی مەزن، دوایی باسی نوێژ دەکاو، باسی خواپەرستیی و، ئەخلاق دەکات، کەمال ئەتاتۆرك دەڵێ: مامۆستا! تۆمان بانگ نەکردوە بۆمان باسی نوێژ بکەی، ئێرە ئەنجوومەنی نوێنەرانەو باسی سیاسیی تێدا دەکەین! ئەویش دەڵێ: کەمال گوێت لێبێ! ئەوەی نوێژ نەکا، خائینە و ئەوەی خائینیش بێ، بەکەڵکی خزمەتی وڵات نایەت! ئیدی کەمال ئەتاتۆرك بێ دەنگ دەبێ، ئەوانیش جارێکی دیکە لەدوای نانێرنەوە، بەڵام دوایی ژیانی هەمووی بە دوور خرانەوە و لە زیندان دا بردۆتە سەر.

---

(١) ئەتاتۆرك لە ساڵی (١٨٨٠)ی زایینیی دا، لەدایك بووە و، لە ١٩٣٨ ز دا، سەری بە فەتارەت چووە.

١٣)- چەند جارێك حوكمی ئیعدامی بۆ دەركراوە، بەڵام لە ترسیی ئاژاوەی شوێنكەوتووانی، پاشگەز بوونەوەو حوكمەكەیان گۆڕیوە.

١٤)- چەندان ساڵ ژیانی لە دوورخراوەیی دا بردۆتە سەر و، چەند جارێك ژەهر خواردووش كراوە، بەڵام خوای پەروەردگار تەمەنەكەی هێشتووەتەوە و، دوا قۆناغی دوور خراوەیی لە شاری (سپارتە) بووە .

١٥)- سێ ڕۆژ پێش وەفاتی چووە بۆ شاری (ئورفە) و، لەوێ لە: (٢٥ی ڕەمەزانی ١٣٧٩ی كۆچیی) بەرامبەر (٢٣ی ئازاری ١٩٦٠ی زایینی)یدا، كۆچی دوایی كردوە، (عبدالمجید)ی برای بانگ دەكەن: وەرە بۆ لای جەنازەی براكەت، بەڵام دوایی هەر بەو شەوە بە فڕۆكەیەك دەیگوازنەوە بۆ شوێنێكی دووری توركیا، لەوێش لە شوێنێكی نەناسراو -كە گۆڕەكەی تا ئێستاش نازانرێ- بە خاك دەسپێردرێ.

ئنجا عەجیب ئەوەیە كە مامۆستا مەلاسەعید نۆرسیی، لە یەكێك لە كتێبەكانیدا باس دەكا، دەڵێ: سەعید! تۆی كە دوایی قەبرێكت نابێ، خەڵك پێی بزانێ!! وەك كەرامەتێك، هەڵبەتە پیاوێكی زۆر گەورە بووە ئەهلی كەرامەت بووە، وەك لە ژیان و هەڵوێستەكانیدا دیارە و، من هەموو بەرهەمەكانیم خوێندۆتەوە، بە ژیاننامەكەشیەوە.

### ٤- چەند تێبینیی و سەرنجێك لەسەر تەوژمی نوور:

١)- نەیانتوانیوە كارێكی ئیسلامیی ڕێكخراو (مُنَظَّم) واتە: حیزبیی، دابمەزرێنن.

٢)- شوێنكەوتووانی مامۆستا مەلاسەعید، وازیان لە كاروچالاكیی سیاسیی هێناوە و، ئەو دروشمەیان بەرزكردۆتەوە: (أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة)، پەنا بەخوا دەگرم لە شەیتان و لە سیاسەت، كە مامۆستا (سعید) لە ساڵی (١٩٢٣ز)دا، ئەو دروشمەی بەرزكردۆتەوە، ئنجا ئەوانەی كە ڕەخنە دەگرن،

دەڵێن: ئەوە وایکردوە، کە شوێنکەوتووەکانی نۆرسیی، ببنە نێچیرێکی ئاسان بۆ حیزبە عەلمانییەکان، کە زەفەریان پێ بەرن و دەنگیان پێ بدەن.

٣)- لە ساڵی ١٩٢٥زدا، هاوکاریی شێخ سەعیدی پیرانی نەکردوە، کە لە دژی کەمال ئەتاتۆرك جیهادی ئیعلان کردوە، بۆ گێڕانەوەی خیلافەت و، بۆ داواکردنی مافی گەلی کوردیش، دوایی لە (١٩٢٥ز)دا، شێخ سەعیدی پیران لە سێدارە درا.

٤)- شوێنکەوتووانی ئەو کۆمەڵە، جۆرێك لە گۆشەگیرییان هەیە و، هەست دەکەن بە جۆرێك لە چاکتر بوون لە خەڵکی دیکە و، وەك پێویست ناتوانن لەگەڵ چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا تێکەڵ بن.

ئەم ڕەخنانەیان لێ دەگیرێن، بەڵام بە تەئکید ئەوانیش وەڵامی خۆیان هەیە، بۆ وێنە: ئەوکاتە مامۆستا مەلا سەعید، ڕەنگە هەر بە فریای ئەوە کەوتبێ بەرگریی لە ئیمان بکات، وەك خۆی گوتوویەتی: من بە فریای ئەوە ناکەوم بەرگریی لە هەموو ئیسلام بکەم، تەنیا بەرگرییم بۆ لە ئیمان دەکرێ، واتە: شەریعەتەکەی و باسی حوکم و سیاسەت و حەڵاڵ و حەرام و ئەوانە بەگشتی، لەتوانام دا نیە، بەڵام ئەگەر خەڵك ئیمانەکەی بمێنێ، دوایی ئەو ئیمانە وا لە خەڵکەکە دەکات، ئیلتیزامەکەش پەیدا بکەنەوە، کردەوە چاکەکانیش پەیدا بکەنەوە، بۆیە زیاتر جەختی لەسەر لایەنی ئیمانیی و ڕووحیی کردوە، کەچی ئەوەشی بە زەحمەت بۆچۆتە سەر، ئەدی ئەگەر حیزبێکی سیاسیی پێکهێنابایە؟ کەواتە: کاتێك باسی ژیانی هەر یەك لەو گەورە پیاوانە دەکەین، پێویستە هەل و مەرجەکانی باش بخوێنینەوە و، خۆمان لە شوێنی ئەودا بنێین.

٥- کاریگەریی نامەکانی نوور:

بەرهەمەکانی مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسیی، کاریگەریی زۆریان هەبووە لەسەر مسوڵمانان، بەتایبەت لە تورکیا، پاکستان، هیند، ئەمریکاو ئەوروپا و، لەم دوا دواییانەدا، لە وڵاتانی عەرەبییش، بەتایبەت دوای ئەوەی کتێبەکانی تەرجەمە کران، لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالحي)یەوە، کە من دوو سێ جار بینیومە و لە ئەستەنبوڵ دادەنیشێ، بەڕاستی خزمەتێکی گەورەی کردوە و خەڵکی کەرکووکە.

دیارە بەرهەمەکانی مامۆستا نۆرسیی کاریگەریی زۆر باشیان هەبووە، بۆ هۆشیار کردنەوەی مسوڵمانان، کە ئیمان و عەقیدەی خۆیان بپارێزن.

هەڵبەتە هەموو ئەو جموجۆڵە ئیسلامییەی کە ئێستا لە تورکیا هەیە، هەمووی بەشێوەیەك لە شێوەکان، دەچێتەوە سەر جموجۆڵی (کۆمەڵی نوور) یانی: سەرانی (حیزبی داد و گەشەپێدان) و کاتی خۆی نەجمەددین ئەربەکان، هەموویان کەم و زۆر، قەرزداری مامۆستا مەلا سەعیدو جووڵانەوەکەینی، خوا پاداشتیان بداتەوە.

لەکۆتاییی دا دەڵێین: مامۆستا سەعیدی نۆرسیی قسەیەکی زۆر جوانی هەیە، دەڵێ: ئەگەر (عبدالقادر)ی گەیلانیی لەسەردەمی مندا بووایە (رسائل النور)ی دەنووسی، هەروەها ئەبو حامیدی غەززالیش لە جیاتی (إحياء علوم الدين)، (رسائل النور)ی دەنووسی، ئەگەر منیش لە سەردەمی (عبدولقادر) ی گەیلانیی دابام (الفتح الربّاني)م دەنووسی و، ئەگەر لە سەردەمی ئەبو حامیدی غەززالیش دابام (إحياء علوم الدين)م دەنووسی، مەبەستی ئەوەیە کە هەر کام لە پێشەوایان و زانایان، بەپێی هەل و مەرجی خۆی و بەپێی پێداویستیی کۆمەڵگایەکەی خۆی، خزمەتی مسوڵمانانی کردوە[1].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص ٣٢٤-٣٢٩.

باسی
دووەم

## لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان

براو خوشکانی بەڕێز!

وەك چۆن لە باسی یەکەم دا، لە ڕەوتە ئیسلامییە هاوچەرخەکان چوار(٤) یانم دیاریی کردبوون:

١- ڕەوتی تەصەووف و تەڕیقەت.
٢- ڕەوتی سەلەفیی.
٣- ڕەوتی تەبلیغ.
٤- ڕەوتی نوڕسیی.

لەم باسی دووەمەش دا، لەلایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان، چوار (٤)یانم هەڵبژاردوون، بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە:

١- برایانی مسوڵمان.
٢- کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان.
٣- حیزبی تەحریر.
٤- کۆمەڵە جیهادییەکان.

سەرەتاش دەڵێین:

دەگونجێ بەزۆر شێوە، هەم: (برایانی مسوڵمان)، هەم (حیزبی تەحریر)، هەم (کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان)، هەم هەرکام لە (کۆمەڵە جیهادییەکان)، پێناسە بکرێن، بەڵام پێم وایە ئەو پێناسانەی هێناومانن، تاڕاددەیەکی زۆر بابەتییانە و هاوسەنگن:

## ا- برایانی مسوڵمان (الإخوان المسلمون)[1]:

هەوڵدەدەین لە پێنج خاڵاندا بە کورتیی و گوشراویی باسی (برایانی مسوڵمان) بکەین:

١- پێناسە.
٢)- دامەزرێنەر.
٣)- کورتە مێژوویەکی برایانی مسوڵمان.
٤- بەرنامەو ئامانجی (برایانی مسوڵمان).
٥- تێبینیی و ڕەخنە.

### ١- پێناسە:

{الإخوان المسلمون: إحدى الحركات الإسلامية المعاصرة التي نادت بالرجوع إلى الإسلام، وإلى تطبيق الشريعة الإسلامية في واقع الحياة، وقد وقفت مُتَصَدِّيةً لسياسة فصل الدين عن الدولة، ومنابذة موجة المدِّ العلماني في المنطقة العربية والعالم الإسلامي}.

واتە: برایانی مسوڵمان: گەورەترین بزووتنەوەی ئیسلامیی هاوچەرخە، بانگەشەی گەڕانەوە بۆ ئیسلام دەکات، وەك لە قورئان و سوننەتدا هەیە و،

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ج١، ص ١٩٨-٢٠٥.

داوای جێ بەجێ كردنی شەریعەتی ئیسلامیی دەكات، لە ژیاندا و، بەرهەڵستیی سیاسەتی جیاكردنەوەی دین لە دەوڵەتی كردوە و، دژی شەپۆلی عەلمانیی وەستاوەتەوە، هەم لە ناوچەی عەرەبییدا، هەم لە جیهانی ئیسلامییدا.

٢- دامەزرێنەر:

دامەزرێنەری (برایانی مسوڵمان) ئاشكرایە كە (شیخ حسن البنا)یە (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، كە لە ساڵی (١٣٢٤)ی كۆچیی دا لە دایك بووە و، لە (١٣٦٨)ی كۆچیی دا وەفاتی كردوە، واتە: (١٩٠٦ز) بۆ (١٩٤٩ز).

ئنجا مامۆستا حەسەن بەننا، وانەبێژ (مدرِّس) بووە، لە یەكێك لە قوتابخانەكانی سەرەتایی، لە پارێزگای ئیسماعیلییە لە میصر، لە ساڵی (١٩٢٧ز) دا، بۆتە مامۆستا، لە ساڵی (١٩٢٨ز)دا كۆمەڵی برایانی مسوڵمانی دامەزراندوە.

٣- كورتە مێژوویەكی برایانی مسوڵمان:

١- لە ساڵی (١٩٢٨ز)دا، دامەزراوە، لەسەر دەستی حەسەن بەننا.

٢- لە ساڵی (١٩٣٢ز)دا، حەسەن بەننا، بنكەی سەرەكیی خۆی گواستۆتەوە لە ئیسماعیلییەوە، بۆ قاهیرە.

٣-لە ساڵی (١٩٣٣ز)دا، ڕۆژنامەی (الإخوان المسلمین)یان دەركردوە، ڕۆژنامەیەكی هەفتانە بووە، (محب الدین الخطیب) سەرنووسەری بووە، پاشان لە ساڵی (١٩٣٨ز) دا، گۆڤاری (النذیر)یان دەركردوە، لە ساڵی (١٩٤٧ز)یشدا گۆڤاری (الشهاب)یان دەركردوە، واتە: ئەو سێ بڵاوكراوەیان هەبوون، لە سەردەمی حەسەن بەننادا.

٤- لە ساڵی (١٩٤١ز)دا، یەكەمین دەستەی دامەزرێنەران لە سەد (١٠٠) ئەندام دیاریی كراوە.

٥- لە ساڵی (١٩٤٨ز)دا، بەشدارییان کردوە لە جەنگی فەڵەستیندا، بۆ بەرگریی کردن لە فەڵەستین دژی قەوارەی جوولەکە و، بەشدارییەکی زۆر کاریگەریشیان کردوە، هەتا دەڵێن: جوولەکەکان دەیانگوت: ئەوانە چ نەوعێکن! زۆر جیان لە سەربازەکانی دیکە، چونکە ئەوانەی لەو قۆڵەوەن، هەڵناقەڵدرێن تاکو نەکوژرێن!

٦- هەر لە ساڵی (١٩٤٨ز)دا، (النقراشي) کە وەزیری نێوخۆ بووە، دەکوژرێ و (الإخوان المسلمون)ی پێ تۆمەتبار دەکرێ.

٧- هەر لە تۆڵەی ئەودا، لەساڵی (١٩٤٩ز)ی زایینیی دا، حەسەن بەننا لە بەرامبەر کوژرانی (النقراشي)دا، بە مەزڵوومیی، دەکوژرێ و هەر لە ساڵی (١٩٤٩ز)دا، کە حەسەن بەننا شەهید دەکرێ، برایانی مسوڵمانیش حەل دەکرێ و، بە فەرمیی نامێنێ.

٨- بەڵام لە ساڵی (١٩٥٠ز)دا، لە سەردەمی (وزارة النحاس)دا دەرووی خێر دەکرێتەوە لە کۆمەڵی برایان و ڕەسمییەت پەیدا دەکەنەوە .

٩- هەر لە ساڵی (١٩٥٠ز)دا، (المستشار حسن الهضيبي) کە لە ساڵی (١٨٩١) لەدایك بووە و، لە ساڵی (١٩٧٣)دا کۆچیی دوایی کردوە، دەبێتە دووەمین ڕابەری گشتیی (المرشد العام)ی (برایانی مسوڵمان) و، هەر لەو سەرو حەددەشدا، کتێبێك دەنووسێت بەناوی: (دعاة لا قُضاة)(بانگخوازان نەك دادوەران) کە بەرپەرچی هەندێك لە بیرۆکەکانی (سید قطب) دەداتەوە (ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ).

١٠- لە ساڵی (١٩٥٤)دا، دەست دەکرێتەوە بە ڕەشبگیریی برایانی مسوڵمان و، (عبدالقادر عودة) لەگەڵ پێنج کەسی دیکە، لە پیاوانی ناوداری کۆمەڵی برایان، لە سێدارە دەدرێن، (عبدالقادر عودە) قاضی بووە و کۆمەڵێك کتێبی گرنگی هەن، وەك: (الإسلام وأوضاعنا القانونية)، (الإسلام وأوضاعنا السياسية) (الإسلام بين جهل أبنائه وعَجْز علمائه)، (التشريع الجنائي مقارناً بالقانون الوضعي) و، کۆمەڵێك کتێبی دیکەش.

(سید قطب)یش ڕەحمەتی خوای لێبێ، ماوەی دە(١٠) ساڵ لە (١٩٥٤)ز، تاكو (١٩٦٤)ز، لە سجندا دەمێنێتەوە و، لەوێشدا تەفسیری (في ظلال القرآن) دەنووسێ.

١١- لە (١٩٦٥) و (١٩٦٦)دا، جارێكی دیكە دەست دەكرێتەوە بە ڕەشبگیرییان و، لە ساڵی (١٩٦٦)دا (سید قطب) لە سێدارە دەدرێ، (سید قطب) لە (١٩٠٦) لەدایك بووە و، لە (١٩٦٦) لە سێدارە دراوە.

١٢- ئنجا لە دوای لەسێدارە دانی (سید قطب)، (برایانی مسوڵمان) بە شێوەی نهێنیی كار دەكەن، تاكو (جمال عبدالناصر) لە ساڵی (١٩٧٠)دا دەمرێ و بەهیلاك دەچێ.

١٣- ئنجا دوای ئەوەی پاش (جمال عبدالناصر)، (أنور السادات) دێتە سەر حوكم، جارێكی دیكە دەرگای زیندانەكان لە كۆمەڵی (الإخوان المسلمون) دەكاتەوە، ئازادییان پێ دەدرێ، كە دیارە تاكو ئەو كاتەش بێ مورشید دەمێننەوە.

١٤- لە ساڵی (١٩٧٠)دا عومەر تەلمەسانیی، كە لە (١٩٠٤) لە دایك بووە، لە (١٩٨٦) كۆچیی دوایی كردوە، دەبێتە سێیەمین مورشیدی (برایانی مسوڵمان).

١٥- دوای ویش (محمد حامد أبو النّصر) دەبێتە چوارەم ڕابەری گشتیی (الإخوان المسلمون) كە لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە تاكو (١٩٩٦) واتە: دە (١٠) ساڵ، ڕابەرایەتیی دەكات.

١٦- دوای ویش (مصطفى مشهور) دەبێتە پێنجەمین ڕابەری گشتییان.

١٧- دوای ئەویش (محمد بديع)، دەبێتە ڕابەریان، كە ئێستا لە زیندانی (عبدالفتاح السيسي)دایە، لەگەڵ (د.محمد مرسي)دا، خوا دەرووی خێریان لێ بكاتەوە.

٤- بەرنامەو ئامانجی (برایانی مسوڵمان):

حەسەن بەننا پیاوێکی ڕەوانبێژو زیرەك و زۆر شارەزاش بووە و، زۆرێك لە زانایان، بە تازەکەرەوەیەکی ئیسلامی دادەنێن، کەزۆر بە کورتیی دەڵێ: {إن الإخوان المسلمين: دعوة سلفية، وطريقة سُنِّية، وحقيقة صوفية، وهيئة سياسية، وجماعة رياضية، ورابطة علمية وثقافية، وشركة اقتصادية، وفكرة اجتماعية} واتە: برایانی مسوڵمان: بانگەوازێکی سەلەفییە و، ڕێبازێکی سوننییە و، حەقیقەتێکی سۆفییە و، دەستەیەکی سیاسییە و، کۆمەڵێکی وەرزشوانە و، پەیوەندییەکی زانستیی و کلتورییە و، کۆمپانیایەکی ئابوورییە و، فیکرەیەکی کۆمەڵایەتییە.

مەبەستی ئەوە بوو کە ئێمە شوێن ئیسلام دەکەوین و، دەمانەوێ: ئیسلام وەك خۆی وایە، بیکەین بە کاڵای باڵای ژیانی کۆمەڵگا، لە هەموو ڕووەکانەوە.

ئنجا کاتی خۆی حەسەن بەننا بۆ گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگادا سێ قۆناغی داناون:

أ- (التعريف) پێناسە.

ب- (التكوين) پێکهێنان.

ج- (التنفيذ) جێبەجێکردن.

١- سەرەتا (تعريف) واتە: بەرنامەی خۆیان بۆ خەڵك شەرح بکەن و، خەڵك تێی بگەن و پێی ئاشنابن.

٢- پاشان (تكوين) واتە: خەڵك کۆ بکرێتەوەو بهۆندرێتەوە و، کۆمەڵێکی پوختە و تۆکمەیان لێ پێك بهێنرێ.

٣- ئنجا (تنفيذ) جێ بەجێ کردن، واتە: دوای ئەوەی زانییان بنکەی جەماوەریی پەیدابووە و بایی ئەوەندە خەڵك هەیە کە جڵەوی حوکم بگرنە دەست، ئنجا دەست بە جێبەجێ کردنی بکەن، واتە: ئیعلانی قەوارەی سیاسیی بکەن.

هەڵبەتە لەوەشدا ڕاجیایی هەیە لەنێوان قوتابخانەکانی (برایان)دا کە دەبێ چۆن بێ؟ کە لەسەردەمی حەسەن بەننادا، توندو تۆڵیی زیاتری پێوە دیار بووە، وەك لە کتێبی (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟)دا، باسمان کردوە، بەڵام دوای ئەوەی بەڵایان زۆر بەسەر هاتوون، تا ڕاددەیەکی زۆر لە هەندێ شتدا، نەرمکێشیی کراوە.

دیارە لە بواری شێوازی گۆڕانکاریی دا، بیرۆکەیەکی دیکەش هەیە، کە بیرۆکەیەکی زۆر جوانەو، هەر هی (برایان)یش نیە و دەڵێ: کۆمەڵگا پێویستە بەم شێوەیە بگۆڕرێ:

أ- تاکی مسوڵمان.

ب- خێزانی مسوڵمان.

ج- کۆمەڵگەی مسوڵمان.

د- دەوڵەتی ئیسلامیی.

ئەوەش شتێکی ڕوون ئاساییە، کە دەبێ سەرەتا تاکە تێگەیەندراو و پێگەیەندراوەکان لەئیسلام دا، هەبن، دوایی خێزانەکانە پەروەردەکراوەکان، ئنجا کۆمەڵگای مسوڵمان دەبێ و، دوایی قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی دەبێ.

### ٥- تێبینیی و ڕەخنە:

هەندێك کەس چەند شتێکیان لە قوتابخانەی (الإخوان المسلمون) بە ڕەخنە گرتوە[1]، بۆ وێنە:

١)- ئەوەیان لێ بە ڕەخنە گرتوون کە (حسن البنّا) گوتوویەتی: (حقیقة صوفیة)، گوتوویانە: ئەوە ڕاست نیە، چونکە تەصەووف زۆر شتی تێدایە!.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ج١ ص١٨٠-٢٠٥.

ئێمەش دەڵێین: (حسن البنّا) مەبەستی ئەوە نەبووە، کە ئیسلام بریتییە لە کۆی (تصوّف) بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە: لایەنی ڕووحیی گرنگیی پێ دەدەین، بۆیەش گوتوویەتی: (الإسلام: حقیقة صوفیة).

٢)- هەروەها گوتوویانە: لە ڕووی (إثبات الصفات)ەوە (حسن البنا) زیاتر حاڵەتی (تفویض)ی هەبووە!

بەڵام پێم وایە ئەوەش شتێك نیە بە ڕەخنە بگیرێ، چونکە ئەوانەش کە زۆر خۆیان بە (سەلەفیی) دەزانن، کە باس دێتە سەر ئەوەی، چوونە سەر عەرشی خوا چۆنە؟ یان: (ید) و (وجە)ی خوا چۆنن؟ دەڵێن: خوا بەس خۆی دەزانێ چۆنە؟ کەواتە: بە بۆچوونی من: ئەگەر ئینسان لە یەکدی لە بەهانە نەبێ، ئەو دوو قسەیە هەر دەبنەوە بەیەك و، سەرەنجامەکە هەرئەوەیە کە چۆنیەتیی سیفەتەکانی خوا، دەبێ حەواڵە (تفویض)ی خوا بکرێن و بەس خۆی دەیزانێ.

٣)- هەروەها مەسەلەی (البدعة الإضافیة)شیان لێ بە ڕەخنە گرتوون، کە خیلافێکی فیقهیی لەسەرە[1].

بەڵێ، من ئەوانە هیچیان بە ڕەخنە نازانم، بەڵام پێم وایە چەند خاڵێکی بێهێز لە کۆمەڵی (برایان)دا هەن، بۆوێنە:

**یەك:** جۆرێك لە دەمارگیریی و خۆ پەسندیی، کە زۆر جار ئەوە بۆتە هۆکاری کێشەیان لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکان دا، گوتویانە: ئێمە کۆمەڵی دایك (الجماعة الأم)ین و تاکو ئێمە هەبین، نابێ خەڵکی دیکە هەبێ و، ئیسلام و مسوڵمانانیان زیاتر لە خۆیاندا بینیون! یانی: جۆرێك لە خۆ پەسندیی و خۆ پێ زۆر بوون و، خەڵك پێ کەم بوون! ئەو حاڵەتە بەگشتی پێیانەوە بیندراوە، ناشڵێین: تاك تاکیان وان، بەڵام بەگشتیی، کتێبەکانیشیان بخوێنیەوە، هەر ئەوەیان تێدا دەخوێنیەوە.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ج١ ص ١٩٨-٢٠٥.

**دوو:** حاڵەتی دۆگمایی لە بیرکردنەوەدا و، شێوازو ڕێبازی تازە نەگرتنەبەر، واتە: مانەوە لەسەر هەندێك شێوازو ئامرازی کۆن، هەرچەندە کاتیشیان بەسەر چووە، ئەوەش حاڵەتێکە لەو قوتابخانەیەدا دەبیندرێ.

**سێ:** چاك نەخوێندنەوەی واقیع، زۆر جار (الإخوان المسلمون) چاك واقیعی نەخوێندۆتەوە و، لەئەنجامی ئەوەدا تووشی هەڵەی کوشندە بوون، لەسەردەمی (جمال عبدالناصر)دا چاك واقیعەکەیان نەخوێندبۆوەو لەگەڵی تێك گیران، دوایی خراپیان بەسەر هات، لەم دوا دوایەشدا، لە میصر خەڵکێکی زۆر دەنگی پێدان، بەڵام دیسان واقیعەکەیان چاك نەخوێندبۆوە و، تووشی ئەو دۆخە هاتن، کە بۆ هەموو لایەك ناخۆش بوو و ئێستاش هەر بەردەوامە.

هەڵبەتە ڕەنگە ئەوانیش بۆ هەرکام لەم ڕەخنانە بتوانن بەرگریی لەخۆیان بکەن و، قسەی خۆیان هەبێ، چونکە ئەو شتانە وانین وەك ئایەت و فەرموودە، لە ئاستیاندا بێ قسەبێ، بەڵکو بۆچوونەو ئیجتیهادەو تێگەیشتنە، کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێك و، لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك دەگۆڕێ.

## ٢- کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان[1]:

خوا عزوجل هاوکارمان بێ هەوڵدەدەین لە حەوت خاڵان دا بەکورتیی و پوختیی، لەبارەی کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستانەوە، کە لەزۆربەی نیمچە قارەی هیندیی دا هەیە، بدوێین:

١)- پێناسە.

٢)- دامەزراندن.

٣)- چەند وێستگەیەکی ژیانی (أبو الأعلى المودودي).

٤)- ئامانجەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان.

٥)- شێوازی کاری کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان.

٦)- شوێنی کاریگەریی کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان.

٧)- تێبینیی و ڕەخنە.

### ١- پێناسە:

{الجماعة الإسلامية في شبه القارة الهندية الباكستانية، جماعة إسلامية معاصرة، كرّسَتْ جهودَها في سبيل إقرار الشريعة الإسلامية وتطبيقها في حياة الناس، والوقوف بحزم ضد جميع أشكال الإتجاهات العلمانية التي تحاول السيطرة على المنطقة}.

واتە: کۆمەڵی ئیسلامیی لە نیمچە کیشوەری هیندیی پاکستانییدا، کۆمەڵێکی ئیسلامیی هاوچەرخە، هەموو هەوڵی خۆیان لەوەدا چڕکردۆتەوە کە دان بنرێ بە شەریعەتی ئیسلامییداو جێ بەجێ بکرێ لە ژیانی خەڵکدا و، زۆر بە سەختیی لەبەرانبەر هەموو شێوازەکانی عەلمانییەتدا، ڕاوەستاوە، کە دەیەوێ هەیمەنە بەسەر ناوچەکەدا بکات.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ج١ ص٢٠٦-٢١٣.

٢- دامەزراندن:

کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان، دامەزرێنەرەکەی (أبو الأعلى المودودي)یە (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، کە لە ساڵی (١٩٠٣ز)ز، لەدایك بووە و لە (١٩٧٩ز) دا، کۆچی دوایی کردوە و (٧٦) ساڵ ژیاوە، لە ساڵی (١٩٣٣ز)دا، گۆڤارێکی دەرکردوە بەناوی: (ترجمان القرآن) و، لە ساڵی (١٩٤١)زدا، کە دەکاتە ساڵی (١٣٦٠)ی کۆچیی لە (لاهوور) بانگەشە دەکات بۆ بەستنی کۆنگرەیەك و حەفتاو پێنج (٧٥) کەس کۆ دەبنەوە، لە هەموو توێژەکانی مسوڵمانانی هیند، کە ئەوکاتە هەر هیند هەبووە و پاکستان جیانەبووەوە، لەوێ کۆمەڵی ئیسلامیی ڕادەگەیەندرێ و، ئەبو لئەعلای مەودوودیی وەك ئەمیر دەستنیشان دەکرێ.

٣- چەند وێستگەیەکی ژیانی (أبو الأعلى المودودي):

١- لە ساڵی (١٩٤٧ز)دا، پاکستان بەهەردوو بەشەکەیەوە هەم (پاکستان)، هەم (بەنگلادش) کە دوایی لێی جیا دەبێتەوە، لەدەوڵەتی (هیند)ی بتپەرست جیا دەبێتەوە و، هەرناویشیان لێنا: (پاکستان) یانی: شوێنی پاکان و ئەوانەی کە بتپەرست و گا پەرست، نین و، خواپەرستن.

بەڵام لە ساڵی (١٩٧١ز)دا پاکستان دەبێتە دوو بەش: بەشی ڕۆژئاوایەکەی، کە هەر ناوی (پاکستان)ی لەسەر دەمێنێتەوە و، بەشی ڕۆژهەڵاتیشی بەناوی (بەنگلادش) دەناسرێ.

٢- (ئەبو لئەعلای مەودوودیی) چەند جارێك گیراوە و، حوکمی ئیعدامیشی بۆ دەرکراوە، لەسەر ئەوەی داوا دەکات شەریعەت پیادە بکرێت، یانی: تۆمەتی سەرەکیی کە ئاراستەی کراوە، ئەوەیە کە داوا دەکا شەریعەتی ئیسلامیی پیادە بکرێ!

هەروەها بەتۆمەتی ئەوەش کە (کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان) یارمەتیی مسوڵمانانی موجاهیدیان داوە لە (کشمیر)، کە ئەوانیش هیندییەکان ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هەر دەیان چەوسێننەوە.

٣- واز هێنانی لە ئەمیراتیی: (أبو الأعلی المودودي)، لە ساڵی (١٩٧٢ز) دا لەسەر داوای خۆی واز لە ئەمیرایەتیی دێنێ، لەبەر باری تەندروستیی و، خۆی یەکلا دەکاتەوە بۆ تەواوکردنی تەفسیرەکەی، بەناوی: (تفهیم القرآن) کە ئێستا تەفسیرەکەی تەرجەمەی عەرەبییش کراوە، چونکە خۆی بە زمانی (ئۆردوو) دایناوە.

٤- کۆچی دوایی و جێ گرتنەوەی: (أبو الأعلی المودودي) لە (١٩٧٩/٩/٢٢ز) دا، دوای ئەوەی عەمەلیاتێکی بۆ دەکرێ لە (نیۆیۆرك) لە ئەمریکا کۆچی دوایی دەکات و، (میان طفیل) کە لە (١٩٤١ز)دا، لەدایك بووە و پێشتر وەك (أمین عام) بووە، لە جێی وی دەبێ بە ئەمیری (کۆمەڵی ئیسلامیی) و لە ساڵی (١٩٨٧)یش دا (قاضي حسین)، -کە چەند جارێك لە هەندێك کۆنگرەو بۆنەدا بینیومە- دەبێتە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان.

### ٤- ئامانجەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان:

١)- ئیسلام سیستمێکی گشتگیرە بۆ هەموو بەشەر بە گشتیی و، بە تایبەت بۆ مسوڵمانان.

٢)- بانگەواز کردن بۆ هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن، بانگەواز بکرێن کە ملکەچیی خۆیان، دینداریی خۆیان، بۆ خوا ساغ بکەنەوەو خۆیان تەزکیە بکەن و، خۆیان لە سیفەتەکانی نیفاق پاك بکەنەوە.

٣)- بانگکردنی هەموو خەڵکی سەر زەویی، کە بێنە ژێر سێبەری شەریعەتەوە و، لەژێر سایەی شوومی طاغووتە خۆ سەپێنەرەکان بێنەدەر و، مسوڵمانان پێشەوایەتیی فیکریی و عیلمیی بەدەستەوە بگرن، وەك شایستەیە بۆ ئەهلی ئیسلام.

٥- شێوازی کاری کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان:

**١)**- جەختیان کردۆتەوە لەسەر ڕاستکردنەوەی ئیمان و عەقیدەی مسوڵمانان و تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام.

**٢)**- ئنجا ئەوانەیان کە بەدەم بانگەوازەکەوە دێن، دەست نیشان بکرێن و، گوڵبژێر بکرێن و، بهۆندرێنەوە پەروەردە و ئامادە بکرێن.

**٣)**- هەوڵبدرێ بۆ چاکسازیی کۆمەڵایەتیی و، چارەسەری زانستیی واقیعییانە پەیدا بکرێ، بۆ کێشەکانی مسوڵمانان .

**٤)**- حوکمڕانیی چاکسازیی تێدا بکرێ و، کۆتایی بهێندرێ بە خراپەکارییە کۆمەڵایەتییەکان و، مسوڵمانان هۆشیار بن و بەشێوەیەك بن: شایستەیی ئەوەیان هەبێ سەرکردایەتیی کۆمەڵگایەکانی خۆیان بکەن.

٦- شوێنی کاریگەریی کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان:

شوێنی کاریگەریی کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان، زیاتر پاکستانە، پاشان: هیندە، بەنگلادیشە، سریلانکایە، کشمیرە، هەروەها هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، ئنجا کەم و زۆر کتێبەکانی (مەودوودیی) کاریگەرییان هەبووە لەسەر مسوڵمانان بەگشتیی، لە عالەمی عەڕەبیی و غەیری عەڕەبییشدا.

٧- تێبینیی و ڕەخنە:

**یەکەم:** بەڕای من: تێبینیی و ڕەخنەیەکی بنەڕەتیی کە ئاڕاستەی (کۆمەڵی ئیسلامیی لە پاکستان) دەکرێ، بەتایبەت کە بناغەی فیکریی ئەو کۆمەڵە بریتیە لەفیکر و تێگەیشتنی (أبو الأعلى المودودي) بۆ ئیسلام، ئەوەیە کە:

مامۆستا مەودوودیی لە ئەنجامی ئەوەدا کە لە ژینگەیەکدا بووە: هیندییە گا پەرستەکانی لێ بوون، پاشان عەلمانییەکانی زۆر سەختگیر بوون، ئەویش لەکاردانەوەدا زۆر بەولادا چووە و مەسەلەی حوکمڕانیی (حاکمّیة)ی لە ئیسلامدا زۆر زەق کردۆتەوە و (سید قطب)یش زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی قسەکانی، لە (في ظلال)ەکەیدا: چەند جارێك باسی دەکا و، کە باسیشی دەکا دەڵێ: (المسلم العظیم) مسوڵمانی مەزن، بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن: (سید قطب) لە ڕووی بیرۆکەی حوکمڕانیی (حاکمیة)یەوە، زیاتر کارتێکراو (متأثر)ە بە فیکری مەودوودیی.

ئنجا ڕەگ و ڕیشەی زۆر لە کۆمەڵە پەڕگیرەکانیش دەچێتەوە بۆ ئەوێ، چونکە هەم مامۆستا [ئەبولئەعلا مەودوودیی] و هەم [سید قطب] زۆر باسی نەفامێتیی کۆمەڵگا (جاهلیة المجتمع) و، حاکمیەتیی شەریعەتیان کردوە، کە بێگومان زۆر ئاساییە و دەگونجێ بڵێی: کۆمەڵگا نەفامیی و نەزانیی (جاهلیة) ی تێدایە، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە (أبوذر)ی فەرموو: {إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ}[1]، بەڵام دوایی هەندێك کەس وایان لێ فامییەوە، کە: (ئەو کۆمەڵگایە نەفامە) واتە: داڕندراوە لە ئیسلام و بێ دین و نامسوڵمانە!! دیارە گرووپی (التکفیر والهجرة)ش کە لە ساڵانی حەفتاکایەکان دا لە میصر پەیدابوون، کارتێکراو بوون بەوبیرۆکانە.

ئنجا مەسەلەی (حاکمیة)یش کە دەبێ بەس خوا (حاکم) بێ و شەریعەتەکەی حاکم بێ، هەق و ڕاستە، بەڵام ئیسلام تەنیا لەلایەنە سیاسییەکەی و، لە قەوارەی سیاسییدا کورت نابێتەوە و، زۆربەی لە پێغەمبەران (علیهم السلام) نەیانتوانیوە قەوارەی سیاسیی دەستەبەر بکەن، ئنجا ئایا مانای وایە بێ مراد بوون؟ هەروەها ئایا ئەو هەموو لایەنە ئیسلامییانەی لە عالەمی ئیسلامییدا هەن، ئەگەر نەیانتوانی قەوارەی سیاسیی دروست بکەن، مانای وایە: بێ مرادو دەستخەڕۆ بوون؟ بە تەئکید نەخێر.

---

(١) صحیح البخاري: ٥٧٠٣.

بۆیە وەك چۆن: (لایەنە جیهادییەکان) مەسەلەی جەنگ و جیهادیان زۆر گەورە کردوە لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکە، ئەو قوتابخانەیەی مامۆستا (مەودوودیی)، کە (سید قطب)یش پێی کارتێکراو بووە، لایەنی (حاکمیة) و دروستکردنی (قەوارەی سیاسیی)یان لە ئیسلامدا، زۆر گەورە کردوە و، لایەنەکانی دیکە، تا ڕاددەیەك بەهۆی ئەوەوە پەڕاوێز خراون! بەڵام بەدڵنیاییی پێم وایە: (سید قطب) و (المودودي) ئەو کۆمەڵگایانەی ئێستای مسوڵمانانیان پێ کافر نەبووە و، زۆر بە زەحمەت خەڵکیان بەکافر داناوە، بەڵام لەدوای خۆیان، وەك گوتراوە: (گەورە ئاو دەڕێژێ، گچکە پێی ڕێ دەخا) وردە وردە هەر لێیان زیاد کردوە تا گەیشتووەتە ئەوەی دەیبینین: ڕێکخراوی: (القاعدة) پەیدا بوو و، لە پێش (القاعدة)دا ڕێکخراوی دیکە پەیدابوون، دوایی سەری بە (داعش) گەیشت! ناشڵێم: ئەوە هەمووی دەچێتەوە بۆ بیرۆکەکەی (أبو الأ علی المودودي)، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە ئەو جۆرە بیرۆکانە، هەڵوێستی تێپەڕێنەرن بەرامبەر بە کۆمەڵگایەکانی مسوڵمانان، مسوڵمانانێکی دەستەپاچە، مسوڵمانانێکی ژێر دەستی زەبوون، ئنجا بچی کافریشیان بکەی! ڕژێمە زاڵمەکان چەوساندوویاننەوە و تۆش کافریان بکەی! بێگومان ئەوە هەڵەیە و دڵڕەقیی و بێویژدانییە!

بەڵام وەك گوتمان: لادان (إنحراف) هەمیشە بەگۆشەیەکی زۆر تەسك، دەست پێدەکات، کە بە ئاستەم هەستی پێ دەکرێ، کەچی دوایی وردە وردە گۆشە (زاویة)کە فراوان دەبێ و لەحیساب دەردەچێ!

**دووەم:** هەروەها ڕەخنەو تێبینییەکی دیکە کە دەبێ لە کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان بگیرێ، لە ڕووی شێوازی کاریانەوەیە کە:

زیاتر کارێکی بژاردەیی (نخبوي)یان کردوەو، جەختیان لەسەر کارلێك (تفاعل) لەگەڵ خەڵك و جەماوەردا نەکردۆتەوەو مەرجەکانی ئەندامێتی (شروط العضوية)یان هێندە قورس کردوون و، کە لەساڵی (١٩٤١ز)ەوە دامەزراوە، یانی: حەفتاونۆ (٧٩) ساڵ لەمەوبەر!! ئێستاش لەگەڵ بێ بوون و کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە پاکستاندا نیە، چونکە بێگومان بەبێ بنکەی جەماوەریی گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگادا ناکرێ.

## ٣- حیزبی تەحریر(حزب التحرير):

(حزب التحرير) یانی: (پارتی ڕزگاریی) یان (پارتی ڕزگارکردن) یان (پارتی ئازاد کردن) بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە زیاتر لە وڵاتانی عەرەبییدان، ناوەکەیان هەروا ڕۆیشتوە.

خوا عزو جل پشتیوان بێ هەوڵدەدەین: لەپێج خاڵان دا بەخوڵاصەیی و گوشراویی باسی ئەو گرووپە بکەین، کە هەر لە ڕۆژی سەرهەڵدانیەوە تاکو ئەم ڕۆژگارەمان، مشت و مڕ و بگرەو بەرەی زۆر، لەنێوان پەیڕەوان(أتباع) و نەیار و ڕەخنە لێگرانی دا، بەردەوامە:

١- پێناسە.

٢- دامەزراندن.

٣- بەرنامەو ئامانجەکانی حیزبی تەحریر.

٤- ئەو ڕەخنانەی کە گیراون و دەگیرێن، لە حیزبی تەحریر.

٥- شوێنی دەسەڵاتی (حیزبی تەحریر).

### ١- پێناسە:

{حزب التحرير: حزب سياسيٌّ إسلاميٌّ يدعو إلى تَبَنِّي مفاهيم الإسلام وأنظمته، وتثقيف الناس به والدعوة إليه، والسعي جِدِّيًّا لإقامة دولة الخلافة الإسلامية، معتمِداً الفكر أداة رئيسية في التغيير، وقد صدرت عنه انحرافاتٌ، كانت محلَّ انتقاد جمهرة علماء المسلمين}[1].

واتە: (حیزبی تەحریر)حیزبێکی سیاسیی ئیسلامییە، بانگەشە دەکات بۆ تەبەننیی کردنی چەمکە ئیسلامییەکان و، سیستمە ئیسلامییەکان و، هۆشیارکردنەوەی

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ج ١، ص ٣٤١- ٣٤٦.

خەڵك پێیان و، بانگەواز کردنی خەڵك بۆی، (واتە: بۆ ئیسلام)و هەوڵدانی جیددیی بۆ بەرپاکردنی دەوڵەتی جێنشینایەتیی ئیسلامیی، ئنجا بۆ ئەوەش بە پلەی یەکەم، پشت بە لایەنی فیکریی دەبەستێ لە گۆڕانکارییدا و، هەندێك لادانیان (لە بواری بۆچوون و فەتوادا) و لێوە دەرچوون، کە جێی ڕەخنەو گلەیی زۆربەی زانایانی مسوڵمانن.

٢- دامــەزراندن:

أ)- دامەزرێنەری حیزبی تەحریر: (الشيخ تقي الدين النبهاني)ە، کە لە ساڵی (١٣٢٦)ی کۆچیی دا، لەدایك بووە و لە ساڵی (١٣٩٧)ی کۆچیی دا، وەفاتی کردوە (واتە: (١٩٠٨) تاکو (١٩٧٧)ی زایینی) خەڵکی فەڵەستین بووە، لە دوای نسکۆی (١٩٤٨)ی زایینی، کە گەلی جوولەکە، قەوارەی زایۆنیی بنیاتنا، کۆچ دەکات بۆ شاری بەیرووت، دوایی دەبێتە ئەندام لە مەحکەمەی (استئناف)ی شەرعیی لە (بيت المقدس)، پاشان دەبێتە وانەبێژ (مدرِّس) لە کۆلێژی ئیسلامیی لە عەممان (پایتەخی ئوردن).

ب)- لە ساڵی (١٩٥٢)ی زایینیی دا، حیزبەکەی دادەمەزرێنێ، پاشان خۆی یەکلا دەکاتەوە بۆ سەرۆکایەتیی کردنی حیزب و، دەرکردنی کۆمەڵێك کتێب و لێکۆڵینەوە.

ج)-لەدوای کۆچی دوایی خۆی: (عبدالقديم زلّوم) کە ئەویش هەر فەڵەستینییە و، لە دەرچووانی (ئەزهەر)ە، دەبێتە سەرۆکی حیزب.

### ٣- بەرنامەو ئامانجەکانی حیزبی تەحریر:

دەتوانین لە دوو خاڵدا بەرنامەو ئامانجەکانی حیزبی تەحریر کورت بکەینەوە:

**یەکەم:** ئەوانیش وەك هەر لایەنێکی دیکەی ئیسلامیی، دەیانەوێ ژیانی ئیسلامیی دەست پێ بکەنەوە، لە ڕێی بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی یەوە، سەرەتا لە وڵاتانی عەرەبییداو، دوایی بنیاتنانی دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامیی، لە جیهانی ئیسلامییداو، پاشان هەڵگرتنی بانگەوازی ئیسلامیی بۆ هەموو وڵاتانی دنیا.

**دووەم:** قۆناغەکانی گۆڕانکاریی لەلای (حیزبی تەحریر) سێن:

**١-** خەباتی هزریی (النضال الفكري)ئەویش بەوە کە حیزب کۆمەڵێك چەمك و بیرۆکەی ئیسلامیی دەخاتە نێو کۆمەڵگاوە و، خەڵك و کۆمەڵگای پێوە سەرقاڵ دەکا، ئنجا خەڵك وردە وردە کارلێك (تفاعل) لەگەڵ ئەو فیکرەو بۆچوونانە دەکات.

**٢-** ئنجا کودەتایەکی فیکریی دروست دەبێ، لەئەنجامی کارلێککردنی کۆمەڵگا، لەگەڵ ئەو بیرۆکانەدا، کە حیزب خستوونیە ڕوو.

**٣-** بەدەستەوە گرتنی جڵەوی حوکمڕانیی لەڕێگای خەڵك و کۆمەڵگاوە، دوای ئەوەی خەڵك گۆڕانکاریی فیکریی بەسەردا هاتوە.

هەڵبەتە دوایی باسی دەکەین: کە بەڕاستیی ئەوە هەمووی لە خەون و خەیاڵەوە نزیکترە، تاکو شتی واقیعیی.

ئنجا (حیزبی تەحریر) پێی وایە لە قۆناغی سێیەمدا، پێویست بەوە دەکا کە داوای یارمەتیی بکرێ: یان لە سەرۆکی دەوڵەتێك، یان لە سەرۆکی کوتلەیەك، یان لە فەرماندەی کۆمەڵێك، یان سەرۆك هۆزێکی گەورە، یان هەر کەسێك کە هێز و دەسەڵاتێکی هەبێ (داوای یارمەتیی لێ بکرێ) بۆ ئەوەی: هاوکاربێ بۆ کودەتا کردن و، بەدەستەوە گرتنی جڵەوی حوکمڕانیی!

ئنجا ئەو حیزبە: لەسەرەتاوە سێزدە (١٣) ساڵی دانابوون، وەك چۆن قۆناغی مەککەیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سێزدە (١٣) ساڵ بوو، لە کاتی دروستبوون و دامەزراندنیەوە لە ساڵی (١٩٥٢)دا، سێزدە (١٣) ساڵی دانابوو! بەڵام دوایی کە تەماشایان کرد ناگەنە حوکمڕانیی، سێزدە (١٣)ەی دیکەشیان درێژ کردەوە و بووە بیست و شەش (٢٦) ساڵ، دوایی ئەوجار جارێکی دیکەشیان درێژ کردەوە و کردیانە: سی نۆ (٣٩) ساڵ، کە هەر نەشیگەیشتنێ!!

٤- ئەو ڕەخنانەی کە گیراون و دەگیرێن لە حیزبی تەحریر:

١)- پشتگوێ خستنی لایەنی ڕووحیی و پەروەردەیی و، تەنیا جەختکردنەوە لەسەر لایەنی فیکریی، کە من لەو بارەوە وتووێژی زۆرم لەگەڵیاندا کردوە، چ لە عێراقدا، چ لە دەرەوەی عێراقدا.

٢)- ئەندامەکانی حیزب زۆر خۆیان سەقاڵ دەکەن بە مشتومڕو موناقەشە لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکانی دیکەدا و، هەمیشە خەریکی شەڕە قسەن و، زۆر کەیفیان بە موجادەلە و شەڕە قسەدێ!

٣)- زۆر لە ئەندازەی خۆی زیاتر حەقیان بە عەقڵ داوە، لە بنیاتنانی کەسایەتیی ئیسلامییدا و، لە ڕووی عەقیدەییەوە و، لەو بارەوە لە ڕەوتی موعتەزیلەوە نیزیکن.

٤)- حیزب بۆ گەیشتن بە حوکم، پشت دەبەستێ بە هەندێ هۆکاری دەرەکیی، کە وەك گوتمان: زیاتر لە خەون و خەیاڵەوە نزیکن! ئاخر چ سەرۆك دەوڵەتێك یارمەتیی تۆ دەدا، یان چ سەرۆك هۆزێك هێزێکی وای هەیە؟! پێم وایە: (تقي الدين النبهاني) زیاتر قیاسی لەسەر ئەوە کردوە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة السلام)، کاتی خۆی سەرۆکی هەردووك هۆزی (ئەوس و خەزرەج) (سعد بن معاذ و سعد بن عبادة) هاتوون بەیعەتیان پێداوە! نەیزانیوە کە دنیا زۆر گۆڕاوە و، ئێستا دەبێ ئەو ئامراز و ئەو شێوازانە، گۆڕانیان بەسەردابێ،

شێوازو ئامرازەکان نابێ جموودیان لەسەر بکەین، کە دنیا گۆڕا، دەبێ شێوازو ئامرازەکانی تۆش بگۆڕێن، ئەگەرنا دینت لەژینت بەجێ دەمێنێ!

**٥)**- ئەو حیزبە: (فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە) پشتگوێ دەخات، دەڵێن: تاکو دەوڵەتی ئیسلامیی دەست بەکار دەبێ، ئەوکاتە ئەوە ئەرکی دەوڵەتی ئیسلامییە. کە(فەرمان بە پەسەند و ڕێگریی لە ناپەسند) بکات و پێش ئەوە، مسوڵمانان ئەو ئەرکەیان لەسەر پێویست نیە.

**٦)**- (گەیشتن بە حوکمڕانیی)یان کردوە بە ئامانجی سەرەکیی حیزب.

**کە** وەك پێشتریش باسمان کرد، گەلێك لە لایەنە ئیسلامییەکان، لەوەدا زێدەڕۆییان کردوە.

**٧)**- پێیان وایە: قۆناغی ڕۆشنبیرکردن (مرحلة التثقيف)، یەکسەر دەیانگوازێتەوە بۆ قۆناغی کارلێککردن لەگەڵ کۆمەڵگادا، یان کۆمەڵگا لەگەڵ فیکرەکانیاندا، ئنجا ئەویش دەیانگوازێتەوە بۆ قۆناغی حوکمڕانیی!

**کە** بێگومان وانیە و ئەوبیرکردنەوانە خەیاڵپڵاون و، پێشینانیش گوتوویانە: (کەس بە خەیاڵ نەبووە بەماڵ)!

**٨)**- دژایەتیی هەموو ئەو ڕژێمانە دەکەن کە لەسەر زەمینەکەیاندا دێن و دەچن و، هەموویان بە ناشەرعیی دەزانن و، لە ئەنجامی ئەوەش دا گرفت و کێشەی زۆریان بۆ دروست دەبێ.

**٩)**- هەندێك فەتوایان دەرکردوون، فەتوای سەیر و نامۆن، بۆ وێنە:

**یەك:** دەڵێن: ئاساییە پیاو تۆقە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا بکات، نەك هەر تۆقەی لەگەڵ بکات، ماچیشی بکات، بە ئارەزوو بێ، یان بەبێ ئارەزوو، بەمەبەستی چاك و چۆنیی!

**دوو:** دەگونجێ لە دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، سەرۆکێکی کافر هەبێ.

**سێ:** کەسێك کە دەچێتە نێو فەزا (فضاء)، بەفڕۆکە یان هەر ئامرازێکیی دیکە، نوێژی لەسەر لادەچێ.

**چوار:** ئەوانەی کە نیشتەجێی هەردوو جەمسەری دنیان: بەستەڵەکی سەروو و خوارووی دنیا، نوێژو ڕۆژوویان لەسەر نابێ، چونکە کاتەکانیان دیار نین، کە شەش مانگ شەوو شەش مانگ ڕۆژە، یاخود کەم و زیاتر.

**پێنج:** دروست نیە پارە و سامان دابنرێ و کۆ بکرێتەوە، با زەکاتیشی لێ دەربکرێ.

### ٥- شوێنی کاریگەریی (حیزبی تەحریر):

شوێنی کاریگەرییان وڵاتانی: سوریا و ئوردن و لوبنان، هەروەها لە ئەورووپاش، هەن بەتایبەت لە نەمساو ئەڵمانیا.

## ٤- کۆمەڵە جیهادییەکان (الجماعات الجهادية):

ئەمەیان دەمەوێ زیاتر حەقی پێ بدەم، لەبەر ئەوەی خۆتان دەزانن ئێستا مسوڵمانان گیرۆدە بوون بەدەست زۆر لەو گرووپ و دەستەو تاقمانەوە، کە بەحیساب جەنگ و جیهاد دەکەن، لە پێناوی خوادا، بەڵام بەداخەوە لە ئەنجامی کرچ و کاڵییان و، باش حاڵی نەبوونیان و، لە سۆنگەی چاك نەخوێندنەوەیانەوە، بۆ واقیع، ئەوە هیچ کە خۆیان بە هیچ ئامانجێك نەگەیشتوون، بەڵکو سەربارەش: مایەی سەرئێشەو دەردە سەرییەکی زۆریشن بۆ مسوڵمانان!

هەڵبەتە ئەو لایەن و کۆمەڵ و ڕێکخراوە ئیسلامییانەی، کە لەژێر ناوونیشانی و جەنگ و جیهاد لەڕێی خوادا (القتال في سبيل لله)دا، خۆیان دەبیننەوە، زۆرن چونکە لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی مسوڵماناندا، ستەم و چەوساندنەوەیەکی بێڕەزای نێوخۆیی و دەرەکیی، کەوتۆتە سەر مسوڵمانان و، مسوڵمانانیش یەکێ لە شێوازەکانی بەرەنگاربوونەوەی ئەو ستەم و دەستدرێژییەیان، بریتیە لە جەنگ و فیداکاریی و بەرخۆدان، ئنجا دیارە دەگونجێ ئەو جەنگ و جیهادە، زەمینەی ڕەخساو بێ و لەجێی خۆیدا بێ و، دەشگونجێ زەمینەی بۆ نەڕەخسابێ و، شتێکی بێجێ بێ، کە بەداخەوە پێم وایە بێجێیەکەی زۆر زیاترە لە بەجێیەکەی! دەشتوانین ئاماژە بە هەندێك لەو کۆمەڵ و جموجۆڵە جیهادییانە بکەین:

١)- (الجماعة الإسلامية) لە میصر، کە لە زانکۆکانی میسڕدا لە سەرەتای حەفتایەکاندا پەیدا بوو.

٢)- (حركة المقاومة الإسلامية في فلسطين) کورتکراوەکەی (حماس)ە، کە لە: ١٩٨٧/١/١٤ی زایینیدا خۆی ڕاگەیاند و پێشتر (خالد مشعل) (أمين عام)ی ئەم بزووتنەوەیە بوو، ئێستا (إسماعيل هنيّة)یە.

٣)- (حركة الجهاد الإسلامي) هەر لە فەڵەستین، کە (أمين عام)ەکەی: (رمضان شَلَّح)ە.

٤)- یەکی دیکەش لەوانە: (حزب الله)ی لوبنانیی یە، کە(حسن نصر الله) سەرۆکایەتیی دەکات و پێشتر بەناوی: (حرکة الأمل)ەوە بووە.

٥)- (تنظیم القاعدة)کە ئێستا (أیمن الظواهري) بەرپرسیەتی.

دیارە زۆری دیکەش هەن، بەڵام ئەوانە زیاتر ناوبانگیان هەیەو دیارن، ئەوانەش: هەیانە کارەکەی زۆر بە جێیە، بە بۆچوونی من، وەك:

١- (بزووتنەوەی بەرهەڵستیی ئیسلامیی) لە فەلەستین.

٢- هەروەها (بزووتنەوی جیهادی ئیسلامیی) هەر لە فەلەستین، چونکە دیارە جوولەکە وڵاتی مسوڵمانانی داگیر کردوە.

٣- (حزب الله) کاتی خۆی لە لوبنان، هەتا دژی جوولەکە بوو، ئەویش دەوری خۆی دەبینی[1]، بەڵام پێم وایە هەشیانە کارەکەی زۆر بێجێیە و، مسوڵمانان زۆری لەسەری قەرزدار بوونەوە.

ئێستاش هەوڵدەدەین لە دە (١٠) کورتە خاڵاندا، ئەوەی بە هەق و ڕاستیی دەزانین لەبارەی جەنگ و جیهاد و کۆمەڵە جیهادییەکانەوە، بیخەینە ڕوو:

**یەکەم:**

هەر چەندە لە ئەسڵدا جەنگ و جیهاد ئەرکی دەوڵەتە لە ئیسلامدا، بەڵام لەکاتی نەمانی دەوڵەتداو، دەستدرێژیی کرانە سەر مسوڵمانان، لەسەریان پێویستە بەرگریی لە خۆیان و دین و ژینیان بکەن، ئەوەش سێ بەڵگە لەوبارەوە:

١- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ الحج.

---

(١) بەڵام دوایی کە خۆی کردە قەڵغان و سوپەر و بەڵاگێڕەوەی ڕژێمی بەعسیی لە سووریا، عەیبەیەکی گەورەی بەسەرهات و، نیشانەی پرسیاری زۆری خستە سەرخۆی!

واتە: بێگومان خوا بەرگریی دەکا لەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، بێگومان خوا هیچ خیانەتکارێکی سپڵەی خۆش ناوێ، مۆڵەت درا بۆ ئەوانەی کە جەنگیان لەدژ دەکرێ و ستەمیان لێ کراوە، (کە بەرگریی لە خۆیان بکەن) و، بێگومان خوا لەسەر یارمەتیدانی ئەوان بەتوانایە.

کەواتە: ئەگەر ستەم هەبوو، دەستدرێژیی هەبوو، خوای پەروەردگار مۆڵەتی داوە، کە مسوڵمانان بەرگریی لە خۆیان بکەن.

٢- خوا سبحانە و تعالى لەسوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٠)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠﴾.

واتە: لە پێناوی خوادا لە دژی ئەوانە بجەنگن کە لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژیی کارانی خۆش ناوێ.

٣- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: {لَنْ يَبْرَحَ هَذَا الدِّينُ قَائِمًا يُقَاتِلُ عَلَيْهِ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ} أخرجه مسلم برقم (١٩٢٢).

واتە: ئەم ئایینە بە پێوە دەمێنێتەوە، کۆمەڵێك لە مسوڵمانان لە پێناویدا دەجەنگن، تاکو ئاخیر زەمان (ساعة)[١] دێت.

هەڵبەتە ئەمانە وەك نموونە، ئەگەرنا بەڵگەمان زۆر زۆرن، کە مسوڵمانان لەسەریان پێویستە جەنگ و جیهادیان هەبێ، لە کات و شوێنی خۆیداو بەمەرجی خۆی.

---

(١) (ساعة) جیایە لە (قیامة)، واتە: تا ئاخیر زەمان دێت، هەتاکو ئەم دنیایە دەپێچرێتەوە.

**دووەم:**

بەڵام بێگومان بڕیاردانی جەنگ و فیداکاریی، مافی هەموو کەسێك نیەو، پێویستە مشوور خۆرو زاناو پێشەوایانی بوێری مسوڵمانان، ئەو بڕیارە بدەن، پاش هەڵسەنگاندنێکی وردبینانەو دووربینانەی واقیعی کۆمەڵگاکەیان و، هەل و مەرجی نێوخۆ و دەرەکییان.

زۆر جار لە ئەنجامی ئەوەدا، مسوڵمانان لە ئەنجامی ئەو جەنگ و جیهادە فیداکارییە پەشێمان بوونەوەو لەسەری قەرزار بوونەوە، کە کەسانێك بڕیاریان داوەو، کەسانێك جاڕیان بۆ داوە کە شایستە نەبوون و، کاتەکەی گونجاو نەبووەو، شوێنەکەی لەبار نەبووەو، هۆکارەکانی تەواو نەبوون.

**سێیەم:**

شایانی باسە کە هەڵستان بە جەنگ و بەرخۆدان بەمەبەستی گۆڕین و چاکسازیی و پاکسازیی تێدا کردنی کۆمەڵگا، کە ژمارەیەك لە لایەنە جیهادییەکان کردوویانەتە پیشە، هەڵەیەکی گەورەو کوشندەیەو، پێچەوانەی بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێ.

چونکە: جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا بۆ ئەوە نیە قەوارەی سیاسی پێ دروست بکرێ، کە زۆر لە لایەنە جیهادییەکان بە زۆریی بۆ ئەو ئامانجە کردوویانە! بەڵام هەرگیز بۆ چاککردنی کۆمەڵگا، ناگونجێ پەنا ببرێتە بەر هێز، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وایان نەکردوە، بەڵکو پێغەمبەران لەبەرامبەر هەڕەشەو هێزی نەیارانیشیاندا، ئەوەیان نەکردوە، نەك هەر دەستپێشخەر نەبوون، بەڵکو سیاسەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و هەڵوێستی چەسپاوو نەگۆڕیان ئەوەیە کە لە ئایەتی ژمارە (١٢)ی سووڕەتی (ابراهیم)دا خوا دەفەرموێ، دوای ئەوەی دیالۆگ و وتووێژی نێوان هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاە السلام)، لەگەڵ هەموو نەیارەکانیاندا دێنێ، کە تاکە شوێنە کە لە قورئاندا ئەوە هەبێ، دوایی خوا لەسەر زمانی پێغەمبەران دەفەرموێ:

﴿ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ إبراهيم.

واتە: بەتەئکید خۆڕاگر دەبین هەرچەندە ئێوە ئەزیەتمان بدەن و، با پشت بەستووانیش تەنیا پشت بەخوا ببەستن.

کەواتە: پێغەمبەران (علیهم السلام) لە بەرامبەر ئازاری نەیارانیاندا گوتوویانە: خۆ ڕا دەگرین نەیانگوتوە: تۆڵەتان لێ دەستێنینەوە، یان لە بەینتان دەبەین!

**چوارەم:**

هەر بۆیە سەرجەم ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانەی بە مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی و جێ بەجێ کردنی شەریعەت، هێزیان بەکارهێناوە، لەجێی خۆیدا نەبووەو، زیانی گەورەی لە ئیسلام و مسوڵمانان داوەو، لە ئەنجامی ئەوەشدا بەشێکیان هەڵساون بە چاو بەخۆدا گێڕانەوە (مراجعة)، بۆ نموونە: (الجماعة الإسلامية في مصر) کۆمەڵێك کتێبیان دەرکردوون بەناوی (المراجعات).

**پێنجەم:**

هەندێ گرووپ و ڕێکخراویش هەن، کە بە ڕەفتارو لادان و تاوانی پەڕگیرییانەیان، بوونەتە پەڵەیەکی ڕەش بەنێوچاوانی مسوڵمانانەوەو، کارێکیان بە ئیسلام و مسوڵمانانەوە، کردوە هەرگیز دوژمن ئەوەی پێ نەکردوون، وەك گوتراوە: {قد يبلغ الجاهِلُ من نفسه، ما لا يبلغ منه عدوّهُ} واتە: نەفام شتی وا بەخۆی دەکات، دوژمنی پێی نەکرێ وای لێ بکا، بەتایبەت ڕێکخراوی (القاعدة) پاشان زۆر خراپتر لەوانیش: ڕێکخراوی (داعش)، پاشان (بۆکۆ حەڕام) و ئەوانی دیکە کە هاوشێوەی ئەوانن، کە پێم وایە: هیچیان نەگەیونە داعش، لە پەڕگیریی و تێپەڕاندن و شێواندنی ئایینی خواو ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە چاوی خەڵکی دنیادا.

ڕەنگە یەکێ بڵێ: بۆچی باسی میلیشیاکانی شیعەکان ناکەی؟ دەڵێم: بۆیە باسی ئەوان ناکەم، چونکە نەمبیستوە ئەوان بڵێن: ئێمە جیهاد لەپێناوی

ئیسلامدا دەکەین، هەرچی (الحشد الشعبي) و میلیشیا شیعییەکانن هەمووی لە پێناوی ئیمام (حسین) و، ئیمام فلان و فلانەو، نەمبیستوە هیچ کامیان جەنگکردنەکەی لە پێناوی خوادا بێ، باسی (حزب الله)شم کرد، وەختێ خۆی کە لەبەرامبەری جوولەکەدا، دەوری خۆی بینی لە خوارووی لوبنان، هەموو لایەك پێمان خۆش بوو، بەڵام دوایی ئەویش سەری لەخۆی شێواندو، بوو بە پارێزەری ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرییەی سووریا.

**شەشەم:**

هەڵبەتە ناشڵێم هەرگیز ئیسلام بەکارهێنانی هێزو پەنا پێ بردنی، بۆ مسوڵمانانی بێ قەوارەو دەوڵەت، بەڕەوا نازانێ، یانی: ناڵێم: هەتا مسوڵمانان دەوڵەتیان نەبێ، نابێ جەنگ و جیهاد بکەن! بەڵێ: ڕاگەیاندنی جیهاد، ئەرکی دەوڵەتە، بەڵام واش نیە کە مسوڵمانان مادام دەوڵەتیان نەبێ، قەوارەی سیاسییان نەبێ، دەبێ دەست بۆ چەك نەبەن! بەبەڵگەی ئەوە کە خوا سبحانە وتعالی لە ئایەتی ژمارە (٣٩)ی سوورەتی (الشوری)دا، لە پێناسەی ئیمانداراندا، دە (١٠) سیفەتیان لێ هەڵدەدا، سیفەتی دەیەمیان ئەوەیە کە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾.

پێشێ نۆ (٩) سیفەتیان لێ هەڵدەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الشوری.

پاشان لە سیفەتی دەیەمیان دا دەفەرموێ: ئەوانەی کە کاتێ دەستدرێژییان کرایە سەر، تۆڵە دەستێننەوەو بەرگریی لە خۆیان دەکەن، ئنجا ئەوە زۆر جێی سەرنجە!

لە شاری مەککە جارێ ئیزن و مۆڵەت نەدراوە مسوڵمانان جەنگ و جیهاد بکەن، بەڵام دەبێ: بەرگریی لە خۆکردن و، مل نەوی نەکردن بۆ دەستدرێژیی و ستەم، سیفەتێك بێ مسوڵمانانی لەسەر پەروەردە بکرێن، چ لە مەککە بن، چ لە مەدینە بن! چونکە ئەگەر لە قۆناغی مەککەدا، مسوڵمانان لەسەر فیداکاریی و غیرەت، پەروەردە نەکرێن، دوایی لە قۆناغی مەدینەش جەنگ و جیهاد ناکەن، واتە: لەسەریشیان پێویست بێ، هەر نایکەن!

مەبەستم ئەوەیە کە هەندێ لایەنی ئیسلامیی جۆرێك لە هەستیارییان هەیە، بەرامبەر بە هەرچی ئایەتی جیهادو جەنگ و فیداکارییە و، هەرئایەتێ تۆزێ زبریی تێدا بێ، پێیان خۆشە لە نوێژێشدا نەیخوێنن!! کە بێگومان ئەوە جۆرێکە لە تێکشکان و بەزین لە بەرامبەر ئەهلی کوفرێکدا، کە دنیایان پڕ کردوە لە بنکەی سەربازیی، ئەمریکا بۆ چی کوێخایەتیی بەسەر دنیادا دەکا؟ چونکە: تەماشا بکەن! هەموو شوێنە گرنگەکانی دنیا، بنکەی سەربازیی ئەمریکایان لێیە، کەواتە: لەبەر ئەوە نیە زۆر دیموکڕاسییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە زۆر بەهێزە!

یان قەوارەی جوولەکە، ئەو هەموو دەوڵەتە عەرەبییانەی بەچۆکدا هێناون، لەبەر ئەوەی دەڵێ: چەکی نیۆکیی (السلاح النّووي)یم هەیە، هەر بجوولێن، پێتان دادەدەم!

ئنجا سەیر ئەوەیە، زۆر کەس لە ترسی مردنێ مردوە، ئێستا ئەو دەوڵەتە عەرەبییانە، لەوەتەی جوولەکە دەڵێ: پێتان دا دەدەم، لە ساڵی (١٩٤٨ز)ەوە، نازانم لە کەیەوە چەکە نەوەوییەکەی پەیدا کردوە، ئەوانە هەر زەبوون و بەچۆکدا هاتوون، هیچیشی پێدانەداون!

بەڵێ ئێمە ناڵێین: مسوڵمانان تاکو دەوڵەتیان نەبێ و، قەوارەی سیاسییان نەبێ، نابێ جەنگ و جیهاد بکەن، چونکە مسوڵمانان دەبێ بەرگریی لە خۆیان بکەن، بەڵام بێگومان: بەکارهێنانی هێز، قەوارەی سیاسیی تەندروستی پێ نایەتە دی و دەڵێین:

بەکارهێنانی هێز ڕێیەکی سروشتیی و ئاسایی نیە، بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی و، دەوڵەتی ئیسلامیی دەبێ لەسەر بناغەی تێگەیاندن و پێگەیاندن و، بەرچاو ڕوونکردنەوەی خەڵك و، قەناعەت پێ هێنانی خەڵك بنیات بنرێ.

بەڵام لەکاتێك دا مسوڵمانان لە شوێنێك، بۆ وێنە: لە فەڵەستین، لە کشمیر، لە شیشان، زوڵمیان لێ دەکرێ، ئایا دەبێ بەرگریی لە خۆیان نەکەن؟ ئێمە لەم کوردستانەدا، کاتی خۆی زوڵممان لێ دەکرا، ئایا دەبوو دەست بەخۆمان دا بەردەینەوە؟ بە تەئکید نەخێر.

**حەوتەم:**

گوتراوە: (هەر عەقڵە، لە خەسارێك) هەروەها گوتراوە: (مَنْ جَرّب المُجَرّب حلّت به النّدامة)، (هەرکەس ئەزموونکراو ئەزموون بکاتەوە، پەشێمانیی دەکێشێ).

بۆیە لەسەر لایەنە جیهادییەکان پێویستە: پەند لە هەڵەو ئەزموونە تاڵەکانی ڕابردوویان وەربگرن و، چی دیکە باجی: لادان لە ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم السلام)و، سواری ئەسپی سۆزو دڵگەرمیی و هەڵچوون بوون، نەدەن و، ئیسلام ناشیرین و، مسوڵمانان سەغڵەت و، ناحەزانیش دڵخۆش نەکەن.

**هەشتەم:**

بەڵام لەو لاشەوە: نابێ بەهۆی شکست و فەشەلی ئەزموونە جیهادیی و چەکدارییە حیساب بۆ نەکراوو بێجێیەکانەوە، ڕووحی جەنگ و فیداکاریی لەخۆماندا بمرێنین و، کاتێك زەمینەشی بۆ ڕەخسا، هەر نەتوانین ئەنجامی بدەین!

**نۆیەم:**

گەورەترین هەڵەی کۆمەڵ و گرووپە جیهادییەکان، ئەوە بووە کە زۆر جار کۆی ئیسلامیان لە جەنگ و جیهادو بەرخۆداندا، کورت هەڵێناوە و، ئەو ئەرکەیان زۆر لە قەوارەی خۆی گەورەتر کردوە و کە ئامراز بووە، کردوویانە بە ئامانج.

دەیەم:

بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی مسوڵمانان لەگەڵ واقیعێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی، نا ئیسلامیی، داسەپاودا، بێجگە لە هەڵکردن و مەدار کردن و خۆڕاگریی (المداراة والصّبر) هیچ ڕێیەکی دیکەی ڕاست و دروستمان لەبەردەستدا نیە، چونکە لە حاڵێکی وادا، تەنیا چوار (٤) ئەگەرمان لە پێشن:

١)- ڕاکردن لە کۆمەڵگا، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت، بڕۆین کۆمەڵگا بەجێ بهێڵین!.

٢)- ملکەچ بوون بۆ ناشەرعییەکانی کۆمەڵگاو، تێدا توانەوەی.

٣)- بەگژداچوونەوەی کۆمەڵگاو بەرەنگاربوونەوەی بە هێز.

٤)- مەدارکردن و خۆڕاگریی و سەرگەرم بوونی پاکسازیی و چاکسازیی.

تەنیا ئەم چوار ڕێیەمان لەپێشن و، بێگومانیش لەو چوار بژاردەیە، تەنیا چوارەمیان ڕاست و ڕەوایەو، لەگەڵ عەقڵ و نەقڵدا گونجاوو تەبایە، با سەرنج بدەین:

## ١/ ئەگەری یەکەم: ڕاکردن لە کۆمەڵگا:

ئەگەر بۆ ژمارەیەکی کەمی وەك هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف)، گونجاو بووبێ بچن بۆ ئەشکەوتێك، مسۆگەر: ئەوە بۆ خەڵکێکی زۆری هەزاران کەسیی، ناگونجێ، زۆر جاران گوتوومە: چ ئەشکەوتێك دەمانگرێ؟! پاشان لەو ئەشکەوتەدا ئەو خەڵکە چۆن دەحەوێتەوە؟! ئنجا هاوەڵانی ئەشکەوت، خرابوونە نێوان دوو بژاردەوە، کە وەك عەرەب دەڵێن: (أحلاهُما مُرٌّ) شیرینترەکەیان، تاڵ بوو!

وەك خوای خوای زانای کارزان لەسەر زمانی وان فەرموویەتی:

﴿ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا ۝٢٠ ﴾ الكهف.

واتە: بێگومان ئەگەر (دوژمنانی کافر) پێتان بزانن، یان بەردبارانتان دەکەن، یاخود کافرتان دەکەنەوە و، ئەوکاتیش هەرگیز سەرفراز نابن.

بەڵام ئێمە نەخراوینە نێوان ئەو دوو بژاردەیەوە، هەتا هیچ چارمان نەمێنێ و پەنا ببەینە بەر ئەشکەوت، دینداریی و مسوڵمانەتیی خۆمان دەکەین، هەرچەندە نارەحەتیی و گرفتارییش هەر دەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە وامان لێ نەهاتوە هیچ چارمان بەدەستەوە نەبێ، جگە لە ڕاکردن و سەری خۆ هەڵگرتن.

## ٢/ ئەگەری دووەم: ملکەچ بوون بۆ ناشەرعییەکانی کۆمەڵگاو تێدا توانەوەی:

هەرگیزو بە هیچ جۆرێك ڕەوا نیە مسوڵمانان مل بۆ ناشەرعیی بدەن و، لێی بێ دەنگ بن، چونکە تایبەتمەندیی ترین سیفەتی بڕواداران، بریتیە لە فەرمان کردن بە پەسند و، ڕێگرتن لە ناپەسند، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ .. ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار: هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە پەسەند دەکەن و ڕێگریی لە ناپەسەند دەکەن.. بەڵێ بەهیچ جۆرێك بواری تێدا نیە، لەبەر ئەوەی بێ دەستەڵاتین، لەو کۆمەڵگایانەدا کە تێیاندا دەژین، بتوێینەوە و هیچ هەڵوێستێکمان نەبێ، بەرامبەر بە ناشەرعییەکان و ستەم و خراپەکارییەك کە دەکرێ!

## ٣/ ئەگەری سێیەم: بەگژدا چوونەوەی کۆمەڵگاو بەرەنگار بوونەوەی بەهێز:

دیسان ئەوەش دروست نیە، چونکە ئەوە پێچەوانەی ڕێبازی سەرجەم پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، کە هەر لە ئادەمەوە تاکو خاتەم، هیچ پێغەمبەرێك بەهێز لەگەڵ کۆمەڵگای خۆیدا ڕوو بەڕوو نەبۆتەوە، هەر چەندە دوژمنانیشیان هەڕەشەیان لێ کردوون، باتەماشا بکەین:

**یەك:** لە سووڕەتی (إبراهیم)دا هەموو دوژمنانی پێغەمبەران، هەڕەشە دەکەن لە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و، لە ئایەتی (١٣)دا، پێیان دەڵێن:

﴿ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ﴾

واتە: لە سەر زەمینی خۆمان دەرتان دەکەین، یاخود دەگەڕێنەوە سەر ڕێبازەکەی ئێمە.

**دوو:** لە سووڕەتی (الأنبیاء) ئایەتی (٦٨)دا، هەڕەشەی سووتاندن لە (إبراهیم) دەکەن:

﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

واتە: بیسووتێنن و پەرستراوەکانتنان سەربخەن، ئەگەر دەتانەوێ شتێك بکەن.

**سێ:** لە سووڕەتی (الشعراء) ئایەتی (٢٩)دا، فیرعەون هەڕەشەی گرتن لە مووسا سەلامی خوای لێبێ، دەکا:

﴿ لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴾

واتە: دەتخەمە گەڵ زیندانییەکان، یانی: زۆری دیکەشم گرتوون!

٤/ کەواتە: مایەوە ئەگەری چوارەم، کە بریتیە لە خۆڕاگریی و بەردەوام بوون لەسەر پاکسازیی و چاکسازیی:

وەك: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە گشتی فەرموویانە:

﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا﴾ (إبراهيم:١٢).

واتە: بەدڵنیاییی هەرچەندە ئازارمان بدەن، هەر خۆڕاگر دەبین.

پێغەمبەری خۆشمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویّ: {الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، خَيْرٌ مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ} أخرجه أحمد برقم (٥٠٢٢)، والترمذي برقم (٢٥٠٧)، وابن ماجه برقم (٤٠٣٢)، قال الألباني: صحيح.

واتە: ئەو بڕوادارەی کە لەگەڵ خەڵك تێکەڵ دەبێ و، خۆڕاگریش دەبێ، لەسەر ئازاریان، چاکترە لەو بڕوادارەی کە لەگەڵیان تێکەڵ نابێ و، خۆشی ڕاناگرێ لەسەر ئازاریان.

هەڵبەتە ئەو مودارایەش، حاڵەتی جۆراو جۆر و، شێوازی جۆراو جۆر، بەخۆوە دەگرێ و، پێویستیی بە وردەکاریی زۆر دەکا، کە ئێمە ئێستا بابەتەکەمان ئەوە نیە، تاکو باسی بکەین، بەڵکو لەباسی ئەوەدا بووین، کە کۆمەڵ و گرووپە جیهادییەکان، بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە لە ڕێی بەکارهێنانی هێزەوە، کۆمەڵگا بگۆڕن و پاکسازیی و چاکسازیی تێدا بکەن و، لە ڕێگای بەرکاهێنانی هێزەوە، قەوارەی سیاسیی دروست بکەن، کە بێگومان ڕێی پێغەمبەران، سەلامی خوایان لێبێ، وانیە.

ڕەواندنەوەی تەم و مژی وەهمێك:

زۆربەی مسوڵمانان پێیان وایە: لەکاتی جەنگ و جیهاددا نەبێ ئێمە تووشی: زیندانیی و گرتن و دەرکران و نانبڕان و کوژران، نابین!

بەڵێ بەداخەوە: زۆربەی مسوڵمانان پێیان وایە: دەرکران و، کوژران و، بریندارکران و، گیران، لەڕووی ئابوورییەوە زەڕبە لێدران و، سەغڵەت کران، تەنیا لەکاتی جەنگ و جیهاددا دەبێ، کە بەتەئکید وانیە، تەماشا بکەن!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی لە شاری مەککە کافرەکان ئابڵووقە (حصار)یان خستنە سەر، ئابڵووقەی ئابووریی، هەتا وایان لێ هات: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەڵێ: شەوێك چوومە دەرێ بۆ تارەت گرتن، میزەکەم بە شتێك دەکەوت، دەنگی لێ دەهات، کە تەماشام کرد دیتم: پارچە چەرمێکە، ئیدی بردمەوە، جوان جوان شۆردم و برژاندم، سێ چوار ڕۆژم بە خواردنی ئەو پارچە چەرمە گوزەراند![1] هەروەها هاوەڵان گوتوویانە: گەڵای درەختمان دەخوارد! ئاشکراشە لە حاڵەتی جەنگ و جیهادیشدا نەبوون و، ئابڵووقەشیان خراوەتەسەر!

هەروەها (یاسر و سمیة) دایك و بابی (عَمّار) هەردووکیان لەژێر ئەشکەنجەدا کوژران، خوا لێیان ڕازی بێ، عەممارییشیان هێندە نارەحەت کرد، هێندەیان ئەشکەنجەدا، هەتا ئەوەی کە کافرەکان لێیان دەویست، گوتی، کەقسە گوتن بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و مەدحی بت و صەنەمەکان بوو! دوایی چووە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەچاوی بە گریانەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) بۆخۆت دەزانی دایك و بابم کوژران [کۆیلەو بێکەس بوون] منیش ئەشکەنجە درام تاکو گەیشتمە لێواری مەرگ،

---

(١) بڕوانە: حلیة الأولیاء، لأبي نعیم، ج١ص٩٣، هەروەها بڕوانە: حیاة الصحابة، ج١ص٢٩٥، محمد یوسف الکاندهلوي.

ئیدی هەندێك شتم گوت، کە ئەوان پێیان خۆش بوو، [یانی: لێم ڕازی بوون کە نەمکوژن] پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: {كَيف تَجِدُ قَلْبَكَ؟} واتە: دڵی خۆت چۆن دەبینی؟ گوتی: {مطمئناً بالإيمان}، دڵم بە ئیمان ئارام گرتوویە، فەرمووی: {فإنْ عادوا، فَعُدْ} ئەگەر ئەوان دووبارە تۆیان ئەشکەنجە دایەوە، تۆش دووبارە ئەو قسانە بکەوە، کەئەوان لە کۆڵ خۆت بکەیەوە، ئنجا بەهۆی ئەوەوە ئەم ئایەتە موبارەکە هاتە خوار[1]:

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل.

کەواتە: مەرج نیە ئینسان تەنیا لە جەنگ و جیهاددا، تووشی هەژاریی و نەداریی و تووشی کوژران و ئەشکەنجە ببێ.

ئنجا تەماشا بکەن! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {سيد الشهداء حمزة بن عبد المطلب، ورجل قام إلى إمام جائر فأمره ونهاه فقتله} أخرجه الحاكم برقم (٤٨٨٤) وقال: صحيح الإسناد، قال الألباني صحيح.

واتە: سەرودری شەهیدان حەمزەی کوڕی (عبدالمطلب)ە، ئنجا (دوای حەمزە) پیاوێکە هەڵدەستێ بۆ حوکمڕانێکی ستەمکار، فەرمانی پێ دەکات و ڕێگریی لێ دەکا، ئەویش دەیکوژێ.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو پیاوە و، حەمزەی مامی پێکەوە خستوونە دوو تای تەرازوویەکەوە!

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ حَقّ (أو كلِمةُ عَدْلٍ) عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ} أخرجه أبو داود برقم (٤٣٤٤)، وابن ماجه برقم (٤٠١١)، وأخرجه أيضا: الديلمي برقم (١٤٤٨)، قال الألباني: صحيح.

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٢ص٤٢٣، هەروەها: ابن سعد في (الطبقات الكبرى) (٢٤٩/٣) والطبري في (جامع البيان) (١٢٢/١٤). وأبو نعيم في (١٤٠/١). بەڵام دوو نووسەرەکانی گوتوویانە: (هذا إسنادٌ ضعيف).

واتە: گەورەترین جیهاد گوتنی قسەیەکی هەقە (یان قسەیەکی دادگەرانەیە) لەلای حوکمڕانێکی ستەمکار.

کەواتە: برایان و خوشکانی بەڕێز!

با پێمان وانەبێ، ئەگەر چەکمان بەشانەوە نەبێ و لە سەنگەرێدا نەبین، تازە مەترسییمان لەسەر نیە! نا، مەترسیی مەرگ و گیران و، دەرکران و برینداربوون و هەژاریی و نەداریی و...هتد، ئەوانە هەموویان لەڕێدا دەبن، ئەگەر ئینسان ڕاست بکات لەگەڵ ئایین و بەرنامەی خوادا و، لەگەڵ ئیمان و عەقیدەی خۆیدا ساغ بێ، هەڵبەتە ئەو پێغەمبەرانەش (علیهم السلام) کە کوژراون وەك: زەکەریاو یەحیا، هەروەها (یوسف) کە دەگیرێ، دیسان پێغەمبەرانی دیکە کە دەردەکرێن و، بەرد باران دەکرێن و، نارەحەت دەکرێن، (علیهم السلام) بەدڵنیاییی هەموویان ئیعلانی جەنگ و جیهادیان نەکردوە، بەڵکو ئەو کەسەی کە ئیعلانی جەنگ و جیهاد بکات، کافران دەستیان نایگاتێ!

بەڵێ گرنگە بزانین: کە مەرج نیە ئێمە تەنیا لەکاتی جەنگ و ڕوو بەڕووبوونەوەی چەکدارییدا، تووشی مەترسیی مەرگ و لەبەین چوون و، بریندار بوون و، مەترسییەکانی دیکە، ببین، بەڵکو ئەگەر ئینسان لەگەڵ ئایین و بەرنامەی خوادا ڕاست بکات، هەمیشە ئەوانەی هەر لە ڕێدان، هەمیشە ئەگەری هەیە: بکوژرێی، دەربکرێی، بگیرێی، قسەت پێ بگوترێ، نارەحەت بکرێی، هەژار بکرێی، نان بڕاو بکرێی...هتد.

با وەك قسەیەکی خۆش بۆتان بگێڕمەوە: ڕۆژێك کۆمەڵێك مامۆستا هاتن، لەو مامۆستایانەی لەسەر مینبەرەکان، لایانداون، منیش تۆزێ دڵم دانەوەو گوتم: هەر کامێك لە ئێوە ئەوانەی کە دەرکراون، بەمەرجێك ئەو دەرکرانە لەسەر ئەو مینبەرەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەتای خۆتان نەبووبێ. [چونکە هەندێك مامۆستاش هەن قسەی بێ ڕێ و جێ دەکەن، تەشهیر بەخەڵك دەکەن، یان قسەی ناڕێك و پێك دەکەن و، بیانوو بەدەستەوە دەدەن، قسەم لەوانە نییە،[1] بەڵام

---

(١) هەڵبەتە ئەوانیش دوو جۆرن:

ئەوەی کە باجی غەڵەتی خۆی نەدات و، باجی حەق گوتن بدات] ئەوە هەمووی مەدالیای شەرەفە پێتان هەڵواسراوە، وابزانن کە مەدالیایەکتان پێوە هەڵواسراوە، لە قیامەتێ، زۆر چاك دێتەوە ڕێتان، کە یەکێکتان بڵێ: خوایە! لەسەر قسەی حەق، لەسەر ئەوەی بەرگرییم لە ئایینی تۆ و لە بەندە ستەمدیدەکانی تۆ دەکرد، لەسەر مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنامیانە خوارێ!

هەڵبەتە ئەوانیش دڵیان پێ خۆش بوو، دوایی تەماشام کرد گوتم: ڕەنگە هەندێکتان مابن نەیانهێنابنە خوارێ، بەڵام مەرج نیە ئەوەی نەهاتبێتە خوارێ، بێبەش بووە، گرنگ ئەوەیە ئینسان لەسەر حەق گوتنی خۆی، بەردەوام بێ.

## کۆمەڵی ئیسلامیی خۆی لە کوێدا دەبینێتەوە؟

بەڕێزان! ئێمە لە ڕابردوودا، باسی چوار تەوژم لە تەوژمە سەرەکییە ئیسلامییەکانمان کرد، کە لە واقیعی ئەمڕۆماندا هەن، کە بریتین لە:

١- ئەهلی تەصەووف.

٢- تەوژمی سەلەفیی.

٣- کۆمەڵی تەبلیغ.

٤- کۆمەڵی نوور.

هەروەها باسی چوار لە لایەنە ئیسلامییەکانیشمان کرد:

١- برایانی مسوڵمان.

٢- کۆمەڵی ئیسلامیی پاکستان.

٣- حیزبی تەحریر.

٤- کۆمەڵە جیهادییەکان.

---

جۆرێکیان کە کەین و بەینێکیان لەگەڵ ڕژێم و دەستەڵاتدا هەبێ، ئەوانە گوێیان نادرێتێ و چاوپۆشییان لێ دەکرێ، جۆرێکیدیشیان کە بەنەیار و دژی دەستەڵات دادەنرێن، ئەوانە بۆیان لە بۆسەدان!

ئنجا ئایا (کۆمەڵی ئیسلامیی) خۆی لە کوێدا دەبینێتەوە؟!

دەڵێین: مەرج نیە ئێمە لە ژێر هیچ کام لەو ناوونیشانانەدا، خۆمان ببینینەوە، چونکە ئێمە هەڵقوڵاوی واقیعێکی جیاین، لەو واقیعانە و لەو شوێنانەی کە ئەو ئەزموونە ئیسلامییانەیان تێدا پەیدا بوون، پێم وایە وەك چۆن فەتوا، بەپێی شوێن و شەخس و حاڵ و ژینگە، دەگۆڕێ، ئەوە لەپێشترە کە: ئەزموونی چالاکیی و کاری ئیسلامیی، زیاتر جۆراو جۆر بێ و بگۆڕێ و، پێم وایە، هیچ کات شتێکی ڕەواو دروست نیە، هیچ کام لە لایەنە ئیسلامییەکان، ئەزموونی یەکدی کۆپی بکەنەوە، بۆیەش وا دەڵێم، چونکە ئێستا زۆر جار باسی ئەوە دەکرێ کە (حیزبی دادو گەشەپێدان) لە تورکیا، هەروەها لە (مەغریب) لەو دوو وڵاتە، ئیسلامییەکان گەیشتوونە حوکمڕانیی، ئنجا ڕەنگە کەسانێك بڵێن: دەبێ ئێمەش کارێکی وەك هی ئەوان بکەین! بەڵام پێم وایە ئەوە شتێکی دروست نیە، لە هیچ شوێنێك، ئەزموونی هیچ شوێنێك کۆپی بکرێتەوە، تورکیا جیایە و، مەغریبیش جیایە لە تورکیا، شوێنێکی دیکەش جیایە لە شوێنێکی دیکە، بۆیە ئێمە خۆمان لە هیچ کام لەو چوارچێوانەدا نابینینەوە، بەڵام مانای وانیە کە خاڵی هاوبەشیشمان لەگەڵیان نیە، خاڵی هاوبەشییان زۆرن لەگەڵ هەموو ئەوانەدا، بەتایبەتیی لەڕووی فیکرییەوە، بەڵام لە ڕووی میکانیزمەکانی کارو، شێوازو ئامرازەکانی کارەوە، بێگومان دەبێ تەماشای واقیعی خۆمان بکەین و، وەك خۆمان بین و، وەك خەڵکی دیکە نەبین، لەگەڵ ڕێزو حورمەتمان بۆ هەموو لایەن و کەسایەتییە ئیسلامییەکان و، هەموو ئەزموونەکان، خوا پاداشتی هەموویان بداتەوە، بەڵام شتێکی دروست و ڕەوا نیە: هەوڵێك کە لە شوێنێکی دیکە، دراوە، ئێمە لەلای خۆمان وەك ئەوێ، دووبارەی بکەینەوە، بۆ نموونە: کۆمەڵی برایانی مسوڵمان (الإخوان المسلمون) لەئێستادا دەبێ جۆری بیرکردنەوەیان و، جۆری مامەڵەکردنیان لەگەڵ واقیع دا جیابێ، لە هی سەردەمی (حسن البّنا) ڕەحمەتی خوای لێبێ، هەروەها هی ڕابەرەکانی دیکەشیان، چونکە هەل و مەرج و ژینگەکان کە دەگۆڕێن، حاڵەتە سیاسییەکان کە دەگۆڕێن، دەبێ شێوەی مامەڵەی تۆش لەگەڵیاندا بگۆڕێ.

# بەشی نۆیەم

## پایەگرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان

## [الأصول المهمة: لانسجام وتضامن وتعاون التيارات والجهات الإسلامية]

# بـــەرایی

بەڕێزان!

لەم بەشی نۆیەمەی ئەم تەوەری پێنجەمەدا، هەوڵدەدەین تیشك بخەینە سەر پرسێكی یەكجار گرنگ و هەستیار، كە بریتیە لە: {پایە گرنگەكانی: تەبایی و یەكڕیزیی و هاوكاریی: تەوژم و لایەنە ئیسلامییەكان}.

بەڵێ ئێمە لەم بەشەدا باسی ئەوە دەكەین كە ئایا: ئێمە تەوژمە ئیسلامییەكان و، لایەنە ئیسلامییەكان و، وەك هەموو ئەو خەڵكەی كە لە گۆڕەپانی كاری ئیسلامییدا خۆمان دەبینینەوە، چۆن دەتوانین پێكەوە تەبا بین، یەكڕیز بین، هاوكار بین، دەستبارگر بین بۆ یەكدی؟!

ئێمە دە (١٠) بنەمامان لەو بارەوە باس كردوون، بەڵام سەرەتا وەك دەستپێك باسی دوو هۆكارە سەرەكییەكەی ناتەبایی و پەرتەوازەیی مسوڵمانان دەكەین و دەڵێین: ئەگەر تەماشای قورئانی بەرزی بەپێز بكەین، بۆمان دەردەكەوێ، كە ئەوەی بۆتە هۆكاری پەرتەوازەیی و، لێك دابڕانی ئۆممەتانی پێشوو، هەروەها ئەزموونە ئیسلامییەكانی ڕابردووی پاش پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم) دوو هۆكاری بنەڕەتیی بوون:

**یەكەم:** چاك لە ئایین حاڵی نەبوون.

**دووەم:** خڵتەو خاڵ بە دڵ و دەروونەوە بوون.

كە هۆكاری یەكەمیان پەیوەندیی بە عەقڵ و هۆشی مرۆڤەكانەوە هەیە و، هۆكاری دووەم پەیوەندیی بە دڵ و دەروونیانەوە هەیە.

با تەماشای ئەم سێ کۆمەڵە ئایەتە بکەین:

١- لە ئایەتی ژمارە (٢١٣)ی سووڕەتی (البقرة)دا، خوا دەفەرمووێ:

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: مرۆڤایەتی یەك کۆمەڵ بوون، خواش پێغەمبەرانی تێدا ناردن، دڵخۆشکەرو ترسێنەر بوون و، بە حەق کتێبی لەگەڵ ناردنە خوار، تاکو لە نێوان خەڵکدا دادوەریی بکا، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی، ئنجا تەنیا ئەوانەی کە دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هاتبوون، بەهۆی دەستدرێژیی کردنە سەریەکدی (ئێرەیی بەیەکدی بردن)ەوە، کەوتبوونە ڕاجیایی، خواش ئەوانەی کە بڕوایان هێنا بوو، لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی، ڕێنمایی کردن بەرەو حەق، بە مۆڵەتی خۆی، خواش هەر کەسێ بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە شەقام.

براو خوشکانی بەڕێز! لێرەدا دەبینین خوای پەروەردگار هۆی ناکۆکیی و دووبەرەکیی لە نێوان مرۆڤایەتییدا، دەگێڕێتەوە بۆ (بغي) [بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ]، یانی: مرۆڤەکان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هاتوون و نوقسانییان لە ڕووی عەقڵیی و عیلمییەوە نەبووە، بەڵام نوقسانیی لە دەروونیانەوە بووە، چونکە: (بغي) وەك دوایی باسی دەکەین: بریتیە لە سنوورشکاند و ماف پێشێلکردنی یەکدی، کە ئەوە زیاتر پەیوەندیی بە ئیرادەو حاڵەتی دەروونیی مرۆڤەکانەوە هەیە.

٢- لە سووڕەتی (الجاثية) ئایەتەکانی: (١٦و١٧)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ

ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ الجاثية.

خوا عز وجل باسی ئەزموونی بەنی ئیسرائیل دەكات و دەفەرموێ: ئێمە كتێب و حیكمەت و پێغەمبەرایەتییمان بە نەوەی ئیسرائیل دابوو، هەروەها لە ڕزقە خۆش و بەتامەكان بەشمان دابوون و، بەسەر زۆر لە جیهانییاندا (جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیان) بەرزمان كردبوونەوە (هەڵمان بژاردبوون) ئنجا تەنیا كاتێك كە زانیارییان بۆهات، لەبارەی ئەو بەڵگە ڕۆشنانەوە كە پێمان دابوون، كەوتنە ناكۆكیی و ڕاجیاییەوە، بەهۆی سنوور شكێنییانەوە لە بەینی خۆیان دا [هەندێك (بغي)یان بەحەسەد و، هەندێك بە زوڵم و، هەندێك بە سنوورشكێنی لێكیان داوەتەوە] بێگومان پەروەردگارت لەوەدا كە تێیدا كەوتوونە ڕاجیایی، ڕۆژی قیامەت دادوەرییان لەبەیندا دەكات.

٣- ئەوەی ڕابرد بە نسبەت هۆكارە دەروونیەكانەوە بوو: لەبارەی كاریگەریی بەهەڵە لە ئیسلام تێگەیشتنیشەوە، كە پەیوەستە بە عەقڵ و هۆشەوە، خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَـٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَهُمْ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المائدة.

پێشێ باسی جوولەكەكان دەكات، دوایی دەفەرموێ: هەروەها ئەوانەش كە گوتیان: ئێمە نەصرانیین، پەیمانێكی پتەومان لێ وەرگرتن، بەڵام بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی كرابوون، فەرامۆشیان كرد، بۆیە یەكسەر بەهۆی ئەوەوە: لە بەینیاندا دوژمنایەتیی و ڕق و كینەمان پەیدا كرد، تاكو ڕۆژی قیامەت، لەمەودواش خوا هەواڵیان پێ دەدا، بەوەی دەیان كرد.

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ ﴾، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەشێك لەوەی پێیان درابوو، فەرامۆشیان كرد (بەشێك لە ئایینەكەیان لە بیركرد) یەكسەر بەدوای ئەوەدا [چونكە لێرەدا (ف) بۆ بەدوادا هاتن (تعقیب)ە] دوژمنایەتیی و ڕق و قینمان لە بەیندا پەیدا كردن.

کەواتە: بەهەمان شێوەش: لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەهلی ئیسلام، بەشێك لە ئایین فەرامۆش دەکەن و، بەشێکی گەورەتر دەکەن، لەسەر حیسابی ئەو بەشەی کە فەرامۆشیان کردوە، یان چەند بەشێکی فەرامۆش دەکەن، لەسەر حیسابی ئەو بەشانەی دیکە کە گەورەتریان دەکەن: ناکۆکییان لەبەیندا پەیدا دەبێ.

ئایا ئێستا وانیە؟! ئێستا بۆ وێنە: هەرکام لە: ڕەوتی: (سەلەفیی و سۆفیی) یەکیان لایەکی گرتوە و، ئەوی دیکەش لایەکی دیکە! یان لایەنە ئیسلامییەکان: یەکێ زیاتر جەخت دەکا لەسەر لایەنێك و، ئەوەی دیکەش لەسەر لایەنێکی دیکە و، سەرەنجام تێك دەگیرێن و، هەرکەسە بەهی خۆی هەڵدەڵێ، وەك خوادەفەرموێ:

﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ (الروم:٣٢).

واتە: هەر کۆمەڵە ئەوەی کە بۆخۆی لەسەریەتی، پێی دڵخۆشە.

ئنجا هەرکامیان ئەوی دیکە، بە لە دەرەوەی بازنە، دەزانێ!

کەواتە: وەك دەبینین: خوای زاناو شارەزا سبحانە وتعالی هۆی پەرتەوازە بوونی ئەهلی ئایین بەگشتیی و، بەتایبەت جوولەکەو نەصڕانییەکانی، گێڕاوەتەوە بۆ دوو شتان:

١- (بغي) [بَغْيًا بَيْنَهُمْ]، کە هەم لە سووڕەتی (البقرة:٢١٣)و، هەم لە سووڕەتی (الجاثية:١٧) دا هاتوە، (بغي) یانی چی؟!

لە (مختار الصحاح)دا هاتوە: {البَغْيُ: التعدِّي و بَغَى عليه: استطال، وبابُه: رمى، وكل مجاوزة وإفراط على المقدار الذي هو حَدُّ الشيء، فهو بَغْيٌ}.[1]

واتە: (بغي) بریتیە لە: سنوور شکاندن، (بغی علیه) واتە: سنووری بەلادا بەزاند و، دەستدرێژیی کردە سەری و، هەموو سنوور شکاندنێك و هەموو تێپەڕاندنێك لەو ئەندازەیەی کە سنووری شتەکەیە، پێی دەگوترێ: (بَغي).

---

(١) ص ٥٩.

لە تەفسیرەکاندا هەندێکیان (بغي)یان بە ئیرەیی(حَسَد) لێك داوەتەوە و، هەندێکیان بە ڕق لێبوونەوە (بُغض)یان لێکداوەتەوە و، هەندێکیان بە خۆ بەزلگری (كِبْر)یان لێك داوەتەوە، کە هەموویان پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە هەیە.

**٢**- (نسيان) (فنسوا خظاً مما ذُكّروا به)، (نسیان)یش ئاوا پێناسە کراوە: {النسيان: ضد الذكر والحفظ، والنسيان أيضاً: الترك}.[١]

واتە: (نسیان) پێچەوانەی لە بیربوون و، پێچەوانەی لەبەر کردنە، هەروەها (نسیان) بۆ واز لێهێنان و دەستبەردار بوونی شتێکیش بەکار دێ.

کەواتە: (بَغي) پەیوەندیی بە دڵ و دەروونەوە هەیە و، (نسیان)یش پەیوەندیی بەعەقڵ و هۆشەوە هەیە، ئنجا ئەگەر تەماشای واقیعیش بکەین، هەر وای دەبینین، هۆکاری سەرەکیی ناتەبایی و ناکۆکیی مسوڵمانان، یان ئەوەیە کە دڵ و دەروونیان پێکەوە تەواو نیە، واتە: وەك یەك لە ئیسلام تێگەیشتوون و بیرو بۆچوونیان وەك یەکە، بەڵام دڵ و دەروونیان پێکەوە تەواو نیە، ئیرەیی (حَسَد)یان هەیە، بوغزیان هەیە، خۆبەزلگریی (كِبْر)یان هەیە، خۆ پەسندیی(عُجْب)یان هەیە.

یاخود لە ڕووی تێگەیشتن لە ئیسلامەوە: یەکیان بەشێك و لایەکی گرتوە و، ئەوەی دیکەیان بەشێك و لایەکی دیکەی گرتوە، یەکیان دەڵێ: ئیسلام تەنیا بریتیە لە فڵان شت، ئەوەی دیکەش دەڵێ: نەخێر، تەنیا بریتیە لە فڵان شت! ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا، ناکۆکیی و دووبەرەکیی پەیدا دەبێ.

کەواتە: لە ئەنجامی چیدا تەبایی پەیدا دەبێ؟

لە ئەنجامی ئەوەدا کە:

**یەکەم:** مسوڵمانان باش لەئیسلام تێبگەن.

**دووەم:** دڵ و دەروونیشیان پاك بێ و، بۆ خوا ساغ بن و، لەگەڵ یەکدا ڕاست بن و فێڵ و غەشیان پێکەوە نەبێ.

---

(١) هەمان سەرچاوە ص ٦٥٨.

## پایەگرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی: تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکانیش ئەمانەن:

ئێستاش با ئەو دە (١٠) پایەگرنگەی تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی: تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان بەڕیز بخەینە ڕوو:

١- قووڵ و فراوان تێگەیشتن لە ئیسلامی بەرجەستە: لە قورئان و سووننەت دا.

٢- دڵ و دەروون ساغ و سەلامەت بوون.

٣- بژارکردن لە سیفەتە خراپەکان (التخلية من الرذائل).

٤- ڕازێنرانەوە بە سیفەت پەسندەکان (التَخْلية من بالفضائل).

٥- عەیب و کەم و کوڕیی خۆدیتن و، دانهێنان بە چاکە و فەزڵی ئەوانی دیکەدا.

٦- گونجاویی و کرانەوە و ئەرێنیی بوون.

٧- لە بیانوو نەگەڕان و پاساوو عوزر بۆ یەکدی هێنانەوە.

٨- ڕووگەشیی (البشاشة).

٩- زمان شیرینیی (طيب الكلام).

١٠- خۆ پاراستن لەزمان بەخراپ گەڕان.

### ١- قووڵ و فراوان تێگەیشتن لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا:

بەدڵنیایی ئیسلام تەنیا ئەوەیە کە لەقورئاندایە و، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە میانی ڕێبازو سوننەتی خۆیدا، بەرجەستە و جێبەجێی کردوە، هەمیشە کەچ فەهمیی و، تەسك و سەرکێڵ لە ئیسلام حاڵی بوون، مایەی پەرتەوازەیی و بەش بەش بوونی مسوڵمانانە و، قووڵ تێگەیشتنیان، مایەی تەبایی و لێك تێگەیشتن و هاوکارییانە.

بالەو بارەوە، تەماشای ئەم دوو ئایەتە بکەین:

١)- خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٥٩)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍ ... ﴾.

واتە: ئەوانەی ئایینەکەی خۆیانیان بەش بەش کردوە و تێیدا بوونە تاقم تاقم[1]، تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە.

کە دەگونجێ ئەوە مەبەست پێی مسوڵمانان بێ، کە ئایینی خۆیان پارچە پارچە و بەش بەش دەکەن، دەشگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ.

٢)-لە سوورەتی (الروم) ئایەتەکانی (٣١ و ٣٢)دا، کە بە تەئکید ڕوو لە مسوڵمانان دەکا، دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٣١ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ٣٢ ﴾ الروم.

---

(١){(شِيَع): کۆی (شيعة)یە، شيعة: یانی: کۆمەڵ، کەواتە: (شِيَع)یان: دەستە دەستە}.

واتە: ئەی مسوڵمانینە! ئێوەش وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان مەبن، ئەوانەی ئایینەکەی خۆیانیان پارچە پارچە کرد و، تێیدا بوونە دەستە دەستە، هەر کۆمەڵێك بەوەی کە لەسەریەتی، پێی دڵخۆشە.

[ئێوەش وەك ئەوان مەکەن!]، سبحان الله! هەرچی خوا لەقورئاندا فەرموویەتی: وەك ئەوان مەکەن، وەك هەمووانمان کردوە:

١- ئێستا لێرەدا خوا فەرموویەتی: وەك ئەو موشریکانە مەکەن، کە ئایینەکەی خۆیانیان بەش بەش کردوە و، تێیدا بوونە تاقم تاقم! کەچی وامان کردوە!

٢- لە سووڕەتی (الحشر)دا دەفەرموێ: ﴿ تَحۡسَبُهُمۡ جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴾ (الحشر:١٤).

واتە: پێت وایە (جوولەکەکان) پێکەوەن، کەچی دڵیان جۆراو جۆرە، چونکە کۆمەڵێکی نافامن.

ئنجا ئەوەش بەسەر ئێمە هاتوە! یانی: ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر زوو هەواڵی پێداوە و فەرموویەتی: {لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ، شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ سَلَكُوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُمُوهُ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: فَمَنْ!} أخرجه أحمد برقم (١١٨١٧)، والبخاري برقم (٣٢٦٩)، ومسلم برقم (٢٦٦٩)، وابن حبان برقم (٦٧٠٣).

واتە: بەدوای ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، بست بەبست و، گەز بە گەز [واتە: لە شتی بچووك و لە شتی گەورەدا، شوێنیان دەکەون] هەتا ئەگەر چووبنە کونی بزنمژێکەوە، بەدوایاندا دەچن، گوتیان: مەبەستت پێ جوولەکەو نەصرانییەکانە؟ فەرمووی: ئەدی مەبەستم پێ کێیە؟

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، گوتیان: {فارس والروم ؟}، قال : {وَمَنِ النّاس إلاّ هُم}، گوتیان: فارس و ڕۆم؟ فەرمووی: ئەدی خەڵك هەر ئەوان نین؟!

هەڵبەتە مسوڵمانان کاتێك دەکەونە شوێن ئەملاولا، کە لەدینەکەی خۆیان باش حاڵی نەبن و، باش پێیەوە پابەند نەبن، ئەوکاتە دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەملاولا، ئنجا ئەوە مەلا بێت، بانگخواز بێ، نووسەر بێ، سەرۆك حیزب بێ (هی ئیسلامیی) ئەندامی قیادە بێ، هەرچی بێ، هەرکەس باش لەدینی خۆی تێنەگەیی، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی خەڵکی دیکە، هەڵبەتە بەهرەمەندبوون لە ئەزموون و لە زانیاریی بەسوودو شتی باشی خەڵکی دیکە، ئیسلام فەرمانی پێ کردوە، بەڵام ئەوە کە تۆ ناهەق (باطل)ی خەڵك بێنیە شوێن حەقی خۆت، ئەوەیە کە غەڵەتەو ناشەرعییەو، هیچ پاساوێکی نیە.

٣)- هەروەها خوا لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ المؤمنون.

دوای ئەوەی خوا (عزوجل) باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام)دەکا، دەفەرموێ: ئەمە کۆمەڵی ئێوەیە، یەك کۆمەڵە، منیش پەروەردگارتانم، هەر پارێز لە من بکەن، کەچی (گەلە پێشووەکان)ئایینەکەی خۆیانیان لە بەینی خۆیاندا بەش بەش کرد، [پارچە پارچەیان کرد][1]، هەر کۆمەڵێك بەوەی کە خۆیان لەسەرینی، پێ دڵخۆشن.

ئێستا تۆ تەماشای مسوڵمانان بکە! لەدرێژایی و پانایی جیهانی ئیسلامییدا، هەر کۆمەڵە مسوڵمانەو خۆیان بە شتێکەوە سەرقاڵ کردوە و، بەزۆریی وایە لێك دابڕاون، ئنجار هەر کامێکیان تەنیا حیساب بۆ خۆی دەکا و، وا دەزانێ حەق هەر ئەوەیە کە بۆخۆی لەسەریەتی، چونکە تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام بچووك بۆتەوە، دڵیشیان پێکەوە بچووك بۆتەوە و، حەوصەڵەیان لەگەڵ یەك دا کەم بۆتەوە!! بەڵام بەتەئکید قووڵ و فراوان لێ تێگەیشتنی ئیسلام، مایەی تەبایی و یەکڕیزییە.

---

(١) (زُبُر): کۆی (زَبْرة)یە، وەك چۆن (قِطَعْ) کۆی (قِطعة)یە.

بۆیەش گوتوومانە: پایەی یەکەمی تەبایی و هاوکاریی و یەکڕیزیی، تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان، بریتییە لە قوڵ و فراوان تێگەیشتن، لە ئیسلام ئەگەر قووڵ و فراوان لە ئیسلام تێ بگەین، ئائەوە بەردی بناغەی هاوکاریی و تەباییمانە.

٤)- لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سووڕەتی (آل عمران)دا، خوای کاربەجێ ڕستەیەك دەفەرموێ، زۆر جێی سەرنجە، نەمبینیوە: توێژەرەوانی قورئان بۆ ئەو مەبەستەی ئێستا دەیڵێم، بەبەڵگە بیهێننەوە، بەڵام پێم وایە زۆر بەڵگەیەکی گونجاوە:

خوا باسی ئەوانە دەکات کە بەدوای ئایەتی ماناوێکچوو(متشابه) دەکەون، لە جیاتی ئەوەی ئایەتە موحکەمەکان (مانا ڕۆشنەکان)بکەنە تەرازوو، ئنجا لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە موحکەمەکاندا، لە ئایەتە موتەشابیهەکان {ئایەتە مانا لێکچووەکان}، حاڵی بن، بەپێچەوانەوە: بەدوای ئایەتە مانا وێکچووەکان دەکەون، ئنجا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا ﴾ (آل عمران:٧).

واتە: بەڵام ئەوانەی بە زانیارییدا چاك قووڵ بوونەوە (ورد تێگەیشتوون) دەڵێن: بڕوامان پێی هەیە، هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، یانی: هەم ئایەتە موحکەمەکان و هەم ئایەتە موتەشابیهەکان، دوایی خوا دەفەرموێ: [وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ] واتە: تەنیا خاوەن عەقڵانیش پەند وەردەگرن، بەدڵنیایی خاوەن عەقڵان ئەوانەن کە بەئیسلام دا قووڵ دەبنەوە، ئنجا کە پێیدا قووڵ بوونەوە، دەڵێن: هەمووی لە پەروەردگارمانەوەیە.

تەماشا بکەن! ئەگەر ئێمە باش لەڕووی قورئان و سوننەتەوە، لەئیسلام تێبگەین: ئیسلام پێش هەموو شتێك بووناسیی (علم الوجود)ە، ئەوە کە بزانی: تۆ چی؟ ئەم بوونە چییە؟ خاوەنەکەی کێ یە؟ بۆچی هاتۆتە دی؟ ئێمە لەکوێوە هاتووین؟ بۆ کوێ دەچین؟ وەك پێشتر لەبەشی یەکەمی تەوەری چوارەم دا باسمان کرد.

ئنجا دوای ئەوە ئیمان و عەقیدەیە، پاشان دوای ئەوە: خواپەرستییە، ئنجا دوای ئەوە: تەزکیەی نەفس و تەقوایە و ڕەوشت و ئاکاری بەرزە، ئنجا دوای ئەوە: هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکانە، ئنجا: حوکم و سیاسەتە، لایەنی ئیدارەو بەڕێوەبردنە و، لەکاتی پێویستدا: جەنگ و جیهادو بەرخۆدان و فیداکارییە.

یانی: کاتێك تەماشای قورئان و سوننەت دەکەین، ئەوانەیان هەموو تێدان، بەڵام ئەگەر ئینسان باش لە ئیسلام تێنەگات، لە جیاتی ڕاستە شەقامی شەریعەت، ملی باریکە ڕێیەك دەگرێ! ئنجا لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینانیش، زۆر گرفتێکی گەورەیە، بۆ وێنە: ئەهلی تەصەووف، خەڵکی خۆیان تەنیا لەسەر هەندێ چەمك و بیرۆکەی خۆیان پەروەردە دەکەن، هەروەها سەلەفییەکانیش و...هتد.

هەڵبەتە ئەگەر ئێمەش - وەك لایەنە ئیسلامییەکان- لەخۆمان وریا نەبین هەر بەوەدەردە دەچین، وەك (کۆمەڵی نوور) کە پێشتر باسمان کرد، مامۆستا مەلا سەعیدی نۆڕسیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەڕۆژگاری خۆیدا هەر دەرفەتی ئەوەندەی بووە، بەرگریی لە ئیمان بکا، بەڵام ئایا ئەوە مانای وایە، هەر لەسەر ئەوەندە بمێنینەوە؟ یان (مەکتەبی قورئان)ی کاك ئەحمەدی موفتی زادە، لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، کە ئێستا بوونە دوو ڕەوت و، هەردووك ڕەوتەکە ئێستا بە پلەی یەکەم شیعرەکانی کاك ئەحمەدیان کردوونە ڕێبازی خۆیان! دیارە ڕەوتی کاك حەسەنی ئەمینیی، عەقڵ فراوانترو تێگەیشتووترن و، ئەوانی دیکەش، ئەوانیش بێگومان هەر باشن، بەڵام سەیر ئەوەیە شیعرەکانی کاك ئەحمەدیان لەجێی قورئان و سوننەت داناون و دەڵێن: ئێمە ڕیش ناهێڵینەوە، لەبەر ئەوەی کاك ئەحمەد ڕیشی نەبووە! هەروەك کۆمەڵی (نۆڕسیی)م بینیوە دەڵێن: ئێمە ڕیش ناهێڵینەوە، لەبەر ئەوەی مامۆستا نۆڕسیی ڕیشی نەبووە! ئاخر ئەو کە ڕیشی نەبووە، بەڵگە و پاساوی خۆی باسکردوە، هەر چەندە من وەك هەندێ کەس ڕیشم نەکردوە بە پایەیەکی گەورەی ئیسلام و، وەك خۆی تەماشای دەکەم، کە سوننەتێکە! بەڵام مامۆستا سەعیدی نۆڕسیی لە ژیاننامەکەی خۆیدا باس دەکا، دوو پاساو دێنێتەوە:

یەکەم: دەڵێ: من ئەگەر ڕیشم هەبووایەو، ڕیشیان بە تۆبزیی پێ تاشیبام، تەحەممولم نەدەکرد.

دووەم: دەڵێ: ئەگەر ڕیشم هێشتبایەوە، لەبەر ئەوەی کە قوتابییەکانم زۆر دەستگرتوون بە ڕێبازەکەمەوە، ئەوانیش ڕیشیان دەهێشتەوە و، هەرکەس ڕیشیشی هەبووایە، لەهیچ فەرمانگەیەك و لە هیچ کایەیەکی حکوومیی دا بواری پێ نەدەدرا و، سەرەنجام مەحرووم دەبوون و دەخرانە پەڕاوێزی کۆمەڵگاوە.

کە هەردووك پاساوەکەی، ڕێیان تێ دەچێ، ئنجا ئەو ئەوە پاساویەتی، ئەگەر تۆش هەمان پاساوت هەبێ، وابکە، بەڵام ئەگەر نەتبێ، تۆ لەپێش مامۆستا نۆرسیی و لەپێش کاك ئەحمەدی موفتی زادە و، پێش (ابن تیمیة) و پێش: (محمد بن عبدالوهاب)و...هتد دا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەیە، کە سەرمەشقی ڕەها (الأسوة المطلقة)یەو، ناشڵێم ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلیی، خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێم: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەیە.

ڕۆژێ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) لە کۆڕێکدا باسی شتێکی کرد، گوتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وای فەرمووە، گوتیان: ئەبوبەکر وای گوتوە و عومەر وای گوتوە! عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش گوتی: هەرچاکە بەردتان بەسەردا نابارن! من دەڵێم: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئێوەش دەڵێن: ئەبوبەکرو عومەر[١]! چ جای تۆ لەبەرانبەر ڕێبازی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بڵێی: کاك ئەحمەد، یان مامۆستا مەلا سعید، یان فلان کەس، بێگومان ئەوە شتێکی زۆر بێجێ و نامەنتیقییە!

بەڵێ ئەگەر ئینسان چاك لە ئیسلام تێبگات و، چاك تێیدا قووڵ بێتەوە، ئەوە بەردی بناغەی تەبایی بەینی مسوڵمانانە و، ئەگەر باش و قووڵ تێبگەن، ئەو کاتە زۆرلەو دەمەقاڵێ و مشت و مڕەی کە دەیکەن، لە ئەنجامی یەك حاڵی نەبووندا، لە کۆڵیان دەبێتەوە!

---

(١) بڕوانە: شرح رياض الصالحين، محمد بن صالح العثيمين، ج١، ص ٥٤٧.

دووەم: دڵ و دەروون ساغ و سەلامەت بوون:

پایەی دووەمی تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی بەینی ئەهلی ئیسلام، ئەوەیە کە خاوەنی دڵ و دەروونێکی ساغ و سەلیم بن، یەکەم لەبەرامبەر خوادا سبحانە و تعالی، خاوەنی خوا بەیەکگرتن (التوحید) بن، ئنجا لەگەڵ خەڵکیشدا بەگشتیی و، لەگەڵ ئەهلی ئیسلام دا بەتایبەت، خاوەنی دڵسۆزیی (النصح) بن و، خاوەنی: ساغیی و بە تەنگەوە بوون و بەپەرۆش بوون، بن، خوای پەروەردگاریش سەلامەتیی ڕۆژی دوایی، بەستۆتەوە بەدڵی ساغ و سەلیمەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الشعراء.

واتە: ئەو ڕۆژەی نەسامان نەکوڕان دادی کەس نادەن، مەگەر کەسێك بە دڵێکی ساغ و سەلیمەوە هاتبێتەوە لای خوا.

ئینسان ئەگەر دڵەکەی ساغ و سەلیم بوو، بوغزو غەرەزی تێدا نەبوو، خۆ بەزلزانیی (تكبُّر) تێدا نەبوو، خۆ پەسەندیی (عُجْب)ی تێدا نەبوو، خەڵك بە کەم زانینی، تێدا نەبوو، ئەو کاتە بابەتییانە لەگەڵ شتەکان دا مامەڵە دەکات و گوێ دەگرێ، وەك چۆن پێی خۆشە خەڵك گوێی بۆ بگرێ، گوێشیان بۆ دەگرێ و، چۆن پێی خۆشە خەڵك حەقی لێ وەربگرێ، حەقیشیان لێ وەردەگرێ.

سێیەم: بژار کران لە سیفەتە خراپەکان (التخلية من الرذائل):

بەتەئکید ئەمیش هۆکارێکی زۆر گەورەو گرنگی تەبایی و هاوکاریی نێوان ئەهلی ئیسلامە، چونکە سیفەتە نزم و پەستە دەروونییەکان (الرذائل النفسية) پشکی شێریان هەیە لە ناتەبایی و ناکۆکیی و دووبەرەکییدا، بە تایبەت سیفەتەکانی: {خۆ بەزلگریی، خۆپەسەندیی، ئێرەیی، ڕق لێ بوونەوە، ڕەشبینیی، قسە ڕەقیی، پەرگیریی، داخراویی}، بە عەرەبیی: {كِبْر، عُجْب،

حَسَد، بُغض، تَشاؤم، فظاظة، تطرُّف، إنغلاق}، هەرکام لەو خەسڵەتە نزم و پەستانە، چ جای هەموویان، کاریگەریی زۆری هەیە کە مسوڵمانان لێك دابېڕێن و، پێکەوە گونجاو نەبن و، پێکەوە نەسازێن و، سەرەنجام: پێکەوە هاوکار و دەستبارگر نەبن.

**چوارەم: ڕازێندرانەوە بە سیفەتە پەسەندەکان (التحلية بالفضائل):**

خۆ ڕازاندنەوەی ئەهلی ئیسلام، بەتایبەتی خەڵکی نێو تەوژمی ئیسلامیی، بە خەسڵەت و ئاکارە جوان و پەسندەکان، کاریگەریی زۆری هەیە بۆ یەکڕیزییان و، تەبایی و هاوکاریی نێوانیان، بەتایبەت سیفەتەکانی: {بەزەیی، خۆ بەکەمگریی، لێزانیی، بە ویژدان بوون، دڵسۆزبوون، هاوسەنگ بوون، گەشبینیی، کرانەوە}، بە عەرەبیی: {رحمة، تواضع، حكمة، إنصاف، نصح، إعتدال، تفاؤل، إنفتاح}.

هەڵبەتە ئەوانەش هەموویان لە ئەزموونی کردەییدا، ئینسان پێیان دەگا، کە ئەگەر ئینسان لەگەڵ خەڵکی دا: بەڕەحم بێ، خۆ بەکەم گر بێ (گرفت بەزۆریی لە خۆبەزلگریی پەیدا دەبن) هەروەها ئەگەر ئینسان لێزان بێ و، حیکمەت و دانایی هەبێ، ئەگەر بە ئینساف بێ، ئەگەر دڵسۆز بێ، ئەگەر هاوسەنگ بێ، پەرگیر نەبێ و تێنەپەڕێنێ، ئەگەر گەشبین بێ، ئەگەر کراوە بێ بەرامبەر بە خەڵکی مسوڵمان و نامسوڵمانیش، ئەوکاتە ڕێی تەبایی و گونجاویی و هاوکاریی پێکەوەکردن و دەستبارگرتنی لەگەڵ خەڵکی دا بۆ تەخت و ئاچووغ دەبێ و، پێشینان گوتەنی: دەبێتە ئاردی گەنم و، هەموو جۆرە نانێکی لێ دروست دەبێ.

ئنجا بێگومان (تەزکیەی نەفس) کە خوای کارزان، کردوویەتە مایەی سەرفرازیی ڕەها، هەرکام لە: بژارکردن لە خەسڵەتە نزمەکان و، ڕازاندنەوە بە سیفەتە پەسەندەکان دەگرێتە خۆی: (قد أفلح من زكاها) الشمس: ٨ ، چونکە (زكى) یانی: پاك بوو، گەشەی کرد، چاك بوو {طهر، نما، صلح}.[1]

---

(١) المعجم الوسيط، ص٣٩٦.

## پێنجەم: عەیب و کەم و کوڕیی خۆدیتن و، دانپێداهێنان به چاكەو فەزڵی ئەوانی دیكە:

ئینسان دەبێ عەیب و کەموکوڕییەکانی خۆی ببینێ، کوردەواریی خۆمان گوتوویانە: ئەگەر پووشکەت لە چاوی خەڵکدا بینی، چیلکەش لە چاوی خۆتدا ببینە، هەڵبەتە نە پووشکە دەچێتە چاوی ئینسان و نە چیلکەش، بەڵام یانی: ئەگەر تۆ عەیبی گچکەت لەخەڵك دا بینی، هی گەورەش لە خۆتدا ببینە، خاتری خۆت مەگرە، کە ئەمیش بەتەئکید هۆکارێکی گەورەو گرنگی تەبایی و پێکەوە گونجانی لایەن و تەوژمە ئیسلامییەکانە، ئینسان دەبێ عەیب و کەموکوڕییەکانی خۆی ببینێ و، لەبەرامبەریشدا چاکەو فەزڵی بەرامبەرەکانیش ببینێ و، دان بەچاکەکانیان دا بێنێ.

سبحان الله! هەندێ کەس دڵەکەی وایە (خوا بمانپارێزێ) وەك مێشە ڕەشە، هەر بەدوای خاڵی ڕەشدا دەگەڕێ، یانی: کەسێك بێنە نەوەدونۆ (٩٩) سیفەتی باشی تێدابێ، یەك عەیبی هەبێ، بەس عەیبەکەی دەبینێ، بەڕێز گیان! ئەو (٩٩)یەش ببینە، عەرەب دەڵێن: {من فضائل الرجال أن تُعَدّ مَعايبهم} فەزیڵەتە بۆ پیاوان عەیبەکانیان بژمێردرێن، ئەگەر کەم و کوڕییەکانیان بژمێردرێن، ئەوە فەزیڵەتە، بڵێی: یەك، دوو، سێ، چوار، ئەو چوار عەیبەی هەن، زۆر باشە، مانای وایە: چاکەشی زۆرن.

ئینسان ئەگەر چاکەی خەڵك ببینێ و عەیب و کەموکوڕییەکانی خۆیشی ببینێ، زۆر کاریگەریی هەیە بۆ تەبایی و بۆ پێکەوە گونجان، نەك بە عەکسەوە: تەنیا چاکەی خۆی ببینێ و، بەس عەیبی خەڵکی ببینێ! بە عەکسەوە: عەیبی خۆت ببینە، چاکەی خەڵکیش ببینە، کوردەواریی خۆمان هەندێ قسەی زۆر جوانیان هەن، دەڵێن: وا باشە ئینسان ئەگەر چاکەی لەگەڵ خەڵکێکدا کرد، لە بیری بچێ، یان دەڵێن: [چاکە بکەو بە ئاوێی دابدە] یانی:

با لەبیرت بچێتەوە، بەڵام وا باشە ئەگەر خراپەت لەگەڵ کردن، لەبیرت نەچێ، بەڵام بەپێچەوانەوە: ئەگەر خەڵك خراپەیان لەگەڵ کردی، وا باشە لەبیرت بچێ، بەس ئەگەر چاکەیان لەگەڵ کردی، لە بیرت نەچێ.

یانی: چاکەی خۆت لەبیر بچێ و، خراپەی خۆت لە بیر بێ و، چاکەی خەڵکت لە بیر بێ و، خراپەکەیانت لە بیر بچێ.

## شەشەم: گونجاویی و کرانەوە و ئەرێنیی بوون:

تەماشا بکەن! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی دەفەرموێ: {الْمُؤْمِنُ مُؤْلِّفٌ، وَلَا خَيْرَ فِيمَنْ لَا يَأْلَفُ وَلَا يُؤْلَفُ} أخرجه أحمد: برقم (٩١٨٧)، والحاكم برقم (٥٩) وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي برقم (٢٠٨٨٦)، والخطيب (٢٨٨/٨)، وأخرجه أيضا: البيهقي في شعب الإيمان برقم (٨١١٩)، قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن[1].

واتە: ئیماندار پێکەوە گونجێنەرە، پێکەوە گرێ دەرە و، هەر کەسێك کە نە بتوانێ خەڵك هۆگری خۆی بکا، نە هۆگری خەڵکیش بێ، خێری پێوە نیە.

یانی: یان دەبێ بتوانێ خەڵك هۆگری خۆت بکەی، کە ئەوە باشترە، ئەگەر ئەوەشت لە توانادا نەبوو، لانی کەم: هۆگری خەڵك بە، نابێ ئینسان وەك بەردی خڕ بێ و نەگونجێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {من كان هَيْناً لَيْناً سَهْلاً قريباً، حَرَّمه اللهُ على النار} رواه البيهقي في الآداب: ١٩٢.

واتە: هەر کەس هێدیی و نەرم و ئاسان و نیزیك بێ، خوا لە ئاگر-ی دۆزەخ - قەدەغەی دەکات.

هەروەها فەرموویەتی: {ألا أُخبركم بمن يحرم على النار، أو من تحرم النار عليه؟ تحرم على كلِّ قريب هَيْنٍ لَيْنٍ} رواه الترمذي: ٢٤٨٨ والطبراني: ١٠٥٧٢ وابن حبان: ٤٧٠، وصححه الألباني.

واتە: پێتان بڵێم کێ لە ئاگر-ی دۆزەخ- قەدەغەیە، یان ئاگر لەکێ قەدەغەیە؟! (ئاگر) قەدەغەیە لەسەر هەر بڕوادارێکی نیزیکی هێمنی نەرم و نیان.

---

(١) (مُؤَلِّف) یانی: پێکەوە گرێدەر، (مُؤَلِّف) بۆیە پێی دەگوترێ: (مُؤَلِّف) چونکە: ئەو ماناو مەبەستانە پێکەوە گرێ دەداو، دەیانکاتە کتێب.

حەوتەم: لە بیانوو نەگەڕان و، پاساو بۆ یەکدی هێنانەوە:

ئەمیش ئاکارێکی زۆر بەرزو پەسەندە، ئەگەر بمانەوێ بەرەو تەبایی و هاوکاریی پێکەوە هەنگاو بنێین، ئینسان لەیەکدی لەبیانوو نەبێ، لەبیانوو نەگەڕێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەوڵبدات پاساوو عوزر بۆ بەرامبەرەکەی، بهێنێتەوە، وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دیارە: {سُئِل رسولُ الله: أي الأديان أَحبُّ إلى الله؟! قال: أحبُّ الأديانِ إلى الله الحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ}، أخرجه أحمد (٢٣٦/١، رقم: ٢١٠٧) قال: الهيثمي (٦٠/١): رواه أحمد والطبراني في الكبير والأوسط والبزار، وأخرجه البخاري في الأدب برقم (٢٨٧)، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

واتە: بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوترا: کام دینداریی خۆشەویستترە لەلای خوا؟ فەرمووی: دینێکی پاکی لێ بوردە.

کە گوتوویانە: (أي الأديان) واتە: کام جۆرە دینداریيە؟ لێتان تێك نەچێ، بۆ نموونە: کە دەفەرمووێ: (الدِّين: النَّصيحة) (دین) لێرەدا بەمانای ئیسلام نیە، یانی: دینداریی دڵسۆزییە.

لە ڕاستیی دا لێبوردەیی و دڵفراوانیی و سینەسافیی، خەسڵەتێکی گەورە و گرنگی مسوڵمانەتییە و، هۆکارێکی یەکجار کاریگەری تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی پێکەوەکردنی مسوڵمانان بەگشتیی و، تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکانە بەتایبەت.

هەشتەم: ڕووگەشیی:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {لَا تَحْقِرَنَّ مِنْ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ} أخرجه أحمد برقم (٢١٥٥٩)، ومسلم برقم (٢٦٢٦)، والترمذي برقم (١٨٣٣) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضا: ابن حبان برقم (٥٢٣) والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٣٤٦٠).

واتە: هیچ شتێك لە چاكە بەكەم مەگرە، ئەگەر هەر ئەوەندەش بێ، كەبەڕووی خۆش بگەیە برایەكەی خۆت.

هەروەها خوشكی خۆت، زۆر جار گوتوومانە: مەجلیسەكە مەجلیسی پیاوان بووە، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەعبیرەكەی وا هێناوە، ئەگەرنا تۆ دەتوانی لەگەڵ براو خوشكانی خۆتدا ڕووت خۆش بێ.

ڕووگەشیی زۆر كاریگەریی هەیە بەڕێزان! ڕەنگە هەموولایەكتان بزانن كە من عادەتم وایە بە هەر شوێنێكدا بڕۆم، سەلام دەكەم، جادەو شەقام بێ، بازگە بێ، نێو بازاڕ بێ، هەر شوێنێك بێ، هەر بزانم ئەوكەسە چاوی لێیە، سڵاوی لێ دەكەم، بیستوومە كەسی وابووە، لە ئەنجامی ئەوەدا كە سڵاوێكی گەرم و گوڕی بە ڕوویەكی خۆش و گەشەوە لێكراوە، هەڵوێستی زۆر گۆڕاوە، گوتوویەتی: ئەو بەرپرسانەی خۆم كە دێن بە تەنیشتمدا ڕەت دەبن، دەبێ خۆم لابدەم، پانم نەكەنەوە!

وەك بیرەوەرییەكی خۆش بۆتان دەگێڕمەوە: كاتی خۆی لەو ئۆردوگایانەی خوار عەربەت (زەڕایەن و نەصر و باریكە)، لە ساڵی (١٩٩٢)دا بوو، جەولەیەكمان كرد، لە یادمە لەیەكێ لەو ئۆردووگایانە، كۆڕم هەبوو، كۆڕەكە لەمزگەوت بوو، خەڵكەكە بە گشتیی هاتبوون، لە هاتنە دەرەوەدا، ئەو كاتەش تەنیا من نا، خەڵك زۆری پێڵاوی لاستیكی لەپێ بوو، گوێم لێبوو یەكێك كە كادیری یەكێك لە

حیزبە عەلمانییەکان بوو، تەماشای کرد: داخۆ پێڵاوەکانم چۆنن؟ دوایی گوتی: پێڵاوەکانی لاستیکە! بەخوا هەرچی گوتوویەتی، هەمووی ڕاستە!

هەر کەسە شتێك دەکات بە نیشانە.

جارێك بۆیان گێڕامەوە گوتیان: مامۆستا فلان کەسێك ئاوایەو دەڵێ: زۆر مەحەببەتم بۆی پەیدا بووە، گوتم: لە چی ڕا؟ گوتیان: دەڵێ: ڕۆژێك بینیومە لەبەر دەرگای ماڵی خۆیان، عەرەبانەی منداڵێکی پاڵ پێوەناوە، گوتم: جاروبار ئەو جۆرە ئیشانەش دەکەین!

مەبەستم ئەوەیە پێویستە مسوڵمان ڕووگەش و کراوە بێ، لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی، لەگەڵ دەرو دراوسێی، لەگەڵ هەموو کەس دا.

بەڵێ، بە کەمی مەگرن: ڕووی خۆش و گەش، زۆر گرنگە و، کاریگەریی ئەرێنیی لەسەر کەسایەتیی مرۆڤ و پەیوەندییەکانی هەیە، بەعەکسەوەش هەر ڕاستە: ڕوو گرژیی و ترش و تاڵ بوونیش، کاریگەریی نەرێنیی هەیە.

نۆیەم: زمان شیرینیی (طيب الكلام):

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ (البقرة: ٨٣).

واتە: قسەی باش بۆ خەڵك بكەن و، لەگەڵ خەڵك دا بەگشتیی، قسەتان چاك بێ.

ئاشكراشە هەرچی كە لەگەڵ خەڵك دا بەگشتیی پێویست بێ، لەنێو خۆدا، لەنێو بازنەی ئیسلامییدا، بەتایبەتیی، پێویستترە، چونكە: (الأقربون أولى بالمعروف)، كە ئەوە قسەیەكی نەستەق و حیكمەتێكی بەجێیە، ئەگەرنا نە ئایەتە، نە فەرموودەیە، بەڵام قسەیەكی جوانە: (ئەوانەی نزیكترن، شایستەترن بە چاكە لەگەڵدا كردن).

٢- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ} أخرجه البخاري برقم: (٢٨٢٧)، ومسلم برقم (١٠٠٩)، واتە: قسەی خۆش چاكە و صەدەقەیەو پاداشتی هەیە.

ئنجا بەڕێزان!

ئەوەی وا لە مرۆڤی مسوڵمان دەكات: ڕووی گەش و كراوە و، قسەی پەسند و بەكەڵك بێ و تەعبیری بەرز و بەنەزاكەت بێ، بریتیە لەوەی عەقڵ و هۆشی بەزانیاریی و تێگەیشتنی ڕاست و دروست هۆشیار بێ و، دڵ و دەروونیشی بە نیاز و مەبەستی چاك و خولیای پاك و تەزكیە و تەقوایەكی كاكڵدار بێداربێ، چونكە ڕاست گوتراوە: (دڵ مەنجەڵە و زمان كەوچكە) ئنجا گۆزەش چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ.

دەیەم: خۆپاراستن لە زمان بە خراپە گەڕان:

خۆپاراستن لە زمان بە خراپە گەڕانیش، هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ پاراستنی تەبایی و، بگرە لە دڵەوە پەیدابوونی تەبایی و پاراستنی یەکڕیزیی.

١- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویٚ: {لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلَا اللَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ} أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم (٣١٢)، وأحمد برقم (٣٨٣٩)، والترمذي برقم (١٩٧٧)، وقال: حسن غريب، وأبو يعلى برقم (٥٠٨٨)، وابن حبان برقم (١٩٢)، والطبراني برقم (١٠٤٨٣)، والحاكم برقم (٢٩)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥١٤٩)، وقال الألباني صحيح.

واتە: ئیماندار تانە لێدەرو، لەعنەتکەرو، قسەی ناشیرینکەرو، زمان شڕ نیە.

بەڵێ ئیماندار نابێ ئەو ڕەفتارە ناشیرینانەی هەبن، بۆیەش کە دەبیستم هەندێك مامۆستا لەسەر مینبەر، قسەی زەق و ڕەق و نارێك و سەیر دەکەن، زۆر نارەحەت دەبم، چونکە مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە کەڵکی قسەی ناشایستەو بێ نەزاکەت نایەت و، جگە لەوتەی هەق و پاك و تەعبیری بەرزی لێ ناوەشێتەوە.

٢- خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویٚ:

﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ١٥٩﴾ آل عمران.

واتە: ئەگەر تۆ قسە ڕەق و دڵڕەق بووای، لە دەورت دەپرژان، کێ لە دەوری دەپرژا؟ هاوەڵان (أصحاب) باشترین کەس لە دوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئنجا لەدەوری کێ دەپرژان؟ لە دەوری باشترین کەس کە پێغەمبەری خوا (محمد)ە (صلی الله علیه وسلم)! تەنانەت ئەگەر پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) قسەی زبر و دڵڕەق (فظ و غلیظ) بووایە، هاوەڵانی بەڕێز و دڵسۆزی لە دەوری دەپرژان، کەواتە: بەهۆی ئەوەوە، کە قسەی شیرینەو، دڵی نەرمەو میهرەبانە، بە دەورییەوە ئاڵاون!

## بـــەرایی

خوێنەری خۆشەویست!

ئەم بەشە کە بەشی دەیەم و کۆتاییە، لەم تەوەری پێنجەمەی بابەتی فراوانی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع دا) تەرخانمان کردوە بۆ توێژینەوە لەبارەی بنەما و بنچینە سەرەکییەکانی دینداریی و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست و هاوسەنگ و، دوور لە کورت هێنان و زێدە ڕۆیی.

ئەوبنەمایانەش کە پێمان وایە بناغەی دینداریيەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ پێك دێنن، ئەم حەڤدە (١٧)یەن کە ناوونیشانەکانیان بەڕیز دێنین و، دواتر هەرکامێکیان لە باسێکی سەربەخۆدا دەخەینەڕوو:

١- ئیسلام تەنیا لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە.

٢- بەبێ تێگەیشتنی قورئان، نازانین ئیسلام چییە؟

٣- ئیسلام بەبێ نوێکردنەوە (تجدید) -تازەکردنەوەی لێتێگەیشتنی- لەژیان بەجێ دەمێنێ.

٤- بناغە لە ئیمان و خوا پەرستییدا، شوێنکەوتنی وەحییە، بەڵام لەبواری هەڵس و کەوتەکان دا، بناغە دەستکراوەیی و داهێنانە، مەگەر لەگەڵ وەحییدا دژ بوەستێ.

٥- شەریعەت لەبواری چەسپاوەکان (ثوابت)دا، چۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، بەڵام لەبواری گۆڕاوەکان (متغیرات)دا، بەکورتیی و گشتیی (إجمال)دواوە.

٦- وەك چۆن ئەسڵ لە شتان دا پاکییە و، لە هەڵس و کەوتان دا ڕەواییە و، لەکەسەکان دا، ئەستۆپاکیی (براءة الذمة)یە، ئەسڵ لە مسوڵمانانیش دا: مسوڵمانەتییە، هەتا پێچەوانەکەی بە بەڵگەیەکی دڵنیاکەر دەچەسپێ.

٧- جگە لەناوی مسوڵمانان (مسلمون) بەکارهێنانیی هەر ناوونیشانێکی دیکە، ناڕەوایە، مەگەر وەك ناوونیشانی سیاسیی و بۆ خەڵکێکی دیارییکراوو، بەبێ خۆپەسندیی و دەمارگیریی.

٨- دڵسۆزیی و بە تەنگەوە بوون (نصیحة) بۆ خوا و خەڵك، جەوهەری دینداریی ڕاست و ساغە.

٩- هاوسەنگیی (إتِّزان) هەوێن و هۆکاری دینداریی ڕاست و ڕەسەنە و، مایەی پارێزرانە لە زێدەڕۆیی و بەزایەدان (إفراط وتفریط).

١٠- گەڕان بەدوایی خاڵە هاوبەشەکان دا و، هاوکاریی یەکدی لەسەرکردنیان و، ڕێزگرتن لە تایبەتمەندییەکانی یەکدی.

١١- قورئان کردنە پێوەر و تەرازوو، بۆ ڕێژەی گرنگیی و بایەخ پێدانی بابەتەکان.

١٢-ئیمان و فەرمانبەریی و ڕەوشتی پەسند، سێ پێکهێنەری بنەڕەتیی مسوڵمانەتیی تاکن.

١٣- بانگەواز بۆ چاکە و، فەرمانکردن بەپەسەند و، ڕێگریی لە ناپەسند، سێ پایەی سەرەکیی کۆمەڵگایەکی سەرفرازن.

١٤- دۆستایەتیی و پشتگیریی یەکدی کردنی بڕوادارانی پیاو و ئافرەت، مایەی بۆ ئەنجامدرانی ئەرکی فەرمان بەپەسنکردن و، ڕێگریی لە ناپەسند کردنیان و، نوێژکردن و زەکاتدان و، فەرمانبەریی کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی و، هۆکاری بەزەیی خوایە بۆیان.

١٥- حەقی ڕەها (الحق المطلق) تەنیا لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە و، پێغەمبەری خاتەمیش گەیەنەر و ڕوونکەرەوە و چەسپێنەری ئەو حەقە بووە،

بۆیە زانا و پێشەوایان، وێڕای ڕێز و پێزانینمان بۆیان، بەڵام هیچ کامیان پارێزراو (معصوم) نین و، دەمارگیریی و تەسلیم بوونی ڕەها بۆ ڕاو بۆچوونی کەس، دروست نیە و، بەرهەمی فیکریی هەرکام لە زانایانیش، پەیوەستە بەو واقیع و بارودۆخەوە کە تێیدا ژیاون.

١٦- هەموو مسوڵمانێك لەسەری پێویستە مشووری کۆمەڵگا و دەوروبەری خۆی بخوات و، پاکسازیی و چاکسازیی تێدا بکات، نەك لەهەڵ و پەڵە و لادان و تاوانەکانیەوە ڕابمێنێ، بەڵام دەبێ زۆر وریابێ و وردەکاریی زۆر لە شێوازەکانی گۆڕانکارییەکەی دا بکات، چونکە مەحاڵە ئایینی تێر و تەواوی ئیسلام، بەشێواز و ئامرازە ناشەرعییەکان، خزمەتی بکرێ.

١٧- پێکهێنانی قەوارەی سیاسیی، وێڕای عەقڵ و واقیع، سروشتی ئیسلام و دەقەکانی شەریعەتیش دەیخوازن و، شێوازی شەرعییانە و سروشتییانەی بنیاتنانی دەوڵەتیش ـ لە ئیسلام دا ـ ئەوەیە کە لەڕێی بانگەواز و هۆشیارکردنەوە و بێدارکردنەوەی خەڵك و کۆمەڵگاو، پەروەردەکردنیانەوە، زەمینەسازیی بۆ بکرێ و، نابێ بەهیچ جۆرێك بیر لەبەکارهێنانی هێز و خۆسەپاندن بکرێتەوە، بۆ بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی.

دەشتوانم بڵێم: ئەو حەڤدە (١٧) بنەمایە، هێڵە گشتییە فیکرییەکانی بەندەن لە بارەی ئیسلامەوە، چ بۆ تێگەیشتنی و، چ بۆ پێوە پابەند بوونی.

بنەمای یەکەم

## ئیسلام، تەنیا لەقورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە:

ئەم ڕاستییەمان زۆر جار گوتۆتەوە، بەڵام هەتا بگوترێتەوە، هەر دەیهێنێ، چونکە دەردی کوشندەی مسوڵمانان ئەوەیە کە وێڕای وەحیی، شتی دیکەشیان لەخۆیان کردۆتە دین، مەبەست لەم ناوونیشانە، ئەوەیە کە جگە لە قورئانی بەپێز و ڕێبازی پێغەمبەری بەڕێز موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، ئەوی دیکە هەرچی کە لەبەر دەستی مسوڵماناندا هەیە، لە:

١- تەفسیرەکانی قورئان.

٢- ڕوونکردنەوەکانی سوننەت.

٣- کتێب و بەرهەمەکانی بوارەکانی: بووناسیی، ئیمان و عەقیدە، عیبادەت، تەزکیەو ئەخلاق، فیقە، ئوصووڵی فیقهـ، سیرە و مێژوو...هتد.

هەمووی بە تێگەیشتنی مسوڵمانان بەگشتی و زانایان بە تایبەت، لەبارەی ئیسلامەوە دادەندرێ، نەك بەخودی ئیسلام، کەواتە: بێجگە لە قورئان و سوننەت، کە وەحیی خوایان تێدا کورت هەڵاتوە، هیچ شتێکی دیکە وەك ئایین پابەندکەر (مُلْزِمْ) نیە بۆ مسوڵمانان، کە نەتوانن لێی لابدەن، بۆ وێنە:

ئەبوبەکر (رضي الله عنه)، یان عومەر (رضي الله عنه) شتێکیان گوتوە، ئایا بۆ ئێمە دەبێتە دینێکی پابەندکەر؟ نەخێر، بەڵێ ئەگەر بڵێن: خوا وایفەرمووە و ئایەت بخوێننەوە، یان فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بگێڕنەوە، ئەو کاتە ئەوان نەقڵی ئایەتەکەو نەقڵی فەرمایشتەکە دەکەن، بەڵام ئەگەر بۆچوونێکی خۆیان بێ، بە ئایین دانانرێ، بۆیەش نموونەم بە ئەبوبەکرو عومەر هێنایەوە خوا لێیان ڕازی بێ، چونکە لە دوای پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) لەوانمان بەرێزترو گەورەترو خۆشەویستتر نیە، پێیان گوتراوە: هەردووك وەزیرەکەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)، بەڵام تەنانەت ئەوانیش، قسەکانیان هەر بۆچوونی ئەوانە، دەربارەی ئەو بابەتە کە لێی دواون، وەك گوتمان: ئەگەر ئایەت بێ، ئەوە ئایەت ئایەتەو، ئەگەر فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بێ، ئەوان نەقڵیان کردوە، بەڵام ئەگەر تێگەیشتن بێ لە ئایەت، یان تێگەیشتن بێ لە فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)، تەماشای دەکەین: دەگونجێ پێکابیان و، دەشگونجێ نەیانپێکابێ، هەرچەندە بە تەئکید هاوەڵان بەگشتی خوا لێیان ڕازی بێ و، لە نێویاندا چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، پێمان وایە لە هەموو کەس باشتر لە ئیسلام تێگەیشتوون و، لە هەموو کەسیش باشتر پێوەی پابەند بوون، بەڵام هەر چۆن بێ: بۆچوونەکانی ئەوان و تێگەیشتنی ئەوان، بەتێگەیشتنی ئەوان دەربارەی ئیسلام دادەندرێ، نەك بەخودی ئیسلام.

کۆتایی ئەم بنەمایەش بەهێنانەوەی ئەم ئایەتە دێنین، کە بەڵگەو بناغەی ئەوەیە کە گوتمان:

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ النساء: ٦٩

بنەمای
دووەم

## بەبێ تێگەیشتنی قورئان، نازانین ئیسلام چییە؟

بەڵێ بەڕێزان! بەبێ لێتێگەیشتنی قورئان، کە نەخشەی گشتیی ئیسلامی گرتۆتە خۆی، نازانین ئیسلام چییە و چۆنە؟ هەربۆیەش نەك هیچ کتێب و بەرهەمێکی هیچ زانا و پێشەوایەك، ناکرێ و ناشێ بکرێتە جێگرەوە (بدیل)ی قورئان بۆ ناسینی ئیسلام و لێتێگەیشتنی، بگرە ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) جێگرەوە (بدیل)ی فەرمایشتی بەرز و بەپێز و بێ وێنەی خوا عزوجل نیە، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا هەموو ئەو ڕاستیی و پایە بنەڕەتیی و ئامانج و مەبەستە گەورە و سەرەکییانەی ئیسلام، کە خوای کاربەجێ و زانا لەقورئان دا فەرمووني و، بەباشترین شێواز خستوونیە ڕوو، مەگەر جاروبار بۆ جەختکردنەوە و داکۆکییکردن، یان بۆ ڕوونکردنەوەی وشەیەکی مانا ناڕوون، بۆ هەندێك لە هاوەڵان، ئەگەرنا بەتەمای قورئان، لەو ڕاستییانەی ئیسلام گەڕاوە و باسی نەکردوون، کەواتە:

هەرکەس بەتەمابێ لەڕێی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) ئیسلام بناسێ، مانای وایە لەڕێی غەیری خۆیەوە بۆ ئامانجێك چووە و پێی ناگات، چونکە ئەرکی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله

علیه وسلم) ناساندنی ئیسلام نیه، بەڵکو پێشاندانی چۆنیەتی جێ بەجێکردن و پڕاکتیزە کردنیەتی لەسەر ئەرزی واقیع.

هەربۆیەش: وەك چۆن بەبێ لێتێگەیشتنی قورئان، نازانین ئیسلام چییە؟ بەهەمان شێوەش:

بەبێ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ناتوانین قورئان پڕاکتیزە بکەین، واتە: هەتا لە قورئان تێ نەگەین، نازانین ئیسلام چییە، ئیسلام بە تیۆریی (نظري) لە قورئاندا بەرجەستەیە و، بەبێ گرتنی ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم)، ئێمە ناتوانین قورئان جێبەجێ بکەین.

کەواتە: ئیسلام وەك ئایین و بەرنامە، لەقورئاندا بەرجەستەیە و، وەك جێبەجێ کردن و لایەنە کردەییەکەشی، سوننەت لە ئەستۆی گرتوە، یانی: بە لێتێگەیشتنی قورئان، ئیسلام فام دەکرێ و، بەگرتنی ڕێبازی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەسەر ئەرزی واقیع و بەکردەوە، ئیسلام جێ بەجێ دەکرێ.

کۆتایی ئەم بنەمایەش بەم دوو ئایەتە دێنین، کە بناغە و هەوێننی:

١- ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الإسراء: ٩.

٢- ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور: ٥٤.

بنەمای
سێ یەم

## ئیسلام، بەبێ نوێ کردنەوە (تجدید) ـ تازەکردنەوەی لێ تێگەیشتنی ـ لەژیان بەجێ دەمێنێ

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گرنگە، بۆ مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست، بەڵێ بە دڵنیایی ئیسلام ئەگەر لێ تێگەیشتنی تازە نەکرێتەوە، لەژیان بەجێ دەمێنێ، باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەو قسەیە، واقیعی ئێستای مسوڵمانانە، کە بەهۆی بەجێمانیان لە ئایینەکەیان و، ڕاست و دروست و هاوچەرخانە لێ تێنەگەیشتنیەوە، لەهەموو ڕوویەکەوە، لە ژیان دواکەوتوو پەککەوتوون!

ئنجا ئەگەر ئێمە بڵێین: مسوڵمانان باش لەئیسلام تێگەیشتوون و، چاکیش پێوەی پابەندن، حاڵیشیان ئەو حاڵەیە! مانای وایە ئیسلام خۆی ناتەواوە! ڕۆژێك مامۆستایەك (مەلایەك) سەردانی کردم، گوێی لە کەسێك بوو بوو مەدحی (داعش)ی کردبوو، کە ئەوکەسە پێشتر ئیسلامیی بووەو، ئێستا - وا دیارە- هەڵگەڕاوەتەوە، هەرچەندە ڕەنگە خۆی بەهەڵگەڕاوەش دانەنێ، بەڵام بێگومان کەسێك ڕقی لە ئیسلام بێ و بیبوغزێنێ، بە مسوڵمان دانانرێ، هەرچەندە پێشتریش مسوڵمان بووبێ.

ئنجا ئەو مامۆستایە هاتبوو گوتی: مامۆستا! فلانكەس كە خەڵكێك زەمی دەكەن و دەڵێن: دژی ئیسلامە! لەسەر تەلەفزیۆن مەدحێكی زۆری داعشی كرد و، دیارە زۆر دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانانە!

ئەوكاتیش سەرەتای پەیدابوونی (داعش) بوو و، جارێ خەڵك نەیناسیبوون، گوتم: چۆن! چی گوت؟ گوتی: دەیگوت: ئەوەی داعش دەیكەن، ئیسلام بۆخۆی ئاوایە و ڕێك ئیسلام جێبەجێ دەكەن! منیش گوتم: مامۆستا گیان! وای لێ حاڵی بووی كە ئەوە دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانانە؟! گوتی: بەڵێ، گوتم: نا، ئەوە دەیەوێ بڵێ: داعش خراپ نیە، ئیسلام بۆخۆی خراپ و غەڵەتە، دەیەوێ بڵێ: خەڵكینە! ڕەخنە لە داعش مەگرن، بڵێن: داعش وای كردو وای كرد، ئیسلام هەر بۆخۆی وایە، یانی: ئەگەر داعش ڕەفز دەكەن، ئیسلامیشی پێوە ڕەفز بكەن!

مەبەستم ئەوەیە: بۆ واقیعی ئێستای مسوڵمانان، یان دەبێ بڵێین: ئێمە لەئیسلام بەجێماوین، هەم لە ڕووی تێگەیشتنی، هەم لە ڕووی پێوە پابەند بوونیەوە، یان دەبێ بڵێین: ئیسلام بۆخۆی هەڵەیە! ئەگەرنا ئەوە حاڵ نیە مسوڵمانانی تێدان، كە لە هەموو ڕوویەكەوە ئێمە پێویستییمان بەغەیری خۆمانە، پەرتەوازەو پەككەوتەو بەجێ ماو، مسوڵمانان لێرە لێیان دەقەمەوێ، ناحەوێنەوە، دەچن لەوڵاتانی كافرستان، دەحەوێنەوە! وەختی خۆی مسوڵمانان وڵاتی مسوڵماننشینیان ناوناوە: (دار الإسلام و دار الأمان) و وڵاتانی كافرستانیان ناوناوە: (دار الكفر و دار الخوف)، چونكە مسوڵمان ئەوكاتە لە وڵاتی خۆیدا حەواوەتەوە و ئەمین بووە لەخۆی، بەڵام ئێستا ئەو شوێنەی كە وەختی خۆی: (دار الكفر و دار الخوف) بووە، ئێستا لەوێ لەخۆی ئەمین دەبێ، چەند بانگخواز لەوێن؟ كە ئەگەر لەوڵاتی خۆی بێ، یان دەیگرن، یان دەیكوژن، مانای وایە مسوڵمانان بەمانای وشە، دواكەوتوون، هەم لە ڕووی چاك لێ تێگەیشتنی قورئان و سوننەتەوە و، هەم لە ڕووی چاك پێوە پابەند بوونیانەوە، بۆیەش واقیعمان وەك ئێستایە و، بەو دەردە چووین!

بۆیەش پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) ڕایگەیاندوە کە هەر ماوە ماوە، خوا کەسانێك دەرەخسێنێ کە ئایین و بەرنامەی ئۆممەتەکەی تازە بکەنەوە، وەك دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ، مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا} أخرجه البيهقي في المعرفة برقم (٤٢٢) عن أبى هريرة، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (٤٢٩١)، والطبراني في الأوسط برقم (٦٥٢٧)، والحاكم برقم (٨٥٩٢)، والخطيب (٦١/٢، ترجمة ٤٥٤)، والديلمي برقم (٥٣٢)، قال المناوي (٢٨٢/٢): قال الزين العراقى وغيره: سنده صحيح، وقال الألباني: صحيح.

واتە: خوا بۆ ئەم ئۆممەتە، لە سەری هەر سەد ساڵێك، کەسانێك دەرەخسێنێ، کە ئایینەکەی بۆ تازە بکەنەوە.

کە مەرج نیە کەسێك بێ، یان کەسێکی دیاریی کراو بێ، گرنگ ئەوەیە بەردەوام پرۆسەی تازە کردنەوەی ئیسلام هەیە لەنێو ئۆممەتدا، تازە کردنەوەی ئیسلامیش یانی: تازە کردنەوەی لێ تێگەیشتنی، کە چاك لێی تێبگەین و، دووبارە پێیەوە پابەند بینەوە.

بنەمای
چوارەم

## بناغە لە بواری ئیمان و خواپەرستییدا: شوێنکەوتنی وەحییە، بەڵام لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا، بناغە دەستکراوەیی و داهێنانە، مەگەر لەگەڵ وەحییدا دژ بوەستێ

بۆیە لە بواری ئیمان و خواپەرستییدا، بناغە بریتیە لە: شوێنکەوتنی (وەحیی) و، پابەند بوون بە شەریعەتەوە، چونکە مامەڵە لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالی، بەس خوا دەزانێ دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ بەڵام لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا، کە مامەڵەی بەینی خۆمانە، ئەوە لە مەودای عەقڵی مرۆڤدایە، بۆیە: بناغە تێیدا دەستکراوەیی و داهێنانە، مەگەر شتێك لەگەڵ دەقێکی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەریعەتدا دژ بوەستێ.

زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعیی لەو بارەوە گوتوویانە: {الأصل في العبادات الحَظْر، إلاّ ما ورد عن الشارع تشريعه، والأصل في العادات الإباحة، الاّ ما ورد عن الشارع تحريمه}[1]، واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا بریتیە لە: قەدەغە بوون، مەگەر ئەوەی کە لە شەرعدانەرەوە بە ڕەوا داندرابێ و، بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا،

---

(١) أصول الفقه المهمة، لعبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص (١٠٥-١٠٦)، هەروەها هەمان مەبەست لە کتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)ی (إبن تيمية)ش دا، هاتوە، ص (١١٢).

بریتیە لە ڕێپێدران، مەگەر ئەوەی کە لە شەرعدانەرەوە قەدەغە کرابێ. یانی: پێچەوانەی یەکدیین، جاری دیکەش باسمان کردوە کە ئەوە زۆر گرنگە براو خوشکانی بەڕێز! ئێمە لەبواری ئیمان و خواپەرستییەکاندا ڕێمان لێ گیراوە و بۆمان نیە هیچ جۆرە خواپەرستییەك بکەین، مەگەر شەریعەت داینابێ، بەڵام بە پێچەوانەوە: لە بواری عادەت و هەڵسوکەوتەکاندا واتە: حوکم و سیاسەت، ئابووریی، بواری ئیداریی، بواری جەنگ و ئاشتیی، پەیوەندییەکان، ژیانی ڕۆژانە.. هتد، هەموو ئەوانە ئەصڵ تێیاندا دەستکراوەیی و، ڕەواییە و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی فڵان شتە قەدەغەیە، ئەگەرنا هەمووی ڕەوایە، گرنگ ئەوەیە بەرژەوەندیی بهێنێتە دی و، خەڵك لە ئەنجامی ئەوەدا، تووشی قازانج و خێرو خۆشیی ببن.



## بنەمای پێنجەم

### شەریعەت لە بواری چەسپاوەکان (الثوابت)دا چۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، بەڵام لە بواری گۆڕاوەکان (المتغييرات)دا، بە کورتیی و گشتیی (إجمال) دواوە

هەمیشە شەریعەت لەبواری ئەو شتانەدا کە ناگۆڕێن و چەسپاون، وردەکارییەکان باس دەکات و خاڵ دەخاتە سەر پیت، بەڵام لە بواری شتە گۆڕاوەکاندا، بە کورتیی و بەگشتیی خوای پەروەردگار سبحانە و تعالى فەرمایشتی کردوە و، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) شتی فەرمووە[1].

ئنجا دەتوانین بڵێین: ئەوانە بوارەکانی نەگۆڕەکان و چەسپاوەکانن: {١- بووناسیی، ٢- ئیمان و عەقیدە، ٣- خواپەرستییەکان، ٤- باری کەسێتیی، ٥- ڕەوشت و ئاکار، ٦- حەڵاڵ و حەرام بە گشتی}، لەم بوارانەدا شەریعەت خاڵی خستۆتە سەر پیت، هەروەها دەتوانین بڵێین، ئەوانەش بوارەکانی گۆڕاوەکانن: {١- ئابووریی، ٢- جەنگ و ئاشتیی، ٣- حوکم و سیاسەت، ٤- ژیان و

---

(١) لە بەشی دووەمی ئەم تەوەرەیەدا {شەریعەتی چەسپاو و ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!}، بەدرێژیی لەوبارەوە دواوین.

گوزەران، ٥- ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، ٦- ئەدەب و هونەر}، ئەوانەش هەموویان شەریعەت بە کورتیی و گشتیی لێیان دواوە و، بە دانانی چەند بازنەیەکی فراوان و چەند هێڵێکی گشتیی، وازی لێ هێناون.

با دوو نموونە بێنینەوە بۆ ڕوونکردنەوە:

**نموونەی یەکەم: لە بواری دەوڵەتدارییدا:**

لە بواری دەوڵەتدارییدا، شەریعەت تەنیا چەند بنەمایەکی داناون، بۆنموونە:

أ- دەبێ فەرمانبەریی بۆ خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و کاربەدەستانێك بکرێ، کە لە ئیماندارانن:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ﴾ (النساء:٥٩).

ب- دەبێ کاروباریان بەڕاوێژ بێ ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ (الشورى:٣٨).

ج- دەبێ ئەمانەتی حوکمڕانیی بە کەسانی شایستە بسپێردرێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

چەند بنەمایەکی کەممان هەن، لەو بوارەدا.

بۆیە (إمام الحرمين الجويني)[1] دەڵێ: {ولا مَطْمَعَ في وجدان نص من كتاب الله تعالى، في تفاصيل الإمامة، والخبر المتواتر مُعْوِزٌ أيضاً، فآل مآل الطلب في تصحيح المذهب إلى الإجماع}[2].

---

(١) (الجويني) پیاوێکی زۆر عەقڵ ئازاد بووە لە ڕۆژگارێکیش دا ژیاوە کە زۆر پاڵی پێوە ناوە ئیجتیهاد بکات، وەك (إبن تيمية) لە زۆر مەسەلەدا ئیجتیهادی کردوە، چونکە لەو کاتەدا هەم دەوڵەتی عەبباسیی هەبووە، هەم دەوڵەتی ئومەویی لە ئەندەلوس هەبووە، بۆ وێنە: گوتوویەتی: لە شەرعدا جێی دەبێتەوە ،مادام وڵاتی مسوڵمانان زۆر لێك دوور بێ و، دەریایان کەوتبێتە بەینێ، ئاساییە دوو خەلیفە هەبن، پێم وایە یەکەم کەس بووە شتی وا بڵێ.
هەروەها باسی: (شغور البلاد من السلطان) دەکا، کە ئەگەر مسوڵمانان حوکمڕانیان نەما، دەبێ چی بکەن؟ دەڵێ: دەبێ مشوورخۆرانیان کار و بار بەڕێوە ببەن و...هتد.

(٢) غياث الأمم، ص١٠٠.

واتە: ئومێد نیە کە دەقێك لە کتێبی خوای بەرز بێنین لە وردەکارییەکانی حوکمڕانیی دا، هەروەها هەواڵی (متواتر)یش هەر کەمە، یان نیە (واتە: فەرمایشت) کەواتە: سەرەنجام دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئیجماع [واتە: داخۆ مسوڵمانان چۆنیان پێ چاکە، دەگەڕێینەوە بۆ عەقڵ و بەکارهێنانی عەقلی خۆیان و ڕاوێژو کۆڕاو یەکدەنگیی].

**نموونەی دووەم: لەبواری خوا پەرستییدا:**

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەلای کەمەوە دووجار لەسەر مینبەری خۆی نوێژی کردوە لەپێش چاوی هاوەڵان و، فەرموویەتی: {وَصَلُّوا كما رَأَيْتُمُونِي أصلي} أخرجه أحمد برقم (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم (٧٨٥)، ومسلم برقم (٦٧٤)، والنسائي برقم (٦٣٥)، وابن حبان برقم (١٦٥٨).

واتە: وەك منتان بینی نوێژم کرد، ئاوا نوێژ بکەن.

ئنجا بۆ حەج و عومرەش بەهەمان شێوە فەرموویەتی: {لِتَأْخُذُوا عَنِّي مناسِكَكُم} أخرجه مسلم برقم (١٢٩٧)، وابن خزيمة برقم (٢٨٧٧).

واتە: خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەم لێوەربگرن.

بەڵام بۆ حوکم و سیاسەت و وڵات بەڕێوە بردن، بەپێی عورف و باوی سیاسیی ڕۆژگاری خۆی ئیستیفادەی کردوە کە ئەو وڵاتە، ئەو قەوارە سیاسییە، چۆن بەڕێوە بەرێ! نەك وەك نوێژەکە بفەرموێ: وەك چۆن نوێژ دەکەم، ئاوا بیکەن، نەهاتوە بفەرموێ: وەك چۆن دەوڵەت بەڕێوە دەبەم، ئێوەش ئاوا بەڕێوەی ببەن! چونکە زانیویەتی بابەتی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی، مامەڵە کردنە لەگەڵ واقیعێکی گۆڕاودا، بۆیە پێویستی بە عەقڵێکی کراوە دەکات و، دەست و پێی مسوڵمانانی نەبەستوە.

تەماشا بکەن! پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی فەرموو، کەسی بۆ جێی خۆی دیاریی نەکرد، بەڵێ بە تەئکید کەسی دیاریی نەکرد،ڕاستە فەرمووی: با ئەبو بەکر نوێژ بە خەڵکی بکات، بەڵام نەیفەرموو: با خەلیفە بێ،

لەدوای من! بۆیەش دوایی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفات دەکات، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دەکەونە مشت و مڕو ڕاجیاییەوە، کە ئەسڵەن جارێ لەکوێی بنێژن؟! هەتا فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، لەکوێ وەفاتیان کرد، دەبێ لەوێ بنێژرێن، ئیدی لە ژوورەکەی دایکمان عائشەدا خوا لێی ڕازی بێ، دەنێژرێ.

ئنجا ڕاوێژ و مشت و مڕدەکەن، چۆن ئەو بۆشاییەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجێی هێشتوە، پڕی بکەنەوە؟ ئنجا ئەگەر دەقێك هەبووایە وەك شیعە دەڵێن، یەکسەر دەیانگوت: فلانکەس، جێگرەوەیەتی، بەڵام مشت و مڕیان بۆیە بووە و، بۆیە خراوەتەوە ڕاوێژەوە، چونکە دەق (نص) نەبووە، ئەگەرنا: {لا اجتهاد في معرض النص} لە بەرانبەر دەق دا ئیجتیهاد نیە.

مەبەستم ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حوکمڕانیی و وڵات ئیدارەدانی، بۆ عەقڵی خۆیان بەجێی هێشتوە، چونکە زانیویەتی کە ئەو دنیا گۆڕاوە، پێویستیی بە عەقڵێکی ئازادو کراوە دەکا، بەڵام بۆ نوێژو حەج و عومرە و عیبادەت بەگشتیی، بەوردیی بۆی دیاریی کردوون، چونکە زانیویەتی ئەوبوارە گۆڕانی بەسەردا نایەت و، پەیوەندیی بە جەوهەری مرۆڤەوە و بەخواوە و، بە دیوی پەنهان (غیب)ەوە هەیە و، گۆڕانی بەسەردا نایەت،، بۆیەش زانایان ئەم بنچینەیان داناوە کەدەڵێ: {إجمالٌ في المتغييرات تفصيلٌ في الثوابت} واتە: بە کورتیی قسە کردن لە بارەی گۆڕاوەکانەوە و، بەدرێژیی قسە کردن لەباری نەگۆڕەکانەوە.

# بنەمای شەشەم

## وەك چۆن ئەسڵ لە شتاندا پاكییە و، لە هەڵسوكەوتاندا ڕەوایییە و، لە كەسەكاندا ئەستۆ پاكییە، بەهەمان شێوەش: ئەسڵ لە مسوڵمانانیشدا، مسوڵمانەتییە، هەتا پێچەوانەكەی بەبەڵگەیەكی دڵنیاكەر دەچەسپێ

پێم وایە هەمووتان ئەوەتان بیستوە كە زانایان دەڵێن: {الأصل في الأشياء: الطهارة، والأصل في العادات: الإباحة، والأصل في الأشخاص: براءة الذمّة}، ئەوانە هەموویان بنچینەی شەرعیین:

١- بناغە لە شتەكاندا: پاكییە و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی ئەو شتە پیسە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا هەموو شتەكان، پاكن، دیارە ئەو شتانەی كە لە خودی خۆیاندا پاكن، بەڵام گۆشتی بەراز، هەروەها ئەو شتەی شەرع بە پیسی دانابێ، پیسە و ئەوە جیایە

٢- ئەسڵ لە هەڵسوكەوتەكاندا: ڕێپێدرانە و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر ڕێ لێگیران.

٣- ئەسڵ لە شەخسەكاندا: بریتیە لە ئەستۆ پاكیی و، بێ گوناهیی و، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر تاوانباریی.

ئنجا بەهەمان شێوە: ئەسڵیش لە مسوڵماناندا، ئەوەیە کە هەر کەسێك گوتی: مسوڵمانم، دەبێ بڵێین: مسوڵمانە و، دەبێ مامەڵەی مسوڵمانانەی لەگەڵدا بکرێ، هەتا بەڵگەیەکی ڕوون و بێ چەندو چوونی پێچەوانەی ئەوە دەبێ و، دەیسەلمێنێ کە ئەو کەسە هەرچەندە دەڵێ: مسوڵمانم، بەڵام مسوڵمانەتییەکەی هەڵوەشاوەتەوە، دەبێ بەڵگەی دڵنیاکەر هەبێ.

خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرمویێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا ﴾ (النساء:٩٤).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر بەڕێی خوادا ڕۆیشتن (بۆ جەنگ و جیهاد) بەرچاوی خۆتان ڕوون بکەنەوە و، بەرپێی خۆتان ببینن و، هەر کەسێك سڵاوی لێکردن، پێی مەڵێن: بڕوادار نی!.

## بنەمای حەوتەم

### بێجگە لەناوی مسوڵمانان (مسلمون) بەکارهێنانی هەر ناوونیشانێکی دیکە، -وەك بناغە بۆ دۆستایەتیی (موالاة)- نارەوایە، مەگەر وەك ناوونیشانی سیاسیی و بۆ خەڵکێکی دیاریی کراو

خوا عزوجل یەك ناوی لێناوین، وەك لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)دا، دەفەرموێ:

﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ... ﴾.

واتە: ئەو (خوا) ناوی لێ ناون مسوڵمانان، لەپێش داو لەمەشدا (لەم قورئانەشدا) بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەسەر ئێوەوە شایەد بێ و، ئێوەش شایەد بن بەسەر خەڵکەوە.

هەڵبەتە پێشتریش (لە تەوەری دووەمدا) باسی ئەو مەسەلەیەمان کرد و تیشکی باشمان خستەسەری و، ڕوونیشمان کردەوە لەبەرچی ڕەوا نیە دۆستایەتیی (موالاة) لەسەر هیچ ناوێکی دیکە جگە لەناوی: (مسوڵمانان) بنیات بنرێ،

تەنانەت بەناوی (ئەهلی سوننەت و جەماعەت)یشەوە؟ لەوێ هۆکارەکانمان باس کردن، بەڵام لەبەر گرنگیی، لێرەش ئاماژەیەکمان پێکرد.

ئنجا ئەگەر کەسێك بڵێ: ئەدی ناوەکانی: کۆمەڵی ئیسلامیی و، یەکگرتووی ئیسلامیی و، حیزبی تەحریرو، (الإخوان المسلمون)و چی و چی؟! دەڵێین: ئەوانە هەموویان وەك ناوونیشانێکی سیاسیی و بۆ خەڵکێکی دیاریی کراون، چونکە کە تۆ دەڵێیی: (کۆمەڵی ئیسلامیی)م، واتە: وەك قەوارەیەکی سیاسیی و، وەك خەڵکێك کە لەو چوارچێوەیەدا کۆبوونەتەوە.

ئنجا کەس ناڵێ: هەرکەس ئەو ناوونیشانەی لەسەر نەبێ، لەو چوارچێوەیەدا نەبێ، دۆستایەتیی لەگەڵدا ناکەم و، لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام حیسابی دەکەم!! بەڵام ئەو وشانەی کە مەبەست پێیان خەڵکێکی دیارییکراو و قەوارەیەکی سیاسیی نیە، وەك (سەلەفیی) و (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) و هەر ناوێکی دیکە، ئەو ئیشکالانە پەیدا دەکا.

# بنەمای هەشتەم

## دڵسۆزیی و بە تەنگەوە بوون (نُصْح) بۆ خوا (عزوجل) و خەڵك، جەوهەری دینداریی ڕاست و ساغە

دەبێ دڵسۆز بین و بە تەنگەوە بین، هەم بۆ خوا (عز وجل) و، هەم بۆ خەڵکی خوا، ئا ئەوە جەوهەری دینداریی و مسوڵمانەتیی ڕاست و ساغە، خوا سبحانە و تعالی لەوبارەوە دەفەرموێ:

١- ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾ النساء.

واتە: دینداریی کێ چاکترە لەهی کەسێك، کە ڕووی خۆی بەخوا سپاردوە و چاکەکاریشە و، بەپاکیی شوێن ڕێبازی ئیبراهیم کەوتوە و، خواش ئیبراهیمی کرد بە دۆست و خۆشەویستی خۆی.

لێرەدا خوا سبحانە و تعالی کەسێك بەخاوەنی باشترین دینداریی دەزانێ، دوو سیفەتی تێدا بن:

أ- (أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ)، یانی: (أخلص وَجههُ لله)، خۆی بۆ خوا ساغ و یەکلا کردۆتەوە.

ب- (وَهُوَ مُحْسِنٌ) چاکەکاریشە، واتە: لەگەڵ خەڵکی خوادا چاکەکارەو، بۆ خواش ساغ و یەکلایە.

٢)- هەروەها لەسوورەتی (الحج)، ئایەتی (٧٧)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕکووع بەرن و، کڕنووش بەرن و، پەروەردگارتان بپەرستن و، چاکە بکەن، بەڵکو سەرفراز بن.

﴿وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ﴾ پەروەردگارتان بپەرستن و، چاکە بکەن، یانی: چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکەن.

٣)- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {الدِّينُ النَّصِيحَةُ، قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ} أخرجه أحمد برقم (١٦٩٨٢)، ومسلم برقم (٥٥)، وأبو داود برقم (٤٩٤٤)، والنسائي برقم (٤١٩٧)، وأبو عوانة برقم (١٠١)، وابن خزيمة في السياسة كما في إتحاف المهرة للحافظ برقم (٢٤٥٦)، وابن حبان برقم (٤٥٧٤)، والبغوي في الجعديات برقم (٢٦٨١)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (٥٢٦٥)، وأبو نعيم في المعرفة برقم (١٢٩١)، وأخرجه أيضا: الطبراني برقم (١٢٦٧)، وابن عساكر (٥٤/١١).

[(دین) لێرەدا بەمانای دینداریيە]، واتە: دینداریی بریتیە لە دڵسۆزیی، گوتمان: بۆ کێ؟ فەرمووی: بۆ خوا و، بۆ کتێبی خوا و، بۆ پێغەمبەری خوا و، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان و، بۆ مسوڵمانان بە گشتیی.

# بنەمای نۆیەم

## هاوسەنگیی (إتّزان) هەوێن و هۆکاری دینداریی ڕاست و ڕەسەنەو، مایەی پارێزرانە لە زێدەڕۆیی و بە زایەدان (إفراط والتفریط)

١)- خوای کارزان و شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ (البقرة: ١٤٣).

واتە: ئاوا ئێوەمان کردوە بە کۆمەڵێکی میانجیی، تاکو شایەد بن بەسەر خەڵکەوەو، پێغەمبەریش بەسەرتانەوە شایەد بێت.

٢)- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا کە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لێیان ڕازی بێت، فەرمایشت دەکات، کاتێك دەبیستێتەوە کە عەبدوڵڵا زۆر خۆی ماندوو دەکات: لە بەڕۆژوو بوون و شەونوێژو تاعەت دا، لێی دەپرسێ: بیستوومە: ئاوا زێدەڕۆیی دەکەی لە تاعەت و عیبادەتدا؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاریی دەکا و دەفەرموێ: {فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقًّا} أخرجه أحمد برقم (٦٨٦٧) والبخاري برقم (١١٠٢)، ومسلم برقم (١١٥٩) والنسائي في الكبرى برقم (٢٩٢٣).

واتە: بە دڵنیایی جەستەت مافی لەسەرتە و، چاوەکانت مافیان لەسەرتە [ئینسان ئەگەر تێر نەخەوت، چاوی ئاڵۆز دەبن] و، هاوسەرت مافی لەسەرتە و، میوانیشت[١] [کە سەردانت دەکات] مافی لەسەرتە.

٣)- هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەی سوننەتیش هەیە: {آخَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ سَلْمَانَ وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً، فَقَالَ لَهَا: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: أَخُوكَ أَبُو الدَّرْدَاءِ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا، فَجَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا، فَقَالَ: كُلْ، فَإِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ، قَالَ: فَأَكَلَ، فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ، قَالَ: نَمْ فَنَامَ، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ، فَقَالَ: نَمْ، فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، قَالَ سَلْمَانُ: قُمْ الْآنَ فَصَلَّيَا، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ: صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدَقَ سَلْمَانُ} أخرجه البخاري برقم: (٦١٣٩).

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەبو دەدەرداء و سەلمانی کردبوون بە برا، سەلمان سەردانی (أبوالدّرداء)ی کرد، (أم الدّرداء)ی بینی دەستی بەخۆیدا نەهێنابوو، گوتی: بۆچی ئاوای؟ گوتی: (أبو الدّرداء)ی برات هیچ کاری بەدنیا نیە!

ئنجا ئەبو دەدەرداء گەڕایەوە و خواردنێکی بۆ سەلمان سازکرد، پێی گوت: بخۆ، چونکە من بەرۆژووم، سەلمان گوتی: ناخۆم تاکو نەخۆی، ئیدی ئەبو دەدەرداء خواردی {واتە: سەلمانی فارسیی رۆژووە سوننەتەکەی پێ شکاند، دیارە سەلمان برا گەورەی بووە، لە ئەبودەدەردائیش باشتر لەدین تێ گەیوە هەردووکیشیان خاوەنی رێزو حورمەتن} دوایی شەوێ ئەبو دەدەرداء دەیەوێ هەڵسێ بۆ شەو نوێژان، سەلمان دەڵێ: جارێ بنوو {دیارە هەر لەسەرەتای شەوێوە دەستی کردوە بە شەونوێژان تاکو بەیانی} دوایی دیسان دەیەوێ هەڵسێ، سەلمان دیسان دەڵێ: جارێ بخەوە.

ئنجا لەکۆتایی شەوێدا سەلمان دەڵێ: ئێستا هەڵسە، ئیدی پێکەوە شەونوێژێ دەکەن.

---

(١) زَوْر: ضيف = میوان.

دوایی سەلمان پێی دەڵێ: بەدڵنیاییی پەروەردگارت مافی لەسەرتە و، جەستەت مافی لەسەرتە و، خێزانت مافی لەسەرتە، ئنجا هەر خاوەن مافێك، مافی خۆی پێ بدە!

دوایی ئەبو دەرداء دەچێ بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەوەی بۆ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {صدق سلمان}، واتە: سەلمان ڕاستی کردوە.

مەبەستم ئەوەیە ئەگەر مسوڵمانەتیی و دینداریی بەهاوسەنگیی بگیرێ، ئەوە هەوێن و هۆکاری تەباییە، چونکە سەرنج بدەن! بەزۆریی وایە ئینسان کە بە لایەکدا تێدەپەڕێنێ، دوایی خۆی زۆر پێ موهیمە و، بەکەم تەماشای خەڵکی دیکەدا دەکات! هی وا هەیە بە دوو سێ سوننەتانەوە سەرقاڵ بووە، ئەو دوو سێ سوننەتەی لە خۆی کردوونەتە پایەی گەورەی ئیسلام! دەلینگی وابێ و، ڕیشی وابێ و، پەنجەی وا لێ بکاو، خێزانی دەبێ پەچە (نقاب)ی هەبێ و، هەندێ لەو وردە شتانە، ئنجا کە ئەو شتانە دەکا، پێی وایە لە دینداریيدا گەیشتۆتە لووتکە، ئیدی خەڵکی دیکە: ئەگەر زۆر زۆر لەو عاقڵترو بەدیندترو بۆ خوا صوڵحاوتر بن، مادام دەلینگیان کورت نەبێ و، پەنجە نەجووڵێنن و، ڕیشیان زۆر درێژ نەبێ و، خێزانیشیان پەچەی نەبێ، پێی وایە: مسوڵمانەتییەکەیان ناتەواوە و، هی خۆشی زۆر پێ تەواوە!!

جارێکیان برایەکی خۆم (برای باب و دایکییم) من نوێژم دەکرد ئەویش گوتی: کاکە! ئەوە چۆنە ئەو سوننەتە جێ بەجێ ناکەی، پەنجە ناجووڵێنی لە تەحییاتدا؟ منیش گوتم: بۆچی؟ گوتی: ئاخر ئەوە سوننەتە، گوتم: چۆنت زانی؟ گوتی: دەرسم خوێندوە، گوتم: لەلای کێ؟ گوتی: لەلای فلان کەس، گوتم: چەند دەرس؟ گوتی: هەر یەك دەرسم خوێندوە، گوتم: زۆر باشە، بەڵام ئەگەر چوویەوە لای مامۆستایەکەت، سەلامی منی پێ بگەیەنە و، بڵێ: کاکم گوتوویەتی: دینداریی لە پەنجەوە دەست پێ ناکا، لەعەقڵ و دڵەوە دەست پێ دەکا!

تۆ جارێ بزانە: چەند لەدین تێگەیشتووی، چەندە خوا دەناسی؟ چەندە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەناسی؟! چۆن وا زوو گەیشتیە قامکێ؟!

# بنەمای دەیەم

## گەڕان بەدوای خاڵە هاوبەشەکانداو، هاوکاریی یەکدی لەسەر کردنیان و، ڕێزگرتن لە تایبەتمەندییەکانی یەکدی

کەسی وا هەیە، بەردەوام بەدوای خاڵی جیاوازدا دەگەڕێ! تۆ دەبێ لەگەڵ نامسوڵمانانیشدا، بەدوای خاڵی هاوبەشدا بگەڕێی، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴿٦٤﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بڵێ خاوەن کتێبەکان! وەرن بۆ وشەیەك، کە هەمووومان تێیدا هاوبەشین، واتە: بۆ خاڵە هاوبەشەکان وەرن، دوایی سێ خاڵی هاوبەش باس دەکا:

﴿ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾.

واتە: باجگە لەخوا نەپەرستین و، هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی و، هەندێکمان هەندێکمان لە جیاتی خوا نەکەینە پەروەردگار.

ئێستا کە باسی ئەوە دەکرێ: زانایەکی ئیسلام پاپای بینی، یان سەردانی مەسیحییانی کرد، یان لەگەڵ جوولەکان دا دانیشت، کەسی ناحاڵیی وا هەیە

یەکسەر دەڵێ: ئەوە ناشەرعییە، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەصرانییەکانی نەجران هاتن لە مزگەوتەکەی خۆیدا موناقەشەیان لەگەڵدا دەکرد، دەیانگوت: عیسا (سەلامی خوای لێبێ) کوڕی خوایە! سێ ڕۆژان لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) خەوتن، دواییش ئیمانیان نەهێناو گەڕانەوە و گوتیان: سەرانە دەدەین[١].

بەڵێ ئەهلی ئیسلام زۆر پشت ئەستوورن بە ڕاستێتیی ئایینی خۆیان و، ناترسێن لە ڕوو بەڕوو بونەوەو، خەڵك بینین و کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەڵ خەڵك.

ئێستا ئەگەر ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا کە بەڕاستیی نەصرانیین [هەر چەندە دینەکەیان گۆڕاوە، بەڵام ئەو ئینجیلانەی ئێستاش هەن، ئەگەر لەگەڵیان ڕاست بکەن: نابێ گۆشتی بەراز بخۆن و، زینا حەرامەو، شەڕاب خواردنەوە لانی کەم بە شتێکی ناپەسند دانراوە] بەڵێ ئەگەر لەگەڵ ئەوانەدا کە بەڕاستیی نەصرانیی بن، کۆببینەوە و بڵێین: وەرن با پێکەوە بەرەیەك پێك بێنین، بەرەیەکی ئەخلاقیی بۆ پاراستنی خێزان و هەڵنەوەشاندنەوەی خێزان - کە ئێستا لە ئەورووپا گەورەترین مەترسیی هەڵوەشانەوەی خێزانە، هاوسەرگیریی، یەك ڕەگەزیی هەیە، دوو پیاو پێکەوە، یان دوو ژن، ژن خۆی دەکاتە پیاو، پیاو خۆی دەکاتە ژن! - ئەگەر کارێکی وا بکەین، بۆچی خراپە؟!

یان خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، کە تۆکمەییان هەیە لە بواری خێزان دا، ئایا ئەگەر لەگەڵ ئەوان بڵێین: وەرن بۆ خاڵە هاوبەشەکانمان: یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج، ئەوانە خاڵی هاوبەشن لە بەینماندا، چی تێدایە؟ بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا ئێمە کەوتووینەتە حاڵەتێکی بێ هێزیی و بێ دەسەڵاتیی، هەر لە کەوڵی خۆمان دا بجووڵێین، پێمان وایە: ئیمانەکەمان هەڵدەوەشێتەوە، ئەگەرنا وەختی

---

(١) پێشتر ئەو بەسەرهاتەمان (تخريج) کردوە، لە بەشی چوارەم دا: [هاووڵاتێتیی نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا: ماف و ئازادییەکان]، بڕوانە: صحيح البخاري: ٤١١٩، هەروەها: أخرجه الطبراني في الأوسط: ٣٩٨.

خۆی کە دەوڵەتی ئیسلامیی هەبووە، شاندی جۆرا و جۆر لە ئەورووپاوە، لە ئەفریقیاوە، لە ئاسیاوە: نەصرانیی، جوولەکە، بووزایی، بتپەرست...هتد، هاتوون و مسوڵمانان لەگەڵیان دانیشتوون و، زانایانی ئیسلام موناقەشەیان لەگەڵدا کردوون، ئەوان کتێبیان نووسیوە دژی ئیسلام و، مسوڵمانان بەرپەرچیان داونەتەوە و، هەر گوێشیان لێ نەبووە، چونکە ئیسلام پشت ئەستوورە بەخۆی.

ئنجا با سەرنجی دوو فەرمایشتی خوای زانا و شارەزا بدەین:

١)- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ ٱشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمران،

واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان! وەرن بۆ وشەیەك کە یەکسانە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا: با تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەین و، هیچ شتێك نەکەینە هاوبەشی و، هەندێکمان لە جیاتی خوا هەندێکیان نەکەینە پەروەردگار و مشوورخۆر، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد بڵێن: شایەدیی بدەن کە ئێمە ملکەچین (بۆ خوا).

٢)- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٢)دا دەفەرموێ: ﴿...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾.

واتە: هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی.

واتە: لەگەڵ نامسوڵماناندا، چونکە سیاقی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ، وەك لە هەندێك لە کتێبەکانی خۆمدا هەموو ئایەتەکەم هێناوە، چونکە سیاقەکە هەمووی قسە کردنە لەگەڵ مسوڵمانان، لەبارەی مامەڵە کردنیانەوە، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوادانەران دا.

# بنەمای یازدەیەم

## قورئان کردنە پێوەرو تەرازوو، بۆ ڕێژەی گرنگیی و بایەخ پێدانی بابەتەکان

ئەمەش زۆر بنەمایەکی گرنگە، براو خوشکانی بەڕێز! ئێمە دەبێ قورئان بکەینە پێوەر و تەرازوو و دڵنیابین کە بە ئەندازەو بەڕێژەی ئەوە، کە قورئان گرنگیی بە شتێك دەدا، ئەو شتە گرنگە، لەدینداریی و، مسوڵمانەتیی دا، هەروەها بە ئەندازەی ئەوە کە قورئان کەمتر گرنگیی پێداوە، کەمتر گرنگە.

بۆنموونە: تەماشا بکەن! لە چەند ئایەتاندا خوا سبحانە و تعالی باسی خوا بە یەکگرتن و باسی خواپەرستیی (توحید و عبادة)ی کردوە؟ بێگومان لەزۆر ئایەتان دا، هەروەها لەچەند ئایەتاندا، خوا باسی پێغەمبەران (علیهم السلام) دەکات؟ باسی ڕۆژی دوایی دەکات؟ باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکات؟ باسی فریشتەکان دەکات؟ باسی کتێبەکانی خۆی دەکات؟ باسی پایەکانی ئیمان دەکات؟ بێگومان زۆر ئایەت لەو بارانەوە هەن، ئەدی ئایا لە چەند ئایەتاندا بۆ وێنە: خوا سبحانە و تعالی، باسی ئەوە دەکات کە ئافرەتان دەبێ سەرپۆشیان لەسەر بێ؟ تەنیا دوو ئایەت:

١- ئایەتەکەی سوورەتی (النور) ئایەتی ژمارە (٣٣): ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ النور، واتە: با بە سەرپۆشەکانیان یەخەو بەرۆکیان داپۆشن..

**٢-** ئایەتەکەی سوورەتی (الأحزاب): ﴿يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ﴾ الأحزاب.

واتە: با چارشێو (یان پۆشاك)ەكەیان لە خۆیانەوە بپێچن..

هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: تەنیا ئایەتەکەی سوورەتی (النور) دەربارەی سەرپۆشە و، ئەوەی (الأحزاب) دەربارەی کۆی پۆشاکە.

کە واتە: ڕاستە ئافرەتان پێویستە سەرو قژی خۆیان داپۆشن، بەڵام بە ئەندازەی ئەو یەك ئایەتەی کە خوا باسی کردوە، بە ئەندازەی ئەوە گرنگە، ئەدی ئیمان و تەقوایان و، عیبادەتیان بۆ خواو، ڕەوشتی بەرزیان و، ڕاستگۆییان و، ئەمانەتیان، ئەوانە چەند گرنگن؟! ئەوانەش بە ئەندازەی ئەوە کە ئایەتەکان باسیان کردوە.

هەروەها هەموو شتەکانی دیکەش هەر وان، ئێمە دەبێ قورئان بکەینە پێوەر: بە ئەندازەی ئەوە کە قورئان گرنگیی بە شتێك دەدا، ئەگەر لە سەد (١٠٠) ئایەتدا باسی کردبێ، بایی ئەو سەد (١٠٠) ئایەتە گرنگە و، ئەگەر لە ئایەتێکدا باسی کردبێ، بایی ئەو یەك ئایەتە گرنگە، هەر گرنگە بەڵام بە قەدەر ئەوە، دەبێ ڕێژە (نسبة)کەی لە قورئان وەربگرین، نەك لە میزاجی خۆمان! بۆ وێنە: مەسەلەی تەوقەکردنی پیاو لەگەڵ ئافرەت: ئەوە پرسێکی خیلافییە، بەڵام هەندێك وایان لێ کردوە کە ئەگەر کەسێك لەگەڵ ئافرەتێکدا تۆقەی کرد، وەك گوناهێکی زۆر گەورەی کردبێ! کە بەڵێ گوناهە، بەڵام گوناهێکی گچکەیە، ئەویش لەسەر ڕای ئەوانەی کە دەڵێن: گوناهە، هەندێکیش دەڵێن: موباحە و، زانای گەورە: (د.یوسف القرضاوي) بە شتێکی موباحی دەزانێ، بەڵام (عبدالله بن یوسف الجديع) کە زانایەکی موعتەبەرە دەڵێ: تەنیا شتێکی ناپەسەند (مکروه)ە.

بۆیە ئەگەر مسوڵمانێك شتێکی وای کرد، نابێ لەبەر چاومان بکەوێ! لەبیرمە کاتی خۆی (أحمد شاه مسعود) لەگەڵ ئافرەتێکی بەرپرسی فەرەنسایی دا تۆقەی کرد، کەسانێك لەبەر ئەوەندە تۆقە کردنەی، خەریك بوو هەر لە بازنەی ئیسلام و ئیمانی ببەنە دەرێ! لە حاڵێك دا ئەوە گوناهێکی گچکەیە و، غەیبەت

کردنەکەی زۆر لەوە گەورەترە، هەروەها: درۆ کردن و ئەمانەت نەپاراستن و... هتد، مەبەستم ئەوەیە گرنگە ئێمە عەقڵ و میزاج و بڕیاری خۆمان، بێنینەوە سەر تەرازووی شەریعەت، نەك میزاجی خۆمان بکەینە پێوەر، یان بکەوینە ژێر کاریگەریی عورفی کۆمەڵگا.

ئنجا بە هەردوو بارەکاندا هەروایە: بەباری سەختگیرییدا و، بە باری شلگیرییشدا، بۆ وێنە: لە هەندێ شوێنان شایی و ڕەشبەڵەك دەکرێ، دەگوترێ: ئەوە عادەتێکەو کلتوورێکە! نا ئەوە حەرامە، بەڵام لەقەدەر خۆی حەرامە و، کەسی پێ لە دین دەرناچێ، خوای کارزان مادام بە کوشتن (قتل)ێ مسوڵمانانی لە ئیمان نەبردوونەدەر، کە بە تەئکید قەتڵ گەورەترین گوناهە لەدوای شیرك و کوفر، مانای وایە بەشتی دیکە، چاکتر لە بازنەی ئیمان ناچنە دەر:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾ (الحجرات: ٩).

واتە: هەر کات دوو کۆمەڵ لە بڕواداران پێکەوە بەشەڕهاتن، ئاشتەواییان لە بەین دا بکەن.

لەو بارەوەش ئاماژە بە دوو ئایەت دەکەین وەك نموونە:

١)- خوای تاك و پاك دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ﴿١٧﴾ ﴾ الشورى.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە کتێبی دابەزاندوە بە حەق و، تەرازووشی دابەزاندوە، یاخود: کتێبی بەهەق و تەرازوو دابەزاندوە.

چونکە:

أ- ئەگەر بخوێندرێتەوە: (بالحقِّ والميزانِ) واتە: بەحەق و بە تەرازوو دایبەزاندوە.

ب- بەڵام ئەگەر بخوێندرێتەوە: (بالحق والميزانَ) یانی: خوا وەك چۆن کتێبی دابەزاندوە، تەرازووشی دابەزاندوە.

مانایەکەشیان هەروەك یەکیان لێ دێتەوە.

کەواتە: ئەم کتێبەی خوای پەروەردگار، بەتەرازوو هاتوە و، هەر بابەتێك لە بارەیەوە دەدوێ، بەتەرازوو لە بارەوەیە دەدوێ.

٢)- لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١١٥)دا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾

واتە: وشەی پەروەردگارت تەواو بووە، لەڕووی ڕاستیی و دادگەرییەوە، گۆڕان نیە بۆ وشەکانی و، خوا بیسەری زانایە.

وشەکانی پەروەردگار تەواویان کردوە لە ڕاستیی و لە دادگەرییدا، چونکە، قسە بە گشتی دوو جۆرە: یان هەواڵە، یان حوکمە، ئنجا وشەکانی خواش هەموو هەواڵەکانی ڕاستن و، هەموو حوکمەکانیشی دادگەرانەن، هەر بۆیەش ناگونجێ وشەکانی خوا بگۆڕێن، وەرن ئەزموونی بکەن: بزانن داخۆ وشەیەکی دیکەی عەرەبییش بێتە شوێن وشەیەکی قورئان، واتایەکەی تێك ناچێ؟!

چونکە ڕستەی: (لا مُبَدِّلَ لكلماتة) وەك چۆن ئەو مانایەی هەیە کە هەواڵەکان و حوکمەکانی خوا گۆڕانیان بۆ نیە، ئەو مانایەشی هەیە کە: وشەکانی کە قورئانیان لێ پێك هاتوە، ناگونجێ بگۆڕدرێن، هەر وشەیەك لابەرە و بیگۆڕە بە وشەیەکی دیکەی عەرەبییش، واتاکەشی بدات، هەر لەنگ و لار دەردەچێ.

# بنەمای دوازدەیەم

## ئیمان و فەرمانبەریی و ڕەوشتی پەسەند، سێ پێکهێنەری بنەڕەتیی موسڵمانەتیی تاکن

بەڵێ مسوڵمانەتیی مرۆڤ وەك تاك، سێ پێکهێنەری بنەڕەتیی هەن:

١- ئیمان.

٢- فەرمانبەریی.

٣- ڕەوشتی پەسەند.

(الإيمان والطاعة والخُلُق الحسن)، ئەمەم لەم دوو ئایەتە موبارەکەی سووڕەتی (إبراهيم) وەرگرتوە، کە خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

واتە: ئایا سەرنج نادەی! چۆن خوا وێنەی هێناوەتەوە بۆ وشەیەکی پاك و چاك، بە درەختێکی پاك و چاك، بنکەکەی چەسپاوە و، لق و پۆپەکانی بەرز

بوونەتەوە، هەموو کاتێك بە فەرمانی خاوەنەکەی (بە فەرمانی پەروەردگاری) میوە دەردەکا، خوا وێنان دێنێتەوە بۆ خەڵك، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن.

خوا سبحانە و تعالی وشەی پاك و چاك - کە هەموو زانایان دەڵێن: مەبەست پێی وشەی خوا بەیەکگرتن (توحید)ە، (لا إله إلاّ الله)- بەراورد دەکات و دەیشوبهێنێ بە درەختێکەوە و، درەختەکەش دەکات بە سێ بەش:

١- بنك (أَصل).
٢- لق (فَرع).
٣- میوە (أُكُل).

ئنجا ئەسڵەکەی بنکەکەیەتی و چەسپاوە و، لق و پۆپەکان بەرزبوونەتەوە، بەر و میوەکەشی چوار فەسڵەیە، مسوڵمانەتییش ئەو سێیەیە: ئیمان و عەقیدەیە، کە لە عەقڵ و دڵدا جێگیر دەبێ، وەك چۆن درەختەکە بنك و ڕیشەکەی لە زەوییدا جێگیر دەبێ، دەبێ مسوڵمانەتییش، ئیمان و عەقیدەکەی لە عەقڵ و دڵدا جێگیر بێ، ئنجا وەك چۆن درەختەکە لق و پۆپەکانی بەرز دەبنەوە، ئەو ئیمان و عەقیدەیەش کە جێگیر بوو، ئەو جار ڕەنگ دەداتەوە لەسەر ئەندامەکانی مرۆڤ، دواییش وەك چۆن درەختەکە میوە دەردەکا، بەهەمان شێوەش: ڕەوشتی پەسەندو ئاکاری جوان و سیفەتی بەرز و جوان، لەو مرۆڤەدا پەیدا دەبن.

بنەمای
سێزدەیەم

## بانگەواز بۆ چاکەو، فەرمان کردن بە پەسەند و، ڕێگریی کردن لە ناپەسەند، سێ پایەی سەرەکیی کۆمەڵگایەکی سەرفرازن

تاکێکی مسوڵمان، دەبێ ئەم سێ یەی هەبن:

١- ئیمان و عەقیدە و.

٢- تاعەت و بەندایەتیی بۆ خوا.

٣- ڕەوشت و ئاکاری پەسەند.

بەڵێ تاکێکی مسوڵمان (مرۆڤ) دەبێ ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و دامەزراوی هەبێ لە عەقڵ و دڵیدا و، تاعەت و بەندایەتییەکی باشی هەبێ، لە جەستەیدا دەربکەوێ و ڕەنگ بداتەوە لە سەر ئەندامەکانی و، ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزو جوانی هەبێ، کە لە مامەڵەکردن لەگەڵ خواو خەڵکدا، خۆییان پێ بڕازێنێتەوە.

ئەوە بە نسبەت تاکەوە، بەڵام بە نسبەت کۆمەڵگایەکی مسوڵمانەوە:

١- بانگەواز بۆ چاکە و،

٢- فەرمان کردن بە پەسەند و،

٣- ڕێگریی کردن لە ناپەسەند.

لە هەموو بوارەکان دا، ئەوانە سێ پایەی سەرەکیی کۆمەڵگایەکی سەرفرازن، ئەمیشم لەم ئایەتە موبارەکە وەرگرتوە، کە خوای پەنهانزان لەسووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

واتە: با لەنێو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن: کەبانگەواز دەکەن بۆ چاکە و، فەرمان دەکەن بە پەسەند و، ڕێگریی دەکەن لە ناپەسەند و، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

جاری دیکەش باسمان کردوە: کە بانگەواز بۆ چاکە واتە: هەموو چاکەیەك لە ئیسلامدایە، بەڵام مەرج نیە لە دەرەوەی ئیسلامیش، هیچ چاکەیەك نەبێت، (الْخَيْرِ) یانی: هەرچی سوودی هەیە بۆ خەڵك و مایەی بەرژەوەندییانە، وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الخير: ما يَرْغَبُ فيه الكُلُّ)[1] (خير) ئەوەیە کە هەموو لایەك بۆی ئارەزوومەندن، ﴿ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ ﴾ کۆمەڵگایەکی مسوڵمان دەبێ نێو خۆیان و دەرەوەی خۆشیان، بانگ بکەن بۆ هەر شتێك کە هەموو خەڵك بۆی ئارەزوومەندەو، هەموو خەڵك بۆی تامەزرۆیەو، قازانج و سوودی دنیاو قیامەتیانی تێدا دەبینن.

﴿ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ ﴾ فەرمان دەکەن بە هەرچی پەسندە، لە بواری بووناسییدا، لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، لەبواری فیکردا، لە بواری ڕاگەیاندندا، لە بواری هەڵسوکەتی کۆمەڵایەتییدا، لە بواری حوکم و سیاسەت دا، لە بواری ئابووریی دا، لە هەموو بوارەکاندا، دەبێ فەرمان بکەن بە شتی پەسند.

﴿ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ هەروەها ڕێگریی دەکەن لە ناپەسند، ئەویش لە هەموو بوارەکاندا.

﴿ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ هەر ئەوانەش سەرفرازن، یانی: کۆمەڵگایەك بەو شێوەیە نەبێ، سەرفراز نیە و، بەختەوەر نیە، نە لە دنیاو نە لە دوارۆژدا.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٧٦.

# بنەمای چواردەیەم

**دۆستایەتیی و پشتگیریی یەکدی کردنی بڕواداران، مایەی بۆ ئەنجامدرانی ئەرکی فەرمان بە پەسند کردن و ڕێگریی لە ناپەسەند کردنیان و، نوێژ کردن و زەکاتدان و، فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەر و (صلى الله عليه وسلم)، هۆکاری بەزەیی خوایە بۆیان**

ئەمیشم لەو ئایەتە موبارەکەی ژمارە (٧١)ی سوورەتی (التوبة) وەرگرتوە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾.

مەبەستم ئەوەیە کە دۆستایەتیی و یەکدی خۆشویستن و پشتی یەکدی گرتنی بڕواداران، دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەرکی فەرمان بە پەسند کردن و، ڕێگریی کردن لە ناپەسند و، پاشان نوێژ بەرپاکردن و، زەکات دان، هەروەها فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، یان بۆ

ئەنجام بدرێ و، سەرئەنجامیش، ئەوە دەبێتە هۆکاری ئەوە کە خوای پەروەردگار بەزەیی پێیاندا بێت دیارە هەر ڕاست دەقی واتای ئایەتەکەم هێناوە، بەڵام بۆ ئاسان تێگەیشتن، تۆزێك ڕیزبەندییم بۆ چەمکەکانی داناوە.

بەڵێ کۆمەڵگای مسوڵمان کاتێك تواناو شایستەیی ئەنجامدانی ئەو شەش ئەرك و کارە گەورەو گرنگانەی دەبێ، کە باسکراون، کە پیاوان و ئافرەتانی ئەو کۆمەڵگایە، پێکەوە: دۆست و نیزیك و پشتیوان و دڵسۆز و هاوکارو دەستبارگربن، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ بەر لەوەی باسی:

١- فەرمان بە پەسند.

٢- ڕێگریی لە ناپەسند.

٣- نوێژ بەرپاکردن.

٤- زەکات دان.

٥- فەرمانبەریی خوا.

٦- فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بكات، باسی دۆستایەتیی پیاوان و ئافرەتانی بڕواداری کردوە.

## بنەمای پازدەیەم

حەقی ڕەها (الحق المطلق) تەنیا لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە و، پێغەمبەری خاتەمیش (صلى الله عليه وسلم) گەیەنەرو ڕوونکەرەوەو چەسپێنەری ئەو حەقە بووە، بۆیە زاناو پێشەوایان، وێڕای ڕێزو پێزانینمان بۆیان، بەڵام هیچ کامیان پارێزراو (معصوم) نین و، دەمارگیریی و تەسلیم بوونی ڕەها بۆ ڕاو بۆچوونی هیچ کەس، دروست نیە و، بەرهەمی فیکریی هەر کام لە زانایانیش، زیاتر پەیوەستە بەو واقیع و بارودۆخەوە کە تێیدا ژیاون

ئەم بنەمایە کۆمەڵێك ڕاستیی تێدان، بەڵام من هەموویانم پێکەوە ئاوێتە کرد.

ئێستاش با لە چوار خاڵاندا تۆزێك شی بکەینەوە:

١)- حەقی ڕەها تەنیا لەلایەن خواوەیە، ئەدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەیەنەر و ڕوونکەرەوە و، چەسپێنەری ئەو حەقە بووە، هەڵبەتە حەقە ڕەهایەکەی خوا، لە قورئاندایە، ئەدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەکوێدا ئەو حەقەی پێ گەیاندووین و ڕوونی کردۆتەوەو چەسپاندوویەتی؟ لە ڕێباز و سوننەتەکەیدا.

**٢)**- بۆیەش زاناو پێشەوایان تێکڕا، هەرچەندە هەموویان جێی ڕێزو پێزانینن و، دەبێ هەر کەسە بەقەدەر خۆی ڕێزی لێ بگیرێ، بەڵام هیچ کامیان لە هەڵە و گوناه و لادان، پارێزراو نین.

**٣)** ئنجا دەمارگیریی و تەسلیم بوونی ڕەها، بۆ ڕاو بۆچوونی هیچ کەس دروست نیە، کە ئێستا حاڵی مسوڵمانان هەمووی پێچەوانەی ئەوەیە و، لەزۆر شوێنی دنیادا قسەی ئیمامێك، کراوەتە دین! ئنجا بریا ئیمامێکی وەك: ئەبو حەنیفەو شافیعیی و مالیك و ئەحمەدو سوفیان و جەعفەری صادیق و زەیدو کێ و کێ بوونایە، هەر کەسێ کە دەبێتە بەرپرسی کۆمەڵێك، یان شێخێکی تەریقەت، یان لایەنێکی سیاسیی ئیسلامیی...هتد، قسەکەی وەك دین وەردەگیرێ و بە پارێزراو لە هەڵەشی دادەنێن، نەك هەر لە گوناه و لادان!

جاری وا هەبووە قسەو باس کراوە، گوتوومە: فلان کەس لەو مەسەلەیەدا هەڵەیە، گوتوویانە: نا، چۆن دەبێ!! گوتوومە: مانای وایە ئێوە وەك پێغەمبەرتان داناوە!! ئەگەر پێتان وابێ ئەوکەسە هەڵە و پەڵەی نین، فەرقی چییە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؟ ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، هەروەها پێشەوا گەورەکان، ڕەخنەیان لە یەکدی گرتوە!

ئنجا لە کاروباری دنیاییدا، هاوەڵان بە پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) گوتوە: ئایا ئەوە وەحییە، یان ڕای خۆتە؟ ئەگەر ڕای خۆی بووبێ، جاری وابووە تێبینییان لەسەری هەبووە و، بۆچوونی خۆیان عەرز کردوە و، جاری واش بووە، پێغەمبەری خوا وازی لە بۆچوونەکەی خۆی هێناوە، بۆ بۆچوونەکەی ئەوان!

**٤)**- ئنجا ئەوە کە: بەرهەمی فیکریی هەر کام لە زانایان، زیاتر پەیوەستە بەو واقیع و بارودۆخەوە کە تێیدا ژیاون، ئەوە زۆر گرنگە بیزانین، بۆ وێنە: ڕەخنە لە ئەبو حامیدی غەززالیی دەگیرێ کە لە: (إحياء علوم الدين) دا، زێدەڕۆیی زۆری کردوە لە باسی دنیا بەکەمگرتن و لایەنی ڕووحیی دا، بەڵام دیارە واقیعەکەی وای پێویست کردوە، هەڵبەتە من دەڵێم: هەڵەکانی هەر هەڵەن، ئەگەر بەناو فەرموودەی هەڵبەستراو، یان فەرموودەی بێهێزی

هێنابێ، یان ئەگەر زێدەڕۆیی کردبێ لە زوهددا و، کەوتبێتە ژێر کاریگەریی ڕووحانیەتیی هیندۆسیی و نەصرانیی، ئەوە هەڵە هەر هەڵەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بارودۆخەکەی وای لێ کردوە، کە بەو لایەدا بچێ.

ئنجا با ئەم چەند ئایەتە بکەینە (مسك الختام)ی ئەم باسەشمان:

١)-لە سوورەتی (الکهف) ئایەتی (٢٩)دا خوا، دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴾

واتە: بڵێ حەق تەنیا لە پەروەردگارتانەوەیە، حەقی موتڵەق تەنیا لە خواوەیە، ئەوی دیکە دەگونجێ بەتەواویی حەقی لەلابێ و، دەشگونجێ هەندێك باطیڵیشی لەگەڵ تێکەڵ کردبێ و بە هەڵەدا چووبێ.

٢)- خوا عزوجل لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٤٤)دا، فەرموویەتی: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾

واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ ناردوە، تاکو ئەوەی بۆ خەڵك دابەزێندراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە و بۆ خۆشیان بیر بکەنەوە (عەقڵی خۆشیان دانەخەن).

٣)- هەر لە سوورەتی (النحل) لە ئایەتی (٤٣)دا، لە سوورەتی (الأنبیاء)یش لە ئایەتی (٧)دا، خوا یەك تەعبیری لەو دوو شوێنەدا هێناوە، بە یەك شێوە: ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾.

واتە: ئەگەر نازانن لە خاوەنانی زیکر بپرسن، واتە: ئەوانەی کە خاوەنی زانستیی قورئانن، چونکە: (ٱلذِّكْرِ) یەکێکە لە ناوەکانی قورئان و، دەشگونجێ بگوترێ: (أَهْلَ ٱلذِّكْرِ) یانی: خاوەنی پسپۆڕیی و شارەزایی (أهل الإختصاص) ئەوانەی پسپۆڕو شارەزان لە شتێکدا، لەوان بپرسن، ئەگەر نازانن.

٤)- خوا لە ئایەتی (٨٣)ی سوورەتی (النساء)دا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴾ النساء.

واتە: هەر کاتێك هەواڵێکی جێی دڵنیایی یان جێی ترسیان بۆ هات، یەکسەر بڵاویان کردەوە، بەڵام ئەگەر گێڕابایەنەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بۆ لای کاربەدەستانیان، ئەوانەیان کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی (ئایا ئەو هەواڵە بڵاوبکەنەوە، یان بڵاونەکەنەوە؟).

کەواتە: ئەهلی ئیسلام دەبێ لەنێو خۆیاندا کاربەدەستیان هەبن و، دەبێ لەنێو کار بەدەستانیشدا، ئەوانەی کە توانای بڕیاردانیان هەیە و، توانای هەڵهێنجانیان هەیە، بگەڕێنەوە بۆ لای ئەوان، نەك پاشا گەردانیی بێ و، کەس بەڕبەی کەس نەپێوێ و، کەس لەمەڕی کەس نەخێوێ و، هەر کەسە بە دوای میزاج و سروشتی خۆی بکەوێ! کاری هەرەوەزیی پێویستیی بە سیستم (نظام) ڕێك و پێکیی دەکات و، پێویستیی بە گوێ گرتن دەکا، بۆ سەرەوەی خۆت، ئەگەرنا وا نەبێ، ئیش تێك دەچێ.

# بنەمای شازدەیەم

**هەموو مسوڵمانێك لەسەری پێویستە مشووری کۆمەڵگا و دەوروبەری خۆی بخوات و، پاکسازیی و چاکسازیی تێدا بکات، نەك لەهەڵ و پەڵە و لادان و تاوانەکانیەوە ڕابمێنێ، بەڵام دەبێ زۆر وریابێ و وردەکاریی زۆر لە شێوازەکانی گۆڕانکارییەکەی دا بکات، چونکە مەحاڵە ئایینی تێر و تەواوی ئیسلام، بەشێواز و ئامڕازە ناشەرعییەکان، خزمەتی بکرێ**

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گەورە و گرنگی مسوڵمانەتیی ساغ و دینداریی ڕاست و دروستە، چونکە:

**یەکەم:** مرۆڤی مسوڵمان، دڵسۆز (ناصح) و خێرخوازی هەموو لایەکە و، ئیمان و ویژدانی ڕێی نادەن، ئەو خێر و بێر و هێز و پێزەی بۆخۆی لەسایەی ئیسلام دا لێی بەهرەمەند بووە، لەخۆیدا کورتی هەڵبێنێ و بەشی غەیری خۆی لێ نەدات، چونکە دڵسۆزیی و پەرۆشیی بۆ خەڵك و کۆمەڵگا، عادەت و ڕەوشتی پێغەمبەرانە علیهم السلام: (وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ) (الأعراف: ٦٨).

پێغەمبەری خواش (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دینداریی و مسوڵمانەتیی لە دڵسۆزیی بۆ خەڵك و بە تەنگەوە بوونیان دا کورت هەڵێناوە: (الدین: النَّصیحة...) مسلم: ٥٥.

**دووەم:** مادام نە لەدوای قورئان کتێبێکی دیکە لەلایەن خواوە دابەزێ و، نە لەدوای (محمد) (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرێکی دیکە ڕەوان دەکرێ:

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب.

بۆیە لەسەر مسوڵمانانی پەیڕەوی قورئان و شوێنکەوتووی (محمد) پێغەمبەری کۆتایی، پێویستە: پەیامی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگەیەنن بەهەرکەس کە دەستیان دەیگاتێ، یان دەنگیان پێی دەگات، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا لەژیان دابووە، هەرئەوە کاری بووە:

﴿ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: ئەم قورئانەم بۆ سروش کراوە، تاکو بەئێوە و بەهەرکەسێکی بگەیەنم کە دەتوانم پێی بگەیەنم..

**سێیەم:** سروشتی ئیسلامیش خوازیاری ئەوەیە کە سایە و سێبەری کۆمەڵگایێت و فەرمانڕەوابێ، نەك بندەست بێ و لە پەراوێزدابێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الصف.

(خوا) ئەوکەسەیە کە پێغەمبەری خۆی بەڕێنمایی و بەرنامەی هەقەوە ناردوە، تاکو بەسەر تێکڕای بەرنامەکان دا سەری بخات و زاڵی بکات...

هەڵبەتە تاکە شێوازی ڕاست و ڕەوای گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگاش، هەرئەو شێوازەیە کە تێکڕای پێغەمبەران لە ئادەمەوە تاکو خاتەم عليهم الصلاة والسلام ڕەچاویان کردوە، کە بریتیە لە: هەقبێژیی ڕوون و ڕاشکاو و دڵسۆزانە و بوێرانە و، خۆڕاگریی و پشوودرێژیی لەسەر ئازار و ناڕەحەتییەکان، وەك پێغەمبەران فەرموویانە:

﴿ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ إبراهيم.

واتە: بەدڵنیاییی هەرچەندە ئازارمان بدەن هەرخۆڕاگر دەبین و پشت بەستووان با تەنیا پشت بەخوا ببەستن.

هەروەها پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {المؤمن الذي يعاشر الناسَ و يصبر على أذاهم، أفضلُ من المؤمن الذي لا يعاشر الناس و لايصبر على أذاهم} أخرجه البخاري في الأدب المفرد:٣٨٨، والترمذي: ٢٥٠٧، وابن ماجه: ٤٠٣٢، والبيهقي في الآداب: ٢٠٦.

واتە: ئەو بڕوادارەی تێکەڵیی خەڵك دەکات و لەسەر ئازاریشیان خۆڕاگر دەبێ، چاکترە لەو بڕوادارەی تێکەڵیی خەڵك ناکات و لەسەر ئازاریشیان خۆڕاگر نابێ.

ئنجا وێڕای ئایەتەکانی قورئانی بەپێز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری بەڕێز (صلی الله علیه وسلم) بەڵگە لەوبارەوە ئەوەیە کە: لەحاڵێکدا مسوڵمانان لە بەرانبەر بارودۆخی لارو ستەمکارانەی کۆمەڵگایەکدا خۆیان دەبیننەوە، چوار (٤) ئەگەر (إحتمال)یان لەبەردەم دا دەبن، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا:

١- سەری خۆیان هەڵبگرن و وڵات و کۆمەڵگایەکەیان بەجێ بهێڵن، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف).

٢- بەزەبری هێز و چەك بەگژ خەڵك و کۆمەڵگاکەیان دا بچنەوە.

٣- تەسلیم و ملکەچی واقیعی لار و ستەمکارانەی کۆمەڵگاکەیان بن و، سەری خۆیان کزبکەن، یان تێیدا بتوێنەوە.

٤- نە لەبەری ڕابکەن و، نە بەگژیدا بچنەوە و، نەتێیدا بتوێنەوە، بەڵکو مودارا لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگایەکەیاندا بکەن و، بەحیکمەت و خۆڕاگریی و پشوودرێژیی، کار لەسەر پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی بکەن.

هەرکەسێکیش بە عەقڵێکی سەلیم، سەرنجی ئەوچوار ئەگەر (إحتمال)ە بدات، دڵنیا دەبێ کە تەنیا هی چوارەمیان پەسەند و ڕەوایە و عەقڵ و نەقڵ، یان حیکمەت و شەریعەت، جگە لەوە بەڕەوا و شەرعیی نازانن، وەك لەچەند بەرهەمێکی خۆم دا بەدرێژی لەوبارەوە دواوم[1]و، لە بەشی نۆیەمی ئەم تەوەرەش دا قسەمان لەوبارەوە کرد.



---

(١) وەك: (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) و (حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة).

## بنەمای حەڤدەیەم

پێکهێنانی قەوارەی سیاسیی، وێڕای عەقڵ و واقیع، سروشتی ئیسلام و دەقەکانی شەریعەتیش دەیخوازن و، شێوازی شەرعییانە و سروشتییانەی بنیاتنانی دەوڵەتیش ـ لە ئیسلام دا ـ ئەوەیە کە لەڕێی بانگەواز و هۆشیارکردنەوە و بێدارکردنەوەی خەڵك و کۆمەڵگاو، پەروەردەکردنیانەوە، زەمینەسازیی بۆ بکرێ و، نابێ بەهیچ جۆرێك بیر لەبەکارهێنانی هێز و خۆسەپاندن بکرێتەوە، بۆ بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی.

ئەم بنەمایەی حەڤدەیەممان کردۆتە کۆتا بنەما، لەبنەما سەرەکییەکانی: دینداریییەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست، چونکە دوا قۆناغی پابەندیی بەشەریعەتەوە و بەرپاکردنی ئایین، بریتییە لەوە کە مسوڵمانان ببنە خاوەنی ئیدارە و ئیرادەی خۆیان و، بەتەواویی دەستیان کراوەبێ لەبواری پابەندیی بەشەریعەتەوەدا و، جێبەجێ کردنی یاسایەکانی لەهەموو کایەکانی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ دا.

شایانی باسیشە: ئێمە لەبەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) دا بەدرێژیی لەبارەی پێویستبوونی: (دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی)

یەوە، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، دواوین، بۆیە لێرە واز لەومەسەلەیە دێنین و، ئەوەندە دەڵێین: کە بەر لە (علي عبدالرازق)ی میصریی خاوەنی کتێبی: (الإسلام وأصول الحكم) هیچ زانایەکی موعتەبەری ئسلام: مشت و مڕی نەکردوە، لەبارەی پێویستبوونی قەوارەی سیاسیەوە بۆ بەڕێوەبردنی شەریعەتی ئیسلام، بەڵێ بەر لەساڵی (١٩٢٥ز) کە (علي عبدالرازق) کتێبەکەی خۆی تێدا بڵاوکردۆتەوە، زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوبابەتە یەکدەنگیی (إجماع)یان هەبووە، هەرچەندە دوای ئەوەش دیسان جارێکی دیکە یەکدەنگیی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوبابەتە، زۆر بەهێز و پێز و دامەزراوە.

بەنسبەت شێوازی شەرعییانە و سروشتییانەی بنیاتنانی دەوڵەتیشەوە، لەئیسلام دا، کە تەنیا بریتیە لەوەی: خەڵك و کۆمەڵگایەکی هۆشیار و بێدار و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو، بەهاندەری ڕازییکردنی خوا عزوجل، بەهۆی بەتەواویی جێبەجێکردنی شەریعەتەکەیەوە، بڕیاری دروستکردنی قەوارەی سیاسیی و خاوەنی ئیدارە و ئیرادەی خۆ بوونیان، بدەن، هەروەها ڕەوانەبوونی پەنانەبردنە بەر هێز و خۆسەپاندن، بۆ بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی، دەڵێین:

١- ئەگەر بۆ هەر بەرنامەیەك بگونجێ بەزەبری هێز و چەك، بەسەر خەڵك دا بسەپێنرێ، بۆ ئیسلام ناگونجێ، چونکە کاکڵ و جەوهەری ئیسلام مامەڵەیە لەگەڵ خوای پەنهانزان دا و ڕستەی:

﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴿٨٥﴾﴾ الأعراف.

واتە: ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ویردی سەرزمانی تێکڕای پێغەمبەران بووە.

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة.

واتە: زۆریی لێکردن لەدیندا نیە.

٢- قەوارەی سیاسیی لەخودی خۆیدا، ئامانج نیە و ئامراز (وسيلة)ە، بۆ چەسپاندنی ئەوبەشەی شەریعەت، کە پەکی لەسەر هێز و دەسەڵاتی سیاسیی

کەوتوە، بۆیە بەر لەجێبەجێکردنی ئەوبەشەی شەریعەت، کە پەکی لەسەر قەوارەی سیاسیی کەوتوە، پێویستە یەکەکانی کۆمەڵگا و خێزانەکان (أفراد المجتمع وأُسَرُهُ) لەژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتییان دا، بەئیسلام و شەریعەتەوە پابەند بن، هەڵبەتە فەرمانی خوا عزوجل:

﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ (الشورى: ١٣)، واتە: ئایین بەرپابکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن..

لە سوورەتێکی مەککەیی دا هاتۆتە خوار، بۆ کۆمەڵە مسوڵمانێکی چەوساوەی بێ قەوارەی سیاسیی!.

٣- بەسەرنجدانی سیرە و ژیانی پێغەمبەری پێشەوامان (محمد) (صلى الله عليه وسلم)دا وەك ڕۆژی ڕوون دیارە کە قەوارەی سیاسیی، بەرهەم و زادەی پرۆسەیەکی شێلگیرانە و پشوو درێژانەی، بانگەواز و هۆشیارکردنەوە و بێدارکردنەوەو، ڕاگەیاندن و کاری دیبلۆماسیی و سیاسییە.

ئنجا ئاشکراشە کەبنیات نرانی دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەم، لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا (محمد) (صلى الله عليه وسلم) وێڕای پرۆسەی بەردەوامی: بانگەواز و هۆشیارکردنەوە و...هتد، دەرەنجامی ڕاستەوخۆی هەردووك پەیمانی یەکەم و دووەمی (عقبة) بوو، کە لەنێوان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و نوێنەری خەڵکی (يثرب)دا بەستران، لەساڵانی (١٢ و ١٣)ی پێغەمبەرایەتیی دا.

٤- ئەو قەوارە سیاسییەی بەزەبری هێز و چەك دادەمەزرێ، بەبێ وەرگرتنی ڕەوایەتیی (شرعية) لە خەڵك و جەماوەرێکی هۆشیار و بێدار و ئازاد، وێڕای ناڕەوا بوونی، زۆریش چاوەڕوانکراوە، بەزەبری هێز و چەکی لایەنێکی دیکە بڕووخێ!

٥- بەپێچەوانەی تێگەیشتنی زۆر کەسەوە: جێبەجێکردنی زۆربەی هەرەزۆری شەریعەت - بەمانای فراوان و گشتگیری بۆ: بووناسیی و، ئیمان و عەقیدە

و، عیبادەت و، ڕەوشت و، باری کەسێتیی و، ئەدەب و، هەڵسوکەوتە خێزانیی و کۆمەڵایەتییەکان- پەیوەستە بەئیرادەی تاکەکانی کۆمەڵگا و کۆی کۆمەڵگاوە و، پەکی لەسەر قەوارەی سیاسیی و دەوڵەت نەکەوتوە، هەربۆیەش دروست نیە مسوڵمانان بۆ پابەندیی بەشەریعەتەوە - لەو بوارانەدا کە پەکیان لەسەر قەوارەی سیاسیی نەکەوتوە- چاوەڕێی بنیاتنرانی دەوڵەت بکەن، چونکە:

١- فەرمانی خوا: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ﴾ (التغابن: ١٦)، واتە: ئەوەندەی بۆتان دەکرێ و دەتوانن پارێز لەخوا بکەن!

٢- هەروەها فەرمووودەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم): {..وإذا أمرتكم بأمرٍ فأتوا منه ما استطعتم} أخرجه البخاري برقم (٦٨٥٨)، ومسلم برقم (١٣٣٧)، واتە: هەرکات فەرمانم بەشتێك پێکردن، ئەوەندەی بۆتان دەکرێ، لێی جێبەجێ بکەن..

٣- هەروەها بنچینەی شەرعیی: (لايسقط الميسور بالمعسور) واتە: ئەوەی ئاسانە، بەهۆی ئەوەوە کە قورس و زەحمەتە، لاناچێ.

بەڵێ ئەو ئایەتەی قورئانی بەپێز و، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری بەڕێز (صلى الله عليه وسلم) و، ئەو بنچینە شەرعییە، ڕێمان لێ دەگرن، کە کەمتەرخەمیی بکەین لەپابەندیی بەشەریعەت و، جێبەجێکردنی یاسایەکانی دا.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە زیاتر لە بەرنامەکەی حاڵی بین و، یارمەتییشمان بدات کە باشتر پێیەوە پابەند بین، لە ژیانی تاکییمان و، خێزانییمان و کۆمەڵایەتییمانداو، هەوڵبدەین ئەو دەوروبەرو کۆمەڵگایەی خۆمان، بەو شێوەیە لێ بکەین، کە جێگای ڕەزامەندیی و پەسندیی خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بێ و، خۆمان و کۆمەڵگاکەشمان بەختەوەری دنیاو سەرفرازی ڕۆژی دوایی بین.

# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یـازدەیـەم: سـوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| ١٤ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٥ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | **بیـروبڕواو فیکـری ئیسـلامیی** | | |
| ١٦ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسـلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٧ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٨ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٩ | چەند مەسـەلەیەکی بـاوی سـەردەم، سـەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکـیی و فـارسـییش |
| ٢٠ | خواناسـیی، ئاییـن، ئیمان (ڕاسـتییەکانی ئیسـلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسـووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢١ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٢ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٤ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٥ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٦ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٧ | ڕێبـازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسـوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسـوڵـمان) |
| ٢٨ | مسـوڵمانی کـامڵ : بەشی یەکـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٢٩ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقـە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی) و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٣٠ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣١ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣٢ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٣ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | | |
| ٣٤ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٥ | كتێبی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٦ | كتێبی سێیەم: تەوژمە فیكرییە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٧ | كتێبی چوارەم: پایەكانی بیركردنەوەی ئیسلامی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٨ | كتێبی پێنجەم: چەند پرسێكی فیكریی هەنووكەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| | **فیقهی ئیسلامیی** | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣٩ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٤٠ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٤١ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
| ٤٢ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٤٣ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسەكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٤٤ | جەژن و یادو بۆنەكان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤٥ | چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| ٤٦ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **تەزکیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاکــار** | | |
| ٤٧ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٨ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٤٩ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٥٠ | گەڕانەوە بۆ لای خــوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سـەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٥١ | شـەهید کێیەو چ پلـەوپایەیەکی هـەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٥٢ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٣ | گیانی ژیــان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٤ | مەوســـــووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیســـلامیی لەبەر ڕۆشـــنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگـەوازو کـاری ئیســـــلامیی** | | |
| ٥٥ | کۆمەڵـی خـــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٦ | پێشمەرگەی ئیســلام، یان مســولمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٧ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیســلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٨ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥٩ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٦٠ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیســـلامییەکانی کوردســتان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦١ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٦٢ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٣ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٤ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٥ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٦ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٧ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٨ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٩ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٧٠ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٧١ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٧٢ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٧٣ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٥ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٦ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| ٧٧ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٨ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٩ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | | |
| ٨٠ | کارو پڕۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٨١ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٨٢ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **نەتەوایەتیی و مەسـەلەی کورد** | | |
| ٨٣ | کوردسـتان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٨٤ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیـری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨٥ | سـۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسـیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسـلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٦ | چارەســەری کێشـەی کـورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سـیاسـەت و حوکمڕانیی** | | |
| ٨٧ | چەند بابەتێکی سـیاسـی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشـنایی عەقـڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٨ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨٩ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٩٠ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| ٩١ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٩٢ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ٩٣ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا. | | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩٥ | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٦ | مەوسووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێــژوو** | | |
| ٩٧ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٩٨ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٩ | بەرکولێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ١٠٠ | سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٠١ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ١٠٢ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ١٠٣ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٤ | با وریا بین ! دارووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠٥ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٦ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٧ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٨ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٩ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٠ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١١ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١١٢ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٣ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٤ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقلّدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١١٥ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٦ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١١٧ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٨ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٩ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٠ | ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢١ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٢ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٢٣ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- كتێبە عەرەبییەكان** | | |
| ١٢٤ | موسوعة : الإسلام كما يتجلى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | كە لە چاپی یەكەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١٢٥ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٦ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٧ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٨ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٩ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٠ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣١ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٢ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٣ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣٤ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | | |
| ١٣٥ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٣٦ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٣٧ | نقض فكرة التطرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٨ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٩ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٤٠ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٤١ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٤٢ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٤٣ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٤٤ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٤٥ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٦ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٧ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٨ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٩ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٥٠ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٥١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سوورەتەکانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٥٢ | درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لە بەرتیشکی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا. | | |
| ١٥٣ | چاو پێدا گێڕانەوەیەکی کاری ئیسلامیی | | |
| ١٥٤ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | | |

# نێـوەڕۆك

# کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
# مامۆستا عەلی باپیر



• ناو: عـــەلی بـــاپیر وەتمان.

لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشـــدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیە و سلێمانیی) و لای زانایانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپێزی لەبەر کردوە.

• لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

• لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

• لەساڵی (١٩٨٧ز) دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، چۆتە چیا و دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

• لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز) داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا.

• تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوە، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوە، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بووە.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) کتێب و نامیلکەی نووسیوە لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس...)هتد.

• ئێستا پڕۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو نیوەی زیاتری تەواوکردوە.

• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.

• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووە، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

**بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:**

www www.alibapir.net

/alibapir /alibapir1 /MediaAmeerOffice

# چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر




پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگار و، واقیعێکدا کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و، بەزیندوویێتی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: لێك دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لە تێوەڕامانی وەحیی و، چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەیبینین.

بەڵێ ئەم حاڵەتەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، حاڵەتێکە کە مسوڵمانان- بەشێوەیەکی گشتی- باش نەیانتانیوە کە عەقڵ و هۆشی خۆیانی تێدا بخەنەکار بۆ تێوەڕامانی وەحیی و، سەرنجدانی واقیع...

هیواداریشم ئەم مەوسووعەیە بەهەر پێنچ تەوەرەکەیەوە، هەوڵ و هەنگاوێکی کاریگەربێ، بۆ گێڕانەوەی مسوڵمانان بەرەو ئەو حاڵەتە پەسندە سروشتییەی، کە نەقڵ و عەقڵ لێیان دەخوازن، بەڵکو لەدەردی وەستان و بە جێماویی دەربازیان بێ.



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com